▪ بیرەوەری

# کنەکردن لە یادەوەریدا
# عەزیز محەمەد

لە دیدارێکدا سەربردەی خۆی و چەند لاپەڕەیەک لە مێژووی سیاسیی عێراق دەگێڕێتەوە

گفتوگۆ و لەسەرنووسین
دوکتۆر سەیف عەدنان قەیسی

پێشەکی:
دوکتۆر عەقیل ناسری

لوقمان باپیر
کردوویە بە کوردی

# کنەکردن لە یادەوەریدا

# عەزیز محەمەد

## لە دیدارێکدا سەربردەی خۆی دەگێڕێتەوە
## چەند لاپەڕەیەک لە مێژووی سیاسیی عێراق

■

# کنەکردن لە یادەوەریدا

## عەزیز محەمەد


گفتوگۆ و لەسەر نووسین: دکتۆر سەیف عەدنان ئەلقەیسی
پێشەکیی: دکتۆر عەقیل ئەلناسری
لە عەرەبییەوە: لوقمان باپیر
بەرگ و ناوەڕۆک: ئیبراهیم سالح
بڵاوکار: ناوەندی ئاشتی
نرخ : ٨٠٠٠
نۆبەی چاپ: یەکەم
تیراژ: ١٠٠٠
ساڵی چاپ: ٢٠٢٤

ژمارەی سپاردن ٤٧٢ ی ساڵی ٢٠٢٣
بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
وەزارەتی ڕۆشنبیری و لاوان

# پێشکەش

ئەو کتێبەی وەبیرهێنانەوەیەکی بیرەوەری و خستنەڕووی تێڕوانینەکانیەتی بۆ ڕووداوە مێژووییەکان و کۆتایی تۆماری تێکۆشانیەتی لە مێژووی عێراقی سەردەمی ئێستا، پێشکەشی گیانی عەزیز محەمەدی دەکەین ، کە لەنێوان "١٩٢٤ -٢٠١٧" ژیا.

# پێرست

# پێشبار

عەزیز محەمەد.... ئەو تێکۆشەرەی زەمەنی قەرزاربار کرد سەرەتای سەدەی ڕابردوو، کۆمەڵێ بارودۆخی زاتی و بابەتیی وڵات – عیراق- و هەموو ناوچەکە کارلێککردنیان لەیەک کرد، ئەوەش کەشێکی لە باری بۆ سەرهەڵدانی هەندێ هێزی نوێی ڕۆشنبیر ڕەخساند، جودا لەو هێزە خوێندەوارە ئاساییانەی لە دامەزراوە ئایینییەکان کۆببوونەوە. ئەو هێزانە ناوەرۆکی ئەو گۆڕانە چاوەڕوانکراوەیان ڕاکرد و لە خۆیان گرت کە لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەدا چاوەڕێی دەکرا و لە دوو دەیەی ڕابردوودا دەرکەوتن و، ئیدی بوونە ئەو دیاردانەی بەرەو بیرۆکەی گۆڕانە ئومێدبەخشەکە چوون. پێموایە ئەو هێزی گۆڕانکارییانە لە چوار توێژی سەرەکییەوە سەریان هەڵدا:

١_ ئەو توێژە خوێندەوارەی تێڕوانینێکی لیبراڵییانەی هەبوو و لە شەتڵە نەمامەکانی قوتابخانە سەردەمییەکانەوە پەیدا ببوون.

٢_ توێژی ئەو ئەفسەرانەی لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەدا لە سوپای عوسمانلی خزمەتیان کردبوو.

٣_ هەندێ بیرڕوون و خوێندەواری لە خوێندنە ئاساییەکەیان خوێندبوو.

٤_ هەندێ لە بازرگانانی شارەکانی سەدەکانی ناوەڕاست.

دەشکرێ، بەپێی پێوەری بەردەوامیی پشتگیریی ڕێوانی بیرۆکەی گۆڕان و ڕێگابڕینە ئابووریی و سیاسیی و

فیکرییەکەی، ئەو توێژانە دابەش بکەین و بیانکەینە سێ توێژی دیکە:

١_ ئەو ڕۆشنبیرانەی بیرۆکەی گۆڕانیان ڕەتدەکردەوە و زۆربەیشیان هی سێ توێژەکەی پێشتری بوون.

٢_ ئەو ڕۆشنبیرانەی لەگەڵ گۆڕانەکاندا دەڕۆیشتن و ئەوانەش سەر بە توێژی یەکەم و کەمێکیشیان سەر بە سێ توێژەکەی دیکە بوون.

٣_ ئەو ڕۆشنبیرانەی پشتی گۆڕانیان دەگرت و کاریشیان لە بوارەکانیدا دەکرد، ئەوانە ڕۆشنبیرە زیندووەکانی توێژی یەکەم بوون.

وشیاری و بەخۆهاتنەوەی خەڵکە تەوەرەییەکەی ناو ئەنتلیجنسیای عێراقیی، کە خەریکبوو دەردەکەوت و، بیرفراوانیان سەبارەت بە ئینتیما و ڕەگاژۆبوونی مەعریفیی ئەو توێژە بە شێوەیەک لەگەڵ واقیعی کۆمەڵایەتی و ئابووریی بەرجەستەبوو و ناوەرۆکی پێشکەوتنی هێزەکانی بەرهەمهێنانی کۆمەڵایەتی و تێپەڕاندنی لێکدانەوە لاهووتییەکانی دریاردە کۆمەڵایەتی و سرووشتییەکان بگونجێ، کە بوونە هۆکاری گرنگی زیادبوونی چەندایەتی و چۆنایەتیی ئەو توێژە. دەستەیەک لە ڕۆشنبیرە ئۆرگانییەکانی عێراقی "کە هەندێکیان بە دەگمەن ئاساییەکان بوون" پێگەیەکیان لەناو ناوەندە کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیرییەکەدا هەبوو، لەو بارودۆخە وەگاهاتن و بانگەشەیان بۆ کۆمەڵێ ئامانجگیریی پێشکەوتنخوازیی کرد، وەک من بزانم، گرنگترینیان:

_ بڵاوکردنەوەی خۆزگەخوازیی بیرۆکەی سەربەخۆیی.

_ دیاریکردنی ناوەرۆکی ناسنامەی عێراقی.
_ پشـتیوانیکردنی مافی سـروشـتی بەدەسـتهاتووی ژنان لە یەکسانیدا.
_ نەتەوە مافی ئەوەی هەیە سیستەمێکی دنیایی بەپێی پەیمانی کۆمەڵایەتی بۆ خۆی هەڵبژێرێ، نەک بە پێی مافی خودایی.
_ هـاتنی بیرۆکەنوێیەکـان و بەتـایبەت ئەوانەی ڕەهەنـدێکی یەکسانی هاوبەشیبوونیان هەیە.
_ یـاخیبوون لە شـــەعبەدەی ئـایینی و بەهـا کۆنەکـان و لێکدانەوەیان بۆ دیاردە کۆمەڵایەتی و سروشتییەکان.
_ بەشـداریی سـیاسـیی هێزە کۆمەڵایەتییە نوێیەکان، بەتایبەتی ئۆرگـانییەکـانیـان و، لەوانە "حیزبی نیشـــتمـانیی عێراقی و جەماعەتی ئەهالی و حیزبی شیوعی"
_ هەندێک لەوانە داوای ســـەربەخۆیی ئابووری و لیبرالییەتی ئابوورییشیان دەکرد.
جا یەک لە پێشەنگانی نەوەی دووەمی بیرۆکەکانی یەکسانی و سـۆشـیالیسـتی ئەوەی دووپاتدەکاتەوە و دەڵێ خەباتی ئەوان: "......هەر بە بەرەنگاربوونەوەی دەسەڵاتی ئیستیعماری و هەوڵی لێ دەربازبوونی نەوەســـتا، بەڵکو لەگەڵ ئەوەشـــدا، ئامانجی ئەوەبوو ئەو دەســـەڵاتەی لە ســـایەی ســـەربەخۆیی تەواو خوازیاری بووین، دەسـتووری و دیموکراتی بێ. ئیدی، هەر لە بەراییڕا و بەدرێژایی کاروانەکەیشی، دیموکراتی ببووە شەقڵی بزووتنەوەی نیشـتمانیی سـەربەخۆیی عێراق....". ئەو چالاکییە، ناوکۆیی و هاوبەشـی نێوان بزووتنەوە و حیزبە لیبراڵییەکان و

پێشەنگانی بیری سۆشیالیستی و پێشکەوتنخوازیی عێراقی ئەو قۆناغە بوو.

هەر لەگەڵ پێکهاتنی کۆمەڵەی نەهێشتنی ئیستیعمار و وەبەرهێنان "دواترێ لە ١٩٣٩ ناوەکەی کرایە حیزبی شیوعیی عێراق" ئەو خەباتە زیادی کرد و ڕەهەندێکی چینایەتیی نوێی وەرگرت. ئەو کۆمەڵەیەش لە ئەنجامی یەککگرتنی ئالْقە مارکسییەکانی خوارەوە دروستبوو:

١ _ کۆمەڵەی ناسرییە، لە ١٩٢٨ دامەزرا و یوسف سەلمان یوسف "فەهدی دواترێ"ی کرێکاری کارگەی بەفر و، غالی زوەیدی سەرکاری خانەوادەی سەعدوون و ئەحمەد جەمالەدینی پارێزەری لەخۆگرتبوو.

٢ _ کۆمەڵەی بەسرا: لە ١٩٢٧ دامەزرا و عەبدولحەمید خەتیبی مامۆستا و زەکەریا ئەلیاس دۆکای فەرمانبەری بەندەر و سامی نادر مستەفای مامۆستا و عەبدولوەهاب مەحمودی پارێزەری لەخۆگرتبوو.

٣ _ کۆمەڵەی بەغدا:

دەستەی یەکەمیان لە ١٩٢٩ دامەزرا و عاسم فلەیحی بەرگدروو و قاسم حەسەنی فەرمانبەری حکوومەت و مەهدی هاشمی مامۆستا و کرێکاری بێ تەل و حەسەن عەباس کرباسیی قوتابیی ماف و دواتر پارێزەری لەخۆ گرتبوو.

دەستەی دووەم لە ١٩٣٣ دامەزرا و جەمیل تۆمای ئەندازیار و نووری رۆفائیلی مامۆستا و دواترێ ئەندازیار و، یوسف ئیسماعیل بوستانیی قوتابیی مافی لەخۆ گرتبوو.

دەستەی سێیەم لە ١٩٣٤ دامەزرا و هەریەک لە زەکی خەیریی فەرمانبەر و یوسف مەتیی قوتابیی ماف و عەبدولقادر ئیسماعیل بوستانیی پارێزەری لەخۆگرتبوو. سەبارەت بەوەی دواییان، حەننا بەتاتۆ نکۆڵی لەوەی دەکا چووبێتە ڕیزی ئەو کۆمەڵەیە، لەکاتێکدا کەسانی دی دووپاتیدەکەنەوە کە لە دامەزراندنی کۆمەڵەکە بەشدار بووە.
هەر لە دامەزراندنییەوە، کۆمەڵێک کەسایەتیی خەباتگێڕی، دەستێکی باڵایان لە دامەزراندن یان سەرکردایەتیی خەباتی چینایەتیدا هەبووە، یەک لەدوای یەک، سەرۆکایەتیی حیزبی شیوعی یان سکرتێرییان کردووە. هەر لە یەکەم سکرتێری حیزبەوە، عاسم فلەیحی کریکار و ئەوجا یوسف سەلمان یوسف "فەهد" و بەهادین نوری و کەریم ئەحمەد داود و حەمید عوسمان و سەلام عادل و عەبدولسەلام ناسری و عەزیز محەمەد و حەمید مەجید موسا و هەتا ڕائید فەهمیی سکرتێری ئێستا. جا ئەگەر چاوێک لەو پێکهاتەیەی سەرکردەکانی حیزب بکەین، ئەوا ئەو ئەنجامە سەرەکییەی دەیگەینێ ئەوەیە ڕەنگدانەوەی پێکهاتە کۆمەلایەتییەکەی عێراقە بە هەموو پێکهاتە ئیتنی و ئاینی و چینایەتی و زمانەکانییەوە. کرێکاری تێدایە و ڕۆشنبیریش، کوردی تێدایە و عارەبیش، موسڵمانی تێدایە و سریانییش. ئەوەش لە زۆربەی لیژنە مەرکەزییەکانی سەرکردایەتیی خەباتی چینایەتیی عێراقی سەردەمیان کردووە ڕەنگیداوەتەوە. ئەوان نوێنەری دەستەی جودای ئاستی ئەنتلجنسیای سیاسین بە شێوەیەکی گشتی، ئەگەرچی لە

ڕێژەی هەرســــکردنی فیکری تیۆریی مــارکســــیی ڕووتــدا جیاوازییان هەیە.
کە دێینەوە ســەر کتێبەکەی هاوڕێ و توێژەری ڕشــت، دکتۆر ســــەیف عەدنــان ئەلقەیســـــی، بە نــاوی: عەزیز محەمەدی سـکرتێری پێشـتریی حیزبی شـیوعیی عێراقی دەدوێ، دەبینین ئەو، لە ڕێی خوێندنی ماســــتەر و دواتریش دکتۆرا و ئەوجا توێژینەوەکانی ســــەبارەت بە کەســـایەتییە تەوەرەییەکانی ناو ئەو حیزبە، بەدوای کاروانی حیزبی شـــــیوعیی عێراقیدا چووە "حشـع". ئەو گفتوگۆیەشـی لەگەڵ سـکرتێری پێشـووتری حیزب کە پشتی بە سەرچاوەی مێژوویی بەستووە، هەر بەشێکە لەو گرنگیپێــدانە زانســـــتی و توێژینەوەییەی نــاو مێژووی ئەو بزووتنەوەیە، لە باڵاکردن و شــکســــتەکانیشــیدا، لە جووڵە و وەستانیشیدا، لە تەشەنەی جەماوەری و بەرتەسکبوونەوەشیدا.
بۆیە، بەســای تێڕوانینی زانســتیی هاوجووتی کۆمەڵێ چەمکی لەگەڵ ئەو نــاوەڕۆکە مەعریفییە ڕێکــدێتەوە کە دکتۆری بەڕێزمــان بۆ مێژووی حیزبی شـــــیوعیی عیراقی هەیەتی، دەتوانم ناوی لێ بنێم "توێژەری تایبەتمەند لە چەپی عێراقی".
ئەو، لەو دیــدارە و لەو تــوێـژینەوانەی کــردووشــــــیەتــی، تێڕوانینەکانی زۆر بابەتییانە بەراورد کردووە و لەســــەریان وەســـــتــاوە و چووەتە ســــەر تێڕوانینە دژبەرەکــان و تەواوکەرەکانیشـــی، کە ڕووداوەکە و پاشــخانی ڕووداوەکەش ڕوونــدەکەنەوە و ئەوجــا بە تێڕوانینێکی شــــیکــارییــانە پشـتبەسـتێکی بۆ واقیعی دەوروبەری بزاوتی حیزبی شـیوعی دەستەبەر کردووە.

من، بەسـاى ئەنـدامبوونم لەو حیزبە و ئـاگـاداریم لە مێژووەكەیشـی، تێڕوانین و هەڵێنجـانێكی سـەرەكیم لا دروسـتبووە كە حیزبی شـیوعی بەشـێوەیەكی گشـتی و لەبەر كاركردنی نهێنیی، لە نیوەی دووەمی سـەدەی ڕابردووڕا نەبێ دەنا پێشـترێ تەنیا ڕێكخەری دروسـتكردووە نەك تیۆریزەكار و تیۆریزەكـارەكـانیش سـەربـاری كەمیی ژمـارەیان، دوای هـاتنەوەی كـادیرەكـانی لە خوێنـدنی زانكۆكـانی وڵاتە سۆشـیالیستەكان و بگرە هەندێ وڵاتی خۆرئاواش پەیدابوون. مێژووی حیزبی شـیوعییش ئەوەی روونـدەكـاتەوە و، كە تووشـی شـكسـتێك دەبوو بەزۆری دوای ماوەیەكی كورت بە گورێكی گەورەترەوە دەردەكەوتەوە و، بەڵگەی ئەوەش ساڵانی شكستی چلەكان و شەستەكان و "كودەتای شوباتی ١٩٦٣" و حەفتـایەكـانە و، كە ئەو كتێبە ئـامـاژەی بۆ كردووە و دەڵێ: "حیزبی شـیوعی تووشـی ڕاتەكاندن و هەژانی توند بووە، جارێك بە جیابوونەوە و جارێك بە ڕاوەدوونانی كادیرەكانی و جـارێكی دییش بە لەداردانی سـەركردەكـانی. ئەوەش شوێنەواری ئەوتۆی بەسەر حیزبەوە بەجێهێشتووە كە هەرگیز ناسڕێنەوە. سەرباری ئەوەش، چالاكییەكانی حیزب نەوەستان. لەهەر ڕووداوێكی حیزب تووشی دەبوو شیوعییە عێراقییەكان ڕێكخسـتنەكانیان ڕێكدەخسـتەوە و جارێكی دی پەڕەكانی خۆیان ڕێكدەخسـتەوە تا دیسـان لەو نوشـوسـتییانەی لە قۆناغەكانی مێژووەكەیان تووشی ببوون ڕاببنەوە، ئەو مێژووە درێژەی لەژێر سـایەی كاری نهێنی و دەسـتگیركردنی ناو بەندیخانەكانی ڕژێمە پاشایی و كۆمارییەكاندا بەسەریان برد".

بەدوای بزاوتی حیزبی شـــیوعییشـــدا چوویمە و وەک ڕایەکی مەعریفیی ڕەنگە هەڵە یان دروست بێ، گەیشتمە تێڕوانینێک و مێژووی حیزبم بەسـەر چەند قۆناغێکدا دابەشکردووە، ئەویش بەپێی پێوەرێکی سەرەکیی کە "چەپڕەویی" هەڵوێست و دیاردە سیاسییەکانە، بە گشتییش:

_ قـۆنــاغــی یەکەم "١٩٣٤- ١٩٣٨" لە دامەزرانـدنەوە تــا تەواوکردنی خوێنـدن لە مۆســـکۆ و گەڕانەوەی فەهــد و بنیاتنانەوەی حیزبی شـیوعیی عێراقی، ناوی دەنێـــم قۆناغی دامەزراندن و نەبوونی شــارەزایی ســیاســی، کە میانڕەوی و تێگەیشــتنی واقیعە باوەکە باڵکێشــبوون و، ئەودەمی تیۆرزانی ئەوتۆ نەبوون تا بەپێی واقیعی عێراق و پێکهاتە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکەی لە شـیکردنەوەی تیۆری مارکســیدا قووڵببنەوە. ئەودەمی حیزبی شـــیوعی شـــــارەزایی نەبوو و ڕیزی ڕێکخستنەکانیشـی شـەق و شڕ بوو. بیروڕایەکانیشـی ئایدیالی و زۆر لە ڕووداوەکـــان و واقــیــعەکەی دووربــوون و بیرکردنەوەیەکی ڕێکی هەڵقولاوی دواکەوتوویی گشـــتیی کۆمەڵگـایـان نەبوو، وەک شـــێوازی خویندنی قوتـابخـانە و کۆلیژەکان و، تەشــــەنەکردنی ئەفســـانە لەناو وشـــیاریی کۆمەڵایەتی و دەرخســـتە جوانیناســـی و ســـیاسییەکانی و، بـاڵادەســـتیی نەریتە کۆمەڵایەتییە ڕێگرەکـانی هەر بزاوتێکی سیاسیی خاوەن ڕەهەندێکی چینایەتی بێ.

_ قۆنـاغی دووەم "١٩٣٨ – ١٩٤٩" ســـەرکردایەتیی فەهـد، ناوەندی چەپڕەوی میانڕەو ئامال بوو و، بە تایبەتیش دوای یەکگرتنی، حیزبی شــیوعی، ســەرباری ئەو قیژە و هاوارانەی

لەو لایەنانە هەستا کە لە سەرکردایەتیی فەهد جیابوونەوە، کەچی حیزب بە میانڕەوی مامەڵەی لەگەڵ واقیعی عێراقی کرد، کە ئەو واقیعە بەر توانا تیۆرییەکانی حیزب دەکەوت وەک دەستەی پێکهێنەری بنیات و واقیعە ڕەقەکە، بۆیە حیزب دروشمی ڕووخاندنی ڕژێمی پاشایەتیی بەرزنەکردەوە و، سیاسەتەکانیشی دووربوون لە سۆزی سیاسی و ڕوانینی ڕادیکاڵی و، سەرکردایەتییەکەی بە ئاقڵی و سەنگینی ڕای خۆی دەربڕی و پێداگریی لەسەر قۆناغەکانی بەرەوپێشچوون و گواستنەوە دەکرد و ئەوەندەی جەخت لەسەر ئامانجی کۆتایی نەدەکردەوە کە دەکەوتە ناو حوکمی داهاتووی زەمەنیی وەک دامەزراندنی سۆشیالیزم و کۆمۆنیستی. فەهد بەو قسەیەی باسی ئەو بۆچوونە دەکا: "... ئێمە ئەگەرچی شیوعییشین، بەڵام نامانەوێ ئەوڕۆ شیوعییەت دەستەبەر بکەین، ئێمە ناتوانین قۆڵی مێژوو بادەین"، جا ڕاستییەکەی ئەوە بە حیزبێکی نهێنیی بڵاوبوونەوەیەکی ئەوتۆی نەبوو و، کەرەستەی ئەوتۆیشی نەبوو کار لە رای گشتی بکا، نەدەکرا.

_ قۆناغی سێیەم "١٩٤٩ – ١٩٥٥" کە ژمارەیەک شیوعی چوونە پێگەی سکرتێری گشتیی لیژنەی مەرکەزیی حیزب. قۆناغەکانی بەرایی بەئاشکرا پێیانەوە دیاربوو مەیلێکی تەواوی چەپڕەوییان هەیە و، هێڵێکی زیاد لە پێویستی توندڕەوی و، هەندێ کات لە خەڵکەکەی دیکەش پتر دەڕۆیشتن. جا زێدەڕۆیی ئەو هێڵەیان لەگەڵ پەیوەندییەکانیان لەگەڵ هێزەکانی دیکە نەدەگونجا و، بایی پێداویستییەکانی ئەو قۆناغی نەبوو و ئەوەش خراپیان بەسەردا شکایەوە. باشترین بەڵگەی لیرەش،

بیهێنینەوە ئەوەبوو دروشـــمی کۆمـاری میللیی دیموکراتیـان بەرزکردەوە و لە ســـایەی بارودۆخێکی نیمچە دەرەبەگایەتی جەختیان لەسەر دامەزراندنی سۆشیالیزمی دەکردەوە.

_قـۆنـاغـی چـوارەم "١٩٥٥ - ١٩٦٣" کە ســـەلام عـادل ســـەرکردایەتیی حیزبی وەرگرت و ئیدی دەســـتە و تاقمەکان یەکیان گرت و وەک قەوارەیەکی یەکگرتوو هاتنە ناو حیزبێکی یەکگرتوو و، وەک عـامر عەبـدوڵاش دەڵێ، لەژێر کـاریگەریی ئەو بیروڕای هـاوکـاری و پێکەوەژیـانی ئـاشـــتییانەدابوو کە کۆنگرەی بیسـتی حیزبی شـیوعیی سـۆڤیەتی بڕیاری لەســەر دابوو، چونکە تـاکتیکەکـانی نەرمتربووبوون و ئەوەش وایکرد بەڕووی حیزبە نیشـــتمانییەکاندا بکرێتەوە و بەرەی یەکێتیی نیشتمانی دامەزرێنێ.

وەک من بۆی دەچم، ســیاســەتی حیزب هێشــتا شـتێکی لە چەپڕەوی تێـدا مـابوو، کە دوای گۆڕانی ڕیشـــەیی ١٤ی تەمموزی ١٩٥٨ تونـدتر بوو و ســـیاســـەتی حیزب لەو ئەقڵانییەتە جووتەی واقیعی مـادی و پێشـــکەوتنی هێزە کۆمەڵایەتییە بەرهەمهێنەرەکان دوورکەوتەوە و، سەرکردایەتیی ســـەلام عـادل خەریکبوو تونـدتر دەبوو، بەتـایبەت دوای گەڕانەوەی لە مۆسکۆ.

قۆناغی پێنجەم: دوای کودەتای شوبات و تا کۆنگرەی پێنجەمی ١٩٩٣، کە لەو ماوەیەیدا عەزیز محەمەدی سـکرتێری گشـتیی پێشـتری ســیاســەتی حیزبی لەناو ئەو هەموو گۆڕانکارییە سـیاسـییانەدا بەڕێوەدەبرد، جارێک ڕاسـتڕەوێکی ڕووتی"هێڵی ئـاب"ی لەژێر کـاریگەریی تیۆری "نـاســـەرمـایەداریی"دابوو و

جارێکی دیکەی دوای سیاسەتی هاوگونجان کەوتنی هەندی ئاراستەی ڕاستڕەویی بەسەردا زاڵبوو و خەریکبوون پێشڕەویی ناو کۆمەڵگای عێراقی وەرگرن "بەرەی نیشتمانیی نەتەوەیی"، لەگەڵ ملدان بۆ دەسەڵاتی بەعس "سەرکردنی ڕێکخراوە دیموکراتییەکان". جاری سێیەمیان چەپڕەوییەکی تۆخ، دوای هەرەسهێنانی بەرە لە ١٩٧٩ و، بەتایبەت دوای کۆنگرەی چوار لە ١٩٨٥ و، بەرزکردنەوەی دروشمی خەباتی چەکداری. دەسەڵاتی مەرکەزیی نادیموکراتیی بەسەر هەموولایەنە سیاسییەکاندا زاڵبوو و خاوەنی گوتارێکی سیاسیی پاساودەر بوو، ببووە سیمای هەرە دیاری ئەو قۆناغەی خۆی لە ڕووبەڕوو بوونەوەی بەعس دەپاراست و پێدرێژییەکانی بەعسی ڕانەدەگرت کە لە سایەی سیاسەتەکانی پاشەکشەکردنی لە بنەما گشتییەکانی هاوپەیمانیی بەرەییدا دەیکردن و، بە شێوەیەکی سەرەکییش خۆی لە بە بەعسیکردنی کۆمەڵگای عێراقیدا دەنواند. واتە سەرکردایەتیی عەزیز محەمەد سێ دەیە درێژبووەوە بە چەندین خۆگونجاندندا تێپەڕی کە لایەنی تەکتیکی بەسەریدا زاڵبوو بێ ئەوەی لایەنە ستراتیژییەکەی لەدەست بدا، ئەوەش پشتی بە دەسەڵاتدارانی تەوەرەیی دەسەڵاتی بڕیاردەری حیزبیی ناو حیزبی شیوعی دەبەستا.

کە حیزبیش بە ناوەرۆکی ڕێکخراوەیی و پەیکەربەندی و ئەو بەرنامەڕێژییەی دەیویست بەدەستی بێنێ پەیوەندییەکی جەدەلیی لەنێوان لۆژیکی فیکری و ئینتیمای کۆمەڵایەتی و چینایەتیی ئەندامەکانیدا هەیە و، لە خەباتی بەردەوامیشیدا

ڕەهەندێکی ستراتیژیی وەرگرتووە، بۆیە پێموایە ئەو لادان و پێچکردنەوانە پێویستی بەو شتانەی خوارەوە هەبووە:
_ سروشتی لە گۆڕانی سیاسەتی دەسەڵات، کە کاروانی خەبات ڕوونیدەکاتەوە.
_ دەبوایە دوانەی بارودۆخە سیاسییە یەکجار ئاڵۆزەکە و شێوازی هاوپەیمانییە سیاسییەکان بێ.
_ ئەوەی سیاسەتی بارودۆخی سەر زەوی دەیسەپێنێ.
ئەوجا وەرە سەر ئەو شتانەی بەردەستن و بارودۆخ ڕێ بە پیادەکردنیان دەدا؛
_ ئەو شتانەی پەیوەستی ئالنگارییە ناوخۆییە حیزبی و سیاسییەکانن، چ لەسەر ئاستی ناوخۆی وڵات و چ لەسەر ئاستی دەرەوە.
جا ئەو بارە ئاڵۆز و تێکچڕژاوە و ئەو دۆخە تێکهاڵاوە و ئەو چالاکییە نهێنییە و ئەو کەرەستە سنووردارانەی شیوعییەکان و ئەو بارودۆخە نەگونجاوەش....ئەوانە هەموو و هی تریش، نەک پێویستی بەوەیە کەسایەتییەکی سەرکردایەتیی پێکەوە گونجێنەر و ناوەندگیر سەرکردایەتیی بکا، بەڵکو ئەوەی دەشسەپاند و دەبوایە کەسایەتییەکی کاریزمایی خەباتگێڕی ئەوتۆ بێ نێوانی "کۆتر و هەڵۆیان" لە لیژنەی مەرکەزی و هەموو حیزبدا ڕێکخا و، ململانێی نێوانیان وەها بەڕێوە ببا تا حیزب بەرەو بەدەستهێنانی ئامانجە هاوپەیمانییەکانی بچێ و، بێ هیچ هەژانێکی فیکری و سیاسی بتوانێ دەستەبەریان بکا.
جا کە دوای کودەتای ٨ی شوباتی ١٩٦٣ چووە پێگەی یەکەمی حیزب "..... دوای لەداردانی حوسێن ئەحمەد ئەلڕەزی "سەلام

عادل"ی سکرتێری حیزب، ئەو ئەندامانەی لیژنەی مەرکەزی و مەکتەبی سیاسیی لە ژیاندا مابوون، خەریکبوون خۆیان بو کۆبوونەوەیەک ئامادە دەکرد تا سەرکردایەتیی حیزب ڕێکبخەنەوە، لەوانەش هەڵبژاردنی سکرتێری گشتیی حیزبی شیوعیی عێراقی. ئیدی زۆر ناو بۆ ئەو پۆستە خرانە ڕوو. لەوانەش زەکی خەیری و عەبدولسەلام ناسری و کەسانی دییش و منیش. ڕاستییەکەی من دژی خۆپالاوتنێ بووم، چونکە پێموابوو هیی ئەوەی نیمە سەرکردایەتیی حیزبێکی وەک حیزبی شیوعیی عێراقی بکەم، ئاخر من بایی ئەوەندەم ڕۆشنبیریی مارکسی نەبوو بمباتە ئەو پێگەیە، ئەگەرچی پێشتر باسی ئەوەم کرد ئەو دەردی نەخوێندەوارییەی هەمبوو حیزبی شیوعی بۆی چارەسەر کردم. لەکاتی دەنگدان بۆ هەڵبژاردنی سکرتێر، من دەنگم بەخۆم نەدا، چونکە وەک گوتم خۆم بە شایان نەدەزانی. بەڵام دەنگدانەکە لە بەرژەوەندیی من بوو تا بچمە ئەو پێگەیەی سکرتێری حیزب. دەشکرێ ناو لەو هەڵبژاردنە بنێین بژاردەی گونجاندن...." "دووپاتەکە لە ئێمەوە- ئەلناسری".

باسی عەزیز محەمەدی هەر بەوەندەی تەواو نابێ، ئەو ڕەوشتێکی جوانی هەبوو و ئەو خوێندنەوانەی ئێرە باسی دەکەن کە "هەڵوێستی هەرچییەک بووبێ بەرانبەریان، قەتی بە خراپە باسی هیچ کەس یان هیچ بزووتنەوەیەکی سیاسی نەکردووە و، بە تەواویش دانی بە بەرپرسیاریی خۆیدا ناوە لەو پێگە حیزبییەیدا ، جا ڕووداوەکان بە ئاگاداریی ئەو بووبن یان ئاگای لێیان نەبووبێ". بۆیە دەکرێ ئەو خوێندنەوانەی

ئێره تەواوکەری مێژووی تێکۆشـانی حیزبی شـیوعی بن لە سـەر زاری سـکرتێری گشـتییەوە، ئەوەش لەبەر ئەو ماوە زۆرەی هـاوڕێ عەزیز محەمەد سـەرۆکی حیزب بووە و لەلایەکەوە حیزبی گەیـانـدە ئەو ڕۆژەی ئێسـتـا و لەلایەکی دیکەیش ئەو زریان و شکستانەی بەرەوڕووی حیزب بوونەوە و بەتـایبەت جیـابوونەوەی سـەرکردایەتیی مەرکەزی و، لێکترازانی بەرەی نیشتمانی و، شەڕەکانی پشت ئاشان و ئەو دەرەنجـامـانەی لە کۆنگرەی چوار هـاتنەپێش، بەتـایبەت سەبارەت کادیران و "چەپڕەوی"ی بەشـێوەیەکی گشـتی بووە سـیمای سـیاسـەتی حیزب. ئەو خوێندنەوانە ڕێگای نەوەکانی داهاتووش دەربارەی خەباتی حیزبەکەیان و ڕێوانی خەباتەکەی ڕۆشن دەکەنەوە، بەتایبەت شیوعییەکان و ڕۆشنفکران، باسی ئەو بـارودۆخ و ئـاسـتەنگانەیـان بۆ دەکا کە بەرەوڕوویـان بووەتەوە. ئەو هاوبەندییەی خەباتی چنیویانە. ئەو گشتگیرییەی و هەمەلایەنییە مێژووییەی لەو خوێنـدنەوانەدایە خوێنەری زیرەک دەخاتە بەردەم چەندین ویسـتگەی هەمەجۆری خەباتی کـات و شـوێنی مێژووی حیزبی شـیوعی و بزووتنەوەی نیشتمانیی نەیاری ڕژێم و، بگرە مێژووی عێراقی هاوچەرخیش. وەکچۆن ئەو خوێندنەوانەی ئێره، بەو شـێوازە فراوانەی و بەو چاپەی ئێستای، ڕاشکاوی و راستگۆییەکی تێدایە و، بڕێکی زۆری بەڵگەدارییش و، ئەگەرچی هەنـدێ جـار تێڕوانین و بۆچوونی جودای هەنـدێ بیرەوەریی هەنـدێ سـەرکردەی حیزبی تیـدایە "ئەندامـانی مەکتەبی سـیـاسـی یـان لیژنەی مەرکەزی" ئەوانەی برادەری هاوڕێ عەزیز محەمەد بووینە و،

وەکچۆن هەندێ "پاساوهێنانەوە"ی روونیشی تێدایە[illegible]
پۆی بارودۆخی کات و شوێن و هۆیەکانی پشت [illegible]
سیاسییەکانی پێ بشارێتەوە.

**دکتۆر عەقیل ئەلناسری**
**سوید – ستۆکهۆلم**

# پێشەکی

نووســین لەســەر کەســایەتییە ســیاســی و ئەو بابەتانەی بۆ توێژەر بەردڵ نین، چونکە ئەو کەســـایەتییە توێژەر کۆت دەکا و، ڕەنگە ڕستی ئەو کەسایەتییەش ببێ و ئاگای لەوەی نەمێنێ داخوا لایەنە ئەرێنی و نەرێنییەکانی ئەو کەسایەتییە سیاسییە چن و چ نین، لەوانەش کەسایەتیی عەزیز محەمەدی سکرتێری حیزبی شــیوعیی عێراقیی مشـــتومڕێکی زۆری لەســـەر کەســایەتیی کراوە، کە ســێ دەیە ، لە بارودۆخیکی ســیاســیی ئالۆزی مێژووی حیزبی شـــیوعیی پێدا تێپەڕیوە و ئەو دۆخە ســـیـاســـییەی عێراقیش هەیبووە و لەو هەموو کودەتـا ســیاســییانەی تێیدا ڕوویداوە، لە ســەری ســەرەوەی حیزبی شیوعیی عێراقی بووە.

بیرۆکەی ئەوەی دەربارەی عەزیز محەمەدی بنووســـی یان گفتوگۆی لەگەڵ بکەی، پتر بەلای ســەرچلی و ســەرکێشــیدایە، چونکە بەوەی نـاســـراوە کە ڕەتیدەکاتەوە و ڕازی نییە ئەو جۆرە دیدارانە بکا و، ئەنجەتیشـــی ئەوەیە زۆری متمانە بەو شتانە نییە کە پەخشکاران و گفتوگۆکاران بڵاوی دەکەنەوە. بێ زێدەڕۆیی دەتوانم بڵێم ســـەعـاتەکـانی بەرایی ئەو دیدارەی عەزیز محەمەدی گەلێ وێنەی تەڵخ و چـاونۆڕیی دوورە ڕاستیی سەبارەت بەو کەسـایەتییەی لەناو زەینمدا سـڕییەوە، ســـەرچاوەی ئەو وێنانەش ئەو شـــتانەبوون کە لە بیرەوەریی هەندێ لە هاوڕێیەکانیدا ســـەبارەت بە خۆی خوێندبوومنەوە،

لەگەڵ ئەو شـتانەی هەندێ برادەری لە قوناغی جودای ژیانیدا لەگەڵی ژیابوون بۆیان گێڕابوومەوە و، تا دیداریشـم لە هەولێر و لەماڵەکەیدا لەگەڵ نەکرد، لە سـەرچاوەی بێلایەنەوە بەدوای ڕاستی و ناڕاستیی ئەو سەربردانەدا نەگەڕابووم داخوا چەندە لە واقیعەوە نزیکن.

ئەوەش وێنەیەکی ئەوتۆی عەزیز محەمەدم دەداتێ کە زۆری بۆچوون بە زەینێدا گرێدابووم و، ئەو بۆچوونانەشـم لەکاتی خوێنـدنەوەی ئەو دیـدارەدا کۆکردبووەوە کە تۆفیق تەمیمیی ڕۆژنامەنووس بڵاوی کردبووەوە و باسـی ئەوەیشـی کردبوو چەندی ئاستەنگ لەو دیدارەیدا هاتبووە پێشێ و هەوڵی من بۆ فراوانکردنی ئەو دیدارەی سەرباری پشتبەستنم بە سەرچاوە مێژووییەکـانی دیکە، بۆڕوونکردنەوەی گەلێ وێنەی لە زەینی عەزیز محەمەدی نەمابوون، پشـتم بەو دیدارەی تۆفیق تەمیمی بەسـتا و، منیش ڕێی دیدار و دەسـت دانەبەرێم لای عەزیز محەمەدی بۆ کرا، بەڵام ئەوجـارەیـان لە ڕێی کەسـایەتیی قەدرگران، بەڕێز مومتاز حەیدەرییەوە، کە هەموو هەوڵێکی دا تا بمگەیەنێتە ماڵەکەی عەزیز محەمەد و هۆی سـەردانەکەشـم ڕوون بکاتەوە کە بووە دەرووێک بۆ چەندین سـەردانی دیکەی تێیاندا هەندێ زانیاریی بەردەستانم هەڵدەهێنجا تا لە ڕاستییان دڵنیابم و هەندێ زانیاریی کە پێشـتر کەس باسـی نەکردبوو. زۆر جاران بە تەلەفۆن قسـەم لەگەڵ دەکرد و سەرباری ئەوەی چەند مانگیشی پێچووبوو قسـەم لەگەڵ نەکردبوو کەچی لەگەڵ سـەرەتای قسـانرا دەیناسـیمەوە و دەیپرسـی داخوا لە هەولێرێمە، ئەگەر بمگوتبـا بەڵێ و داوای وادەیەکی دیدەنیم لێ

بکردبا فەرمووی دەکردم و، ئەوەی دڵخۆشـــیشـــی دەکردم هەرگیز بە خراپە باســی کەســی نەدەکرد و کەســی بریندار نەدەکرد، بگرە ئەوانەشی کە لە ناو حیزبی شیوعیی عێراقیش لەگەڵی ناکۆک بوون و کاریان بۆ تێکدانی یەکڕیزییەکەی دەکرد. جا بەو هۆیانەی هەیانبووە پاســاوی بۆ دەهێنانەوە و دەشـیگوت ئەودەمی کۆتاییان هات، کە گوتیشم پەیوەندیم بە عەزیز ئەلحاجەوە کردووە ئارەزووی ئەوەی دەربڕی پەیوەندیی پێوە بکا و سڵاوی لێ بکا و لە تەندروستیی بپرسێ. جا کە کۆمەڵێ زانیاریم دەربارەی بەشێکی مێژووی ئەو لێرە و لەوێ کۆکردەوە، بیرۆکەکەمم خستە بەردەستی، خۆگری و خۆپارێزیی لەسەر بڵاوکردنەوەی هەر شتێک نیشاندا کە لە شـیوەی بیرەوەری بێ و لەسەر ئەوەش بە ڕووێکی خەندەبارەوە گوتی من کێم تا بیرەوەریم هەبێ و، کەسیشمان ناتوانێ باسی خراپەکانی خۆی بکا پەندێکی میلیی هێنایەوە کە دەڵێ "کەس بە دۆی خۆی ناڵێ ترشە". کە ویستیشم ئەو بیرۆکە ڕەگاژۆیەی لە زەینیدا بێنمە دەرێ، داوای کرد ئەوەی دەینووسم پێی نیشان بدەم و بینێرم بۆ هەردوو هاوڕێی خەباتی، جاسم حەلوائی و عادل حەببە، ئەگەرچی ئەوەی ئەودەمی نووسیبووم لە چەند لاپەڕەیەک تێنەدەپەڕی و ئەودەمی ڕازیبوون بڵاوبکرێتەوە. جا دیتم دەبێ هەرچیم نووسیوە کۆیان بکەمەوە، کە هیی پێنج ساڵ پێشتری بوون تا ئەو دیدارانە بە سەرچاوەی مێژوویی هەمەجۆر پشتڕاست بکەمەوە، تا گفتوگۆی عەزیز محەمەد و لێکۆڵینەوەی مێژوویی پشت بە سەرچاوە بەستوو پێکەوە کۆبکاتەوە.

توێژه‌ر کتێبه‌که‌ی به‌پێی ڕیزبه‌ندیی مێژوویی خاوه‌نی سه‌ر پ ده‌ دابه‌ش کردووه که به پێشه‌کیی توێژینه‌وه ده‌ست پیده‌کا و ئه‌وجا بارودۆخی پێگه‌یشتن و گه‌وره‌بوونی و سه‌ره‌تایه‌کانی هۆشیاریی سیاسیی و چوونه ناو ڕیزه‌کانی حیزبی شیوعیی عێراقیی و تا گیرانی و دوایه‌ش وه‌رچه‌رخانی نوێی

مێژووی عێراقی هاوچه‌رخی خۆی له شۆڕشی ١٤ی ته‌مووزی ١٩٥٨دا ده‌نوینی و، ئه‌و مه‌ودایه‌ی حیزب تێیدا تا ڕاده‌یه‌ک کرایه‌وه، تا کوده‌تای هه‌شتی شوبات و ئه‌و نوشوستییه‌ی تووشی حیزبی شیوعیی عێراقی بوو و، له ١٩٦٤ دا عه‌زیز محه‌مه‌د بووه سکرتێری حیزبی شیوعیی عێراقی و تا ده‌رچوونی له‌و پۆسته له کۆنگره‌ی پێنجه‌می حیزبی شیوعیی عێراقی له ١٩٩٣.

شایانی سوپاسه که هه‌ردوو هاوڕێی خه‌باتی عه‌زیز محه‌مه‌د، عادل حه‌ببه و جاسم حه‌لوائی، به‌شدارییه‌کی گرنگیان له پێداچوونه‌وه‌ی هه‌ندێ ده‌قی کتێبه‌که و بژارکردنیدا کرد و، ئه‌وده‌می به‌ختی ده‌ستکه‌وتنی ڕه‌زامه‌ندیی خاوه‌نی گه‌واهیدانه‌که‌م هه‌بوو، واته عه‌زیز محه‌مه‌د و، چه‌ندیشم ئاوات ده‌خواست ئه‌وه‌ی ئێستا نووسیومه بیخوێنێته‌وه و، هیوادارم کتێبه‌که جێی ڕه‌زامه‌ندیی جه‌ماوه‌ر بێ که چاوه‌ڕێیه شتێک ده‌رباره‌ی عه‌زیز محه‌مه‌د بخوێنێته‌وه. پێشموانییه ئه‌و دیداره ئاره‌زوو و فزوولی چاوه‌ڕوانان تێر بکا. به‌ڵام بێگومان سه‌ره‌تای کرانه‌وه‌ی ئاسۆیه‌کی نوێ ده‌بێ و هانده‌رێکی به‌هێزیش تا وه‌ک نامه‌یه‌کی زانستی له‌سه‌ر که‌سایه‌تیی عه‌زیز محه‌مه‌دی بنووسرێ، به‌وه‌ش ئه‌و که‌موکورییانه ببوێرێ که

توێژەر تێیکەوتووە. ڕەنگە ڕووبـــارێکی دیکەی بیرەوەرییش بەتەنیشـــــت ئەو دوو ڕووبارە نەمرەیدا داڕژێ، ئەویش ئەگەر تەمەن و کۆســـپەکانی ڕۆژگار ڕیگا بەوەی بدەن. جا با ئێســـتا بوار بـــدەینە مـــامۆســــتـــا عەزیز محەمەد تـــا وەڵامی ئەو پرســــیارانەمان بداتەوە کە لێمان کردووە و، تا باســـی ئەوان ڕۆژانمان بۆ بکا و ڕووداوە دژوارەکانیشی.

توێژەر، بۆ پشـــتڕاســــتکردنەوەی ئەو ڕووداوە مێژووییانەی عەزیز محەمەد بەشـــێـک بووە تێیـــانـدا، پشـــتی بە گەلێ سەرچاوەی عارەبی و کراوە عارەبی بەستووە، کە ئەستەمە لە گێڕانەوەی ئەو ڕووداوە مێژوویـیـانەدا پشــــت بە یـادگەی مامۆستا ببەستین و سەرچاوەکان وەلانێین.

**دکتۆر سەیف عەدنان ئەلقەیسی**

# لەدایکبوون و پێڕاگەیشتن

ئەو، عەزیز محەمەد عەبدوڵلایە و، نازناوی "ئەبو سـعود"ە، بەپێی ئەو زانیارییانەی لە بارەی ژیانییەوە لە بەڕێوەبەرایەتی ئاسایشی گشتی هەڵێنجراوە، لە ١٩٢٤ لە هەولێر لەدایک بووە[1] خۆیشـی لای خۆیەوە هەندێ زانیاریی فراوانتری دەربارەی ژیـانی رابردووی دا و گوتی خەملاندنی دایـک و بـاوکم سـەبارەت بە ڕێکەوتی لەدایکبوونم جودابوو. ئەودەمای بەپێی جۆخینی ئەوسـالّی تەمەنیـان بۆ دادەنـای، یـانیش بەپێی ڕووداوێکی ئەوسـالّی روویدابوو ڕێکەوتی لەدایکبوونیان بۆ دەژمـاردی. چونکە تۆمـارکردنی لەدایکبوون لە گونـد و لادێیەکانـدا نەبوو، لەو قۆنـاغیـدا ئەوە بـاوبوو. لە بەڵگەنـامە فەرمییەکاندا ئاماژە بۆ ئەوەی کراوە کە لە ١٩٢٤/٧/١ لەدایک بوویمە و لەوێ، وەک زۆربەی هەرەزۆری عێراقییـان، لەبەر دیـارنەبوونی ڕۆژی لەدایکبوونیـان، یەکی تەمموززییـان بە ڕۆژی بوونم داناوە.[2]

من لە خـانەوادەیەکی جووتیـاری نەدارم، بـاوکم، محەمەد عەبدوڵڵا، جووتیار بووە و لە ناوچەیەکی کوردنشـینی دەوری

---

[1] _ مديرية الامن العامة :دور المعلومات و الخبرة الامنية في متابعة الحزب الشـ[illegible] العراقي، نيسان ١٩٨٥، ص٢٢٠.

[2] _ حەننا ا بەتاتو، لەکتێبی سـێیەمی – شـیوعییەکان و بەعسـیەکان و [illegible] ئازایخواز– سـەبارەت بە عەزیز محەمەد دەڵێ لەدایکبووی سـلیمانیی ١٩٢٣ [illegible] تەنەکەچییەکییە، لەکاتێکدا عەزیز محەمەد ئەو زانیارییانە ڕەتدەکاتەوە، [illegible] لەدایبووی هەولێرێیە و لە ١٩٢٤. بۆ زانیـاریی زێتر: حنـا بطـاطو، العراق [illegible] منشورات دار القبس، الكويت، ص١٦٢ – ١٦٣.

هەولێرێ بە ڕۆژانە کاری کردووە و، پێیدەڵێن گوندی بێرکۆت، هەرچی سەوسەن مەحمودی دایکمە، لە وان و باشقەلایرا هاتووە، واتە خەڵکی باکووری[٣] کوردستانە لە تورکیا. لە دوادواییەکانی شەڕی یەکەمی جیهانی بەتەنێ ئەو ناوچە بەرین و دوورەی دەبڕێ و دەگاتە دەوروبەری هەولێرێ "١٩١٤-١٩١٨"، ئەوەش لەبەر بارودۆخی تایبەتی خانەوادەکەی دایکم کە ناچاری ڕەوکردن بووە و دەیانگوت لەبەر کۆمەڵکوژیی خانەوادەکەی بووە لەکاتی شەڕێ. لە گوندی بێرکۆتێ دایکم شووی بە باوکم کرد و، ئەودەمی هیچ خزمێکی لە بەری عێراقێ نەبووە. گوندی بیرکۆت ئەودەمی لە هەولێرێ نزیک بووە و، ئێستا بەشێکە لە هەولێرێ و، من لەوێ لەدایکبوویمە. ئەمن ئەو سالانی منداڵییەم بەبیرنایەتەوە کە لەو گوندەی ژیاوم. بارودۆخی گوزەرانی باوکم ناچاری کردبووین بەدوای کاردا لەو گوندی بچینە ئەو گوندی. قەتیشم لەبیر ناچی لە بارکردنێ، بە گچکەیی، چۆنیان دەخستمە لایەکی تێرکەی.

سەرباری ئەو تەنگدەستییەی ئەودەمای، کەچی دایکم ئارەزوویێکی زۆری خوێندنێی هەبوو، ئەو زووی هەناردمە بەر خوێندنێ، ڕەنگە ئەوەش لەبەر ئەوەی بووبی کە باوکی مەلا بووە، ئیدی حەزی لێبووە من ببمە مامۆستا. کە دایکم بردمییە شاری هەولێرێ و ماڵی باوکمی بە یەکجاری بەجێهێشت، من بچووک بووم، چونکە باوکم ژنێکی دیکەی هێنا و ئەوەش بۆ دایکم کارەساتێکی دیکە بوو و، ئیدی بەتەنیا لەگەڵ دایکم

---

[٣] _ لە کتیبەکەیدا دەڵێ کوردستانی باکوور.

دەژیام. ئەگەرچی کەســـوکاری باوکم و کەســـوکاری (؛؛ە نوێیەکەی زۆریـان ڕێز لێـدەنـا، بەڵام ئەوە توورەیی دایکمی هێور نەکردەوە و، باری شـانی تەنیایی ســووک نەکرد. منیش تووشـــی غەریبی و تەنیـاییەکەی دایکـم بـووم و، ئەو ناکۆکییانەش، کە بە پێویستیان نازانم لێرە باسیان بکەم، کاری لێکردم. ســـەربـاری ئەوەی بـاوکیشـــم مـابوو، کەچی زۆر پەیوەستی دایکم بووم. من پێش ئەوەی کوڕی باوکم بم کوڕی دایکمم.[٤]

دوای ئەوەی دایکم ماڵی مێردەکەی بەجێهێشـــت، لە هەولێری دەستی بە کارکردن کرد. منیش لە مزگەوتی ئەبەبەکری سدیق قورئانم دەخوێند و، ماوەیەکی کورتیش لە گوندەکانی پیرزین و شـــاوێس و بەحرکەی فەقێیەتیم خوێند و، ئەوە دوا قۆناغی خوێنـدنی فەقێیەتیم بوو لەو گونـدانە. لەبەر ئەو بـارودۆخی تەنگدەسـتییەی بەسـەرماندا هات، پێش ئەوەی پلەی پێویسـتی ئایینی بەدەســـتبێنم دەســـتم لە خوێندنی فەقێیەتی بەردا و گەڕامەوە شاری هەولێرێ و، هەر سێ یان چوار کتێبم خوێند. کە گەڕاینەوە شـاری هەولێرێ ئیدی بەدوای کارێکدا دەگەڕام. دەچوومە مەیـدانی کرێکـاران، بەڵام لەبەر گچکەیی تەمەنم نەیاندەبردمە ئیشێ و، ئەودەمی نێزیکی چواردەساڵیم کردبوو، واتە ساڵی ١٩٣٧-١٩٣٨.[٥]

ســـەرباری ئەو بارودۆخەی لەگەڵ دایکم پێیدا تێپەڕیم، کەچی هەندێ ناســـیاو دایکمیان هاندا بمنێرێتە قوتابخانە. ئەودەمی

---

[٤] _ دیداریک لەگەڵ عەزیز محەمەد ٢٠١٤/٣/٣ ، هەولێر.

[٥] _ دیداریک لەگەڵ عەزیز محەمەد ٢٠١٢/٢/١٦

دایکم بۆ بەدەســـــتهێنانی پارووە نانێک لەماڵان کاری دەکرد. بەسـای ئەو ناسیارانەوە لە قوتابخانە تۆمارکرام. چونکە، وەک ئاماژەم پێدا، پێشــتریش فێرە خوێندنەوە و نووســین ببووم و، لەبەردەم بەڕێوەبەریی قوتابخانەش گوزارشــتی " ضــرب زید عمرا"م گوتەوە، ئیدی یەکڕاست لە پۆلی سێیان دانام. جا دوای تەواوکردنی خوێندنی ســـەرەتایی خەیکبوو بیرۆکەی خوێندنی دواناوەندیی پیشـــەســـازی یان خانەی مامۆســـتایانی لادێ لەمێشـــکم دەگەڕا. بەڵام لەبەر گەورەیی تەمەنم لەوەیـدا ســـەرکەوتوو نەبووم، دەبوایە تەمەنم دووســـــاڵ بچووک بکەمەوە، بەڵام سەرباری ئاسانییەکەیشی پەنام بۆ ئەو کارەی نەبرد، دوای تەواوکردنی خوێندنی سەرەتایی ماوەیەک بێ کار مـامەوە. بە هـاریکـاری و دەســـتباری هەندێ برادەر توانیم کارێکم لە بەڕێوەبەرایەتیی ئازووخە دەستکەوێ و سێ ساڵ لەو بەڕێوەبەرایەتییە کارم کرد.[٦]

**سەرەتایەکانی هۆشیاریی سیاسی:**

ساڵانی ١٩٤٠ – ١٩٤١ سەرەتای چالاکیی سیاسیم بوو. هەر لە هەمان ماوەدا کۆمەڵێ لاوی خوێن گەرم هەبوون و پاڵیان پێوەدەنام بچمە ناو کێشمەکێشی ژیانی سیاسی، نەخاسمە کە کورد دووچـاری بـارودۆخێکی ســـیـاســـی و ئـابووری و کۆمەڵایەتیی خراپ ببوو و، کاردانەوەیەکی ئەوتۆی لای گەنجی کورد دروســت کردبوو خەریکبوو دژی واقیعە تاڵەکە راپەڕێ. لەناو ئەوانەی کاریگەرییان لەسەرم هەبوو، مامۆستا و ئەدیبی

٦ دیداریکلەگەلعەزیزمحەمەد ٢٠١٦/٢/١٦

ڕۆژنامەنووس عیزەدین فەیزی بوو. ئەو ڕۆڵێکی کاریگەری لە گواستنەوەی وێنەی ئەدەب و سیاسەتدا هەبوو، لە کاتێکدا، لە سـاڵانی لاویماندا، نووسـین بە زمانی کوردی هەر زۆر کەم بوو.[7]

ساڵی ١٩٤٠، ئێمەی قوتابیانی پۆلەکانی "٤، ٥ ، ٦"یان بۆ گەڕان بە گەشـتێکی قوتابخانە بردە دەرەوەی شـاری هەولێرێ. ئەودەمای بەهاربوو و، گیا دەگەیشـەتە بەلەکان. بۆنەکەیش جەژنی نەورۆز بوو. مامۆسـتا عیزەدین فەیزی هەسـتا و وتارێکی کورتی بۆ داین، تیایدا هانیداین و ورەی جۆشـداین. ئەودەمی هەسـتمان دەکرد پتر گەورەبووینە. مامۆسـتا دڵی پڕ خۆشەویستیی گەل و نیشتمان کردین. ئەو ڕۆژە لە ژیانی مندا تـامێکی تـایبەتی هەبوو، چونکە ئەوە هەنگـاوی یەکەم بوو کە وردەوردە منی خستە سەر ڕێی قۆناغەکانی پاشترێی کاروانی تێکۆشـان. کە هەر قۆناغێکیان چێژ و چەشـەی تایبەتی خۆی هەیە.[8]

لە بەرایییەکانی ژیانی سـیاسـیدا چوومە ڕیزەکانی کۆمەڵەی هیوا[9]، ئەوەش لە ئایاری ١٩٤١ بوو و تێیدا بوومە ئەندام. لە مێژووی ژیـانمدا ڕێوڕەسـمی بوونە ئەنـدامی "هیوا" تـامێکی

---

[7] _دیدارێکلەگەڵ عەزیز محەمەد ٢٠١٤/٤/٥

[8] _ دیدارێک لەگەڵ عەزیز محەمەد ٢٠١٦/٢/١٦

[9] _ ڕەفیق حیلمی لە سـاڵی ١٩٣٩ ئەو کۆمەڵەیەی دامەزراند و، هەندێ قوتابیی کورد و هەنـدێ خوێنـدەوار تێیـدا ئەنـدام بوون، بەلام چـالاکییەکـانی سـنووردداربوون و، چالاکییەکانی بە ئاراسـتەیەکی ڕاسـتڕەوی دادەندران. بۆ زانیاریی پتر: عبدالجبار حسـن الجبوری، الاحزاب و الجمعيات السياسية في القطر العراقي ١٩٠٨ – ١٩٥٨، دار الحرية، بغداد، ١٩٧٧، ص ١٢١.

تایبەتی هەبوو، چونکە ئارامی و شـــایی بەخۆبوونی دەدایە دەروونـی بـنـیـادەمـی. ئەودەمـای، ئەگەرچـی ژمـارەی نـاسـیـاوەکانمان ئەوەندەش نەبوون، بەڵام یەکگرتوو و بە جەسـارەت بووین. لە هیوادا شــارەزای ئەو بیرۆکە پێشکەوتنخوازییانە بووم کە تێیدا دەخرانەڕوو. دواتریش چوومە ڕیزەکـانی حیزبی "شــۆڕش"، کە وەک کـاردانەوەیەکی ئەو بارودۆخە خراپەی ناوچەکەی بە گشتی گرتبووەوە، خەریکبوو چەمکە مارکسییەکانی دەخستەڕوو.[١٠]

لە بارودۆخی شەڕی دووەمی جیهانی و، لە ١٩٤١ و، ڕێک لەو کاتەی ئەڵمانیا هێرشی کردە سەر یەکێتیی سۆڤیەت، ڕێژەوی شەڕ و سروشتی شەڕ گۆڕا، ئەو هێرشە ناوەرۆکێکی دیکەی دایە شـەڕەکە، نەخاسـمە دوای شـەرەکانی سـتالینگراد و ئەو سـەرکەوتنانەی سـۆڤیەتییەکان بەدەسـتیان هێنا. ئیدی کەشـی گشـتیی عێراق گۆڕا و، دوای ئەوەی یەکێتیی سـۆڤیەت چووە بەرەی هاوپەیمانانی هەریەک لە بەریتانیا و فەرەنسا و یەکێتیی سـۆڤـیەت لە ڕیـزەکـانـی بـوون و، دوایەش ویـلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکایان چووە پاڵی، تارادەیەک شـنەیەکی ئازادی و دیموکراتی هەڵیکرد. ئەو ڕووداوانە خوێنی سـەدان و بگرە هەزاران لاوی تازە پێگەیشـتوویان جۆشـدا و، لە ژێر سـایەی کـاریگەریی ئەو دۆخە نوێیەی دنیـا بیری ئـازاد بڵاوبووەوە. جـا هەر لەو ڕێوانەیـدا، چـالاکییەکـانم هەر بە ئەندامێتیی کۆمەڵەی هیوا نەوەسـتا، لە سـاڵی ١٩٤٢ بوومە

---

[١٠] _ دیدارێک لەگەڵ عەزیز محەمەد ٢٠١٤/٤/٥

ئەنـدامی کۆمەڵەی "گەل"ی ڕۆژنـامەیەکی بە نـاوی بلیسـە دەردەکرد و، خۆی بە ڕۆژنامەیەکی مارکسی دادەنا.[11]
دوای ئەوە بە دوو قۆناغی دیکەدا تێپەڕیم، یەکەمیان بەسـتنی کۆنگرەی یەکەمی حیزبی شـیوعیی عێراقی بوو لە بەراییەکانی ١٩٤٥ [12]. ئەودەمی گەیشـتمە ئەو قۆناغەی دەبوایە بیگەمێ، ئەویش دوای بڕیاردانی بەرنامەی حیزبی شـیوعیی عێراقیی مـافی گەلی عێراقی بە ئـازادی و برایەتی و یەکسـانی دووپـاتکردەوە، کە حیزبەکـانی دیکە خـاوەنی ئەو جۆرە بەرنامانە نەبوون تا مافی دەستەکانی خوارترێی ناو کۆمەڵگای عێراقی لە خۆبگرێ.[13]

---

[11] _ دیدارێک لەگەڵ عەزیز محەمەد ٢٠١٤/٤/٢٢

[12] _ کۆنگرەی یەکەمی حزبی شـیوعیی عێراقی لە ١٩٤٤ بەسـترا، کۆنفرانسـی یەکەم ١٩٤٤، پاشان کۆنگرەی یەکەم لە ١٩٤٥ لەژێر دروشمی " ڕێکخستنی حیزبی شیوعیدار، بەهێز بکەن، ڕێکخستنی بزووتنەوەی نیشتمانیتان بەهێز کەن" بۆ زیاتر: وثائق المؤتمر الاول للحزب الشيوعي العراقي ١٩٤٥، مطبعة الثقافة الجديدة، ١٩٧٤ .

[13] _ دیدارێک لەگەڵ عەزیز محەمەد ٢٠١٤/٤/٥ .

# چوونە ناو ڕیزەکانی حیزبی شیوعیی عێراقی:

زستانی ١٩٤٥-١٩٤٦ چوومە ناو ڕیزەکانی حیزبی شیوعیی عێراقی، ڕاستییەکەی دوای ڕاپەڕینی ١٩٤٨، کە جێگۆڕییەکی جۆرگۆڕیی لە ژیانی سیاسیمدا کرد، بەسای کارکردنم لەناو حیزبی شیوعیی عێراقیدا خەریکبوو بیروبۆچوونەکانم پتر ڕووندەبوونەوە و، ئەوەش وایلێکردم کاری حیزبی لە ڕیزەکانی ئەو حیزبەدا بکەمە پیشە، کە بەرگریی لە مافەکانی کرێکاران و جووتیاران و چینە ڕەنجدەرەکان دەکرد.

سەرەتایەکانی چالاکیی سیاسی "یەکەم کەس لە چەپەوە"

سەرباری ئەوەی چووبوومە ڕیزەکانی حیزبی شیوعی کەچی تەنیا زمانی کوردیم دەزانی. سەبارەت بە زمانی عارەبی، لە

ڕێی خوێندنی ناو ڕیزەکانی حیزبی شیوعییەوە فێری بووم، کە بەندیخانە "یەکەم قوتابخانەی فێربوونی ئەو زمانەم بوو" بەو جۆرەش حیزبی شیوعی "نەخوێندەواری"یەکەی لەناوبردم و، پاشانیش برێک ڕووسی فێربووم. دوای چوونە ناو ڕیزەکانی حیزبی شیوعی، لەباتیی نافیع یونسی بەرپرسی پێشتریێ، کە بووە بەرپرسی لیوایەکانی باکوور و چووە کەرکووکێ، بوومە بەرپرسی لقی هەولێرێ. جا وەک بەرپرسەکانی پێشەخۆم، خەریک بووم بنەماکانی حیزبی شیوعیم بلاودەکردەوە و، لەوەشدا بۆنە نیشتمانییەکانی وەک نەورۆز و بۆنەی دیکەم دەقۆستەوە کە کرێکاران کۆدەکرانەوە و جووتیاران لە گوندیڕا دەهێندران[14] .

دوای چوونە ڕیزی حیزبی شیوعیی عێراقیم، سەرباری ئەوەی بەرپرسیارێتیی لقی حیزبی شیوعیی عێراقیی شاری هەولێریم لەسەر شانی بوو، کەچی هەر خێرا، لەبەر ئەو نوشوستییەی حیزبی شیوعی دوای دەستگیرکردنی سەرکردەکانی "فەهد و حازم و سارم"[15] تووشی هات، لە بنکەی حیزبەوە لە بەغدا داوام لێکرا یەکسەر لەوێ ئامادەبم و، ئەو لیژنە حیزبییانەی کۆنگرەی حیزب ڕێی پێ نەدابوون ئەرکی بەڕێوەبردنی

---

[14] _ دیدارێک لەگەڵ عەزیز محەمەد ٢٠١٤/٥/٢٢.

[15] _ لە ١٨ی کانوونی دووەمی ١٩٤٧ فەهد و هەردوو ئەندامی مەکتەبی سیاسی، حوسێن محەمەد شبیبی و زەکی محەمەد بەسیم لە ناوچەی سالحییە گیران. بڕوانە: صلاح الخرسان، صفحات من تاريخ الحركة الشيوعية في العراق، دار الفرات، بيروت، ١٩٩٣، ص ٥١.

کاروبارەکانی حیزبیان گرتە ئەســـتۆ[١٦]. ئامانجی ئەو لیژنانە بەڕێوەبردنی کاری حیزب بوو لەو بارودۆخە شلۆقەیدا. دوای مردنی مەجید مەلا خەلیفەی یەک لە کادیرەکانی حیزب بوو لە بەغدا و، بۆ هەڵەڕێکردنی چاوەکانی ئاسـایشـی دەسـەڵاتیش، نیشتەجێی یەک لە ماڵەکانی حیزب بوو، ئیدی زۆر پێویستبوو خانەوادەیەک بێ و لە خانووەکەی چاپخانە نیشـــتەجێ بێ. ئەوەش وای لە مالیک سـەیفی بەرپرسـی یەکەمی لیژنەی مەرکەزی کرد سـەفەری کەرکووک بکـا و دوایەش وەک بەرپرسـی هەولێریێ داوای لەمن کرد لەگەڵ دایکم بۆ ئەو مەبەسـتە بچینە بەغدا. ئیدی دایکمم بردە بەغدا و لە یەکەم ماڵی گەڕەکی قەرتاجە – حاجی فەتحیی نزیک عەببەخانە، نیشتەجێ بووین کە چاپخانەی حیزبی شیوعی لەو ماڵەیدابوو. جا دایکیشم زۆرجاران بۆ ئەو چارەنووسەی چاوەڕێمان دەکا، دەگریا و نەفرەتی لە بەختی خۆمان دەکرد[١٧].

سەرباری ترسی دایکم لەو چارەنووسە نادیارەی چاوەڕێمان بوو، وەک زەکییە مەلا خەلیفەی کـادری حیزب لەبەردەم لێکۆڵینەوەی تاوانەکاندا لە قسـەکانیدا دانی پێدا نا، دایکم بڵاوکراوەکـانی حیزبی وەردەگرت و ئەو نـامـانەی دەهـاتنە مەرکەز ئەو دەیگەیاندن، جا زەکییە لە قسـەکانی دەڵێ: "لە دەرگام دەدا و بەیاننامەکەم دەدایە ژنێکی کوردی ناوی نازانم،

---

[١٦] _ حەندنا بەتاتۆی توێژەر لە حیزبی شـیوعی ناوی لە مەودای ئەو لیژنانە ناوە ماوەی لیژنە حیزبییەکانی لەلایەن لیژنەی مەرکەزیی حیزبی شـیوعیی عێراقی ڕێگەیان پێ نەدراوە، لە ١٩٤٧ تا ١٩٤٩ .بۆ زیاتر: حنا بطاطو الكتاب الثاني ، ص ٢٢٩.

[١٧] _ دیدارێک لەگەڵ عەزیز محەمەد ٢٠١٤/٤/٢٢ .

بەڵام دەتوانم بیناسمەوە و کوڕەکەیشی کە ناوی عەبدوللابوو هەر لەوێ بوو."[18]

بەڵام لەبەر ڕاوەدوونانی ئاسـایش و داڕووخانی بە دەنگ و سەدای هەندێ سەرکردەی حیزب، لەسەر دەستی پیاوانی ئاسایشی بەدوای حەشارگە و جێیەکانی خۆشاردنەوەی ڕێکخستنەکانی حیزبی شیوعیدا دەگەڕان، چالاکیی حیزبیمان ئەوەندە بەردەوام نەبوو، کە ئەوەش دوای گیرانی هەرسێ سەرکردەکەی، لە ساڵی ١٩٤٧، بووە هۆی نوشوستیی حیزب. پاشان لەگەڵ دایکم چووینە ماڵێک لە گەڕەکی "هیتاویین" و، لەوێ یەهودا سدیق و جاسم حەموودی لە ماڵەکە لەگەڵمان بوون و، چونکە جاسمیش لای دەسەڵاتە ئاسایشییەکانی بەغدا کەسێکی نەناسراوبوو، ئیدی پەیوەندیی بە ئەندامەکانی دیکەی ڕێکخراوە حیزبییەکانەوە دەکرد. منیش، وەک هەموو شیوعییەکانی دیکەی دەکەوتنە کەمینێکی ئاسایشەوە، لە ١٩٤٨/١٠/١٢لەگەڵ ئەندامانی لیژنەی مەرکەزیی یەکەم، دەستەی مالک سەیف[19]- یەهودا سدیق، لەو ماڵەدا گیرام، کە ماڵێکی حیزبی بوو و لە ناوچەی هیتاویین و دایکیشم هەر لەوێ گیرا و بڕەپارەیەکی لەناو باولی کەلوپەلەکانی بوو

[18] _ پۆلیسی گشتی- بەڕێوەبەرایەتیی لێکۆڵینەوەکانی تاوان، موسوعة سرية خاصة بالحزب الشيوعي العراقي السري، ٦ اجزاء، مطبعة الحكومة بغداد، ج ١ ، ١٩٤٩، ص ١٧٥.

[19] _ مالک سەیفی دوای گیرانی فەهد بەرپرسی حیزبی شیوعی بوو، لە قسەکانی بەردەم لێکۆڵینەوەکانی تاوان باسی ڕۆڵی عەزیز محەمەدی کردبوو و گوتبووی بەرپرسی حیزبی شیوعیی لیوای هەولێرییە. بۆ زیاتر: الموسوعة الجنائية السرية، ج١، ص ٥.

دەستی بەسەردا گیرا. دایکم ئەو پارەیەی لە فرۆشتنی هەندێ کەلوپەل و هەندێ ئاژەڵ کۆکردبووەوە کە لە گوندی هەمانبوو و هەندێکیشی لە مووچەی من پاشەکەوت کردبوو[20].

وا باشە باسی چۆنیەتیی بەسەرادانی ئەو لانەیە بکەم و بڵێم چۆن گیرام. دوای بەردانی عەبدولڕەزاق عەبدولوەهاب، کە کادیرێکی حیزبی شیوعی بوو، بڕیاردرا بنێردرێتە شاری خانەقین، ئەو خۆیشی داوایەکی پێشکەشکردبوو تا لە عێراق بڕوا و بۆ چارەسەر بچێتە ئێران. من لەگەڵ یەهودا لەوماڵەی حیزبدا دەژیام کە ئەودەمی بەرپرسی حیزب نەبوو، بەرپرسیارییەکە درابووە مالیک سەیف. یەهودا داوای لێکردم بچم لە دەرمانخانەکەی، حوسێن تەها عەبدولوەهاب ببینم و بیهێنمە ماڵە حیزبییەکە. ئیدی تا توانیم ڕێیەکەم گۆڕی و بە ڕێی پێچاوپێچدا ڕۆیشتم تا عەبدولوەهاب بگەیەنمە ماڵەکە. دوای گفتوگۆی نێوانمان، هەرکە عەبدولوەهاب ڕۆیشت، یەکسەر پۆلیس بەسەری دادان. پێدەچوو پەیوەندیی بە ئاسایشەوە هەبووبێ.[21]

جا کارەکە هەرچۆنی بووبێ، دوای گیرانم هەواڵەی ئەنجوومەنی عورفیی سەربازیی یەکەم کرام کە لە ١٩٤٩/٢/١٢ پێکهێندرا و، عەبدوڵڵا ڕفعەت نەعسانی سەرۆکی بوو و هەردوو دادوەریش، خەلیل زەکی مەردان و عەبدولکافی متوەلی ئەندام بوون لەگەڵ موقەدەم محەمەد عەبدولقادر و

---

[20] _ لە دیدارێکی عەزیز محەمەد ٢٠١٤/٤/٢٢

[21] _ عەبدولوەهاب عەبدولڕەزاق بووە چاوساغی بەڕیوەبەرایەتیی لێکۆڵینەوەکانی تاوان و لانەی شیوعییەکانی نیشان دەدان.

ڕەئیســــی ئەوەل ئەحمەد داود. جـا بەپێی مـاددەی یەکەمی پاشکۆی یاسای سزادانی بەغدادیی ژمارە "٥١"ی ساڵی ١٩٣٨ و، دوای ســـاغبوونەوەی ئەو تۆمەتەی ئەنجوومەنی عورفی ســەربازیی یەکەم ئاڕاســتەی کردبووم بەوەی لە ڕێکخەرانی شــانەکانم و دوای ئەوەی شــایەدەکان دانیان پێدا نابوو، لەوانەش مالیک ســەیف و یەهودا ســـدیق، [22] ئەو تۆمەتەش دەقی بڕگەی "٥/ب"ی بەســەردا دەســەپێ بە دەلالەتی بڕگەی دووەمی م لە ماددەی یەکەمی یاسای سزادانی بەغدادیی ژمارە "٥١"ی ١٩٣٨. جا دادگا پازدەساڵ بەندیی بە کاری قورسەوەی بۆ بڕایەوە و، دوای بەربوونیش دەبووایە پێنج ســـاڵ لەژێر

---

[22] ـ دوای دەستگیرکردنی یەهودا سدیقی بەرپرسی ڕێکخستنەکانی حیزبی شیوعیی عێراقی بوو و، ئەوەش بە ڕێپێدانی فەهدی سـکرتێری حیزبی شـیوعی لە ناو بەندیخانەوە، ئیدی یەهودا سدیق لە ٢١ی تشرینی دووەمی ١٩٤٨ ڕووخا و لەبەردەمی لێکۆڵەران دانی بەوەیدا نا کە مالیک سـەیف بەرپرسی یەکەمی حیزبە و ئەویش دانی بە حەشارگەکانی حیزب و کادیرەکانیدا نا. بۆ زانیاریی پتر: عزیز سباهي، عقود من تاريخ الحزب الشـيوعي العراقي ٣اجزاء، منشـورات الثقافة الجديدة، دمشـق، ٢٠٠٢، ج ١، ص٤٠٦

چاودێریی پۆلیسدا بم، ئەویش بەپێی ماددەی "٧٥"[٢٣]ی یاسای سزادانی بەغدایی.[٢٤]

بەو جۆرەش لاپەڕەیەکی نوێ لە ژیانم دەستیپێکرد، بەڵام ئەو جارەیان لە بەندیخانەی نوگرە سەلمانی بیابانێ[٢٥]. گواستنەوەی زۆربەی بەندییە شیوعییەکانی حکوومەت بە مەترسیداری دادەنان، بۆ ئەو بەندیخانە بیابانییە، بۆ ئەوەبوو تا لە هەموو پەیوەندییەکی ڕێکخراوەکانی دەرەوە دووربن نەوەکا ئەوەی لەگەڵ یوسف سەلمان یوسف "فەهد" و هاوڕێیەکانی ڕوویدا دووبارە ببێتەوە، کە دووبارە پەیوەندییان بە ڕێکخراوەکانی دەرەوەی بەندیخانە کردبووەوە.

---

[٢٣] _ پاشکۆی سزادانی بەغدایی ژمارە ٥١ی ساڵی ١٩٣٨ ئەو یاسایەیە کە لەسەردەمی وەزارتی چوارەمی مەدفەعیدا هەموارکرایەوە، لە دەقەکەیدا هاتووە هەرکەسێکی پێی باش بێ یان بانگەشە بۆ هەر مەزەبێکی سۆشیالیستی، شیوعیی ئاژاوەگێڕیی بەدرەوشتی و، هەر شتێکی هاوتای ئەوەی بکا کە ئامانجی گۆڕینی دەسەلات و بنەما یان بارودۆخی سیاسی بێ بۆ ئەو ئامادەکارییە کۆمەلایەتییەی لەو یاسا بنچینەییەدا هاتووە، بە تاوانێک دادەندرێ کە شایانی سزای حەوت ساڵ زیندانی یان بەندیی هەمیشەیی، یان لە سێدارەدانە ئەگەر کارەکەی لەناو هێزە چەکدارەکاندا بێ. بۆ زیاتر:عبدالرزاق الحسني ، تاريخ الوزارات العراقية، الجزء التاسع، الطبعة الجامسة، دار الحياة، بلا، ص ١٥.

[٢٤] _ بۆ زیاتر:الموسوعة الجنائية السرية ، المصدر السابق، ج ٤، ص ٩٩٠.

[٢٥] _ بەندیخانەی نوگرە سەلمانی بیابانێ قەلایەکی سەرسنوورە و ٤٥ کیلۆ مەتر لە شاری سەماوەی دوورە، کلۆپ پاشای سەرکردەی بەریتانی بنیاتی ناوە تا ببێتە بنکەیەکی ئێشکگری سەرسنووری ڕێ لە ئیخوانی "وەهابی" بگرێ و نەتوانن هێرش بکەنە سەر عێراق.ساڵی ١٩٤٩ حکوومەتی عێراق نۆژەن کردەوە تا ببێتە جێی شیوعییەکان، نەخاسمە دوای ئەو پەیوەندیانەی فەهدی سکرتێری حیزب لە بەندیخانەی بەغدا لەگەڵ کادیرەکانی دەرەوەی هەبوو. بۆ زیاتر:حكمت خليل محمد "ابوناظم"، دور الحزب الشيوعي و الشيوعيين في الحركة الوطنية ١٩٥١ – ١٩٥٨، دار العباد، بغداد، ٢٠٠٧، ص٨.

ئەو ماوەیەی بەندیخانە قۆناغیکی گرنگی ژیانی ئەو شیوعییانە بوو کە لەبەر ئەو بیروباوەڕەی هەیانبوو سالانی گەنجییان لە بەندیخانەکان و لە راوەدوونانی پیاوانی ئاسایش بەسەربرد. ئێمە وەک شیوعی، چونکە زۆربەی کادیرە ڕۆشنبیرەکانیان لەناو بەندیخانەبوون، ئیدی بەپێی ئەو ڕێچکەیەی شیوعییەکان لە پێکهێنانی شانە و ئاڵقەی وانە و ڕوونکردنەوەی چەمکەکانی مارکسیزم - لینینیزم پەیڕەویان دەکرد، لە بەندیخانەدا خومان ڕێکخستەوە. لەناو بەندیخانەش کارەکان دابەشکران و هەندیک نانەواخانەکەیان بەڕێوەدەبرد و هەندێک قاوشەکانیان پاک دەکردەوە و ...تاد. وەک گوتیشم سالانی بەندیخانە ماوەیەکی فراوانی فێربوون بوو. وەک گوتم سەبارەت بە خوێندنەوەم، من لە ڕێی خوێندنەوەوە لە بەندیخانە فێری عارەبی بووم. هەرچیم کەوتە بەردەستی خوێندمەوە، بەتایبەت ڕۆمان و چیرۆک و هەر بابەتێکی دیکەی ئەدەبی، ئەوە سەرباری کتیبە سیاسییە هەمەجۆرەکان. چونکە من بە زمانی عارەبییش خەریکی سیاسەت بووم، ئیدی حەزم لە خویندنەوەی کتیبی سیاسی نییە بە زمانی کوردی، ئەگەرچی زۆربەی ئەو کتێبانەش لە زمانانی دیکەڕا کراونەتە کوردی.

## دابەشکردنی فەلەستین:

حیزبی شیوعی هەندێ هەڵوێستی هەیە کە پێچەوانەی فیکریی هەڵوێستەکانی پێشترییەتی بەرانبەر کێشەی فەلەستین[٢٦]، نەخاسمەکە لە دامەزراندنیڕا داوای ئەوەی دەکرد لایەنگیری عارەبی فەلەستین بین و هەر لەگەڵ دەستپێکردنی شەڕی یەکەمی جیهانییش دەیگوت دەبێ هێزی بەریتانیی داگیرکەر لە فەلەستین بچنە دەرێ، کەچی حیزب هەڵوێستەکانی گۆڕان و بەرانبەر بڕیاری دابەشکردنی فەلەستین لە ١٩٤٧ گەرموگوڕ بوو، ئەوەش بەپێی تێڕوانینی سۆڤیەتیی کە لایەنگیری دابەشکردن بوو و، وەبگرە حیزبی شیوعیی عێراقی دژی شەڕی عارەبی – ئیسرائیلی بوو لە ساڵی ١٩٤٨ و بە "شەڕی دۆڕاو"ی وەسفکرد.

جا کە ئەو پرسیارە لە عەزیز محەمەد کرا، بە ئەنجەتی تێکچڕژاویی بارودۆخی ئەوێ دەمێی دنیایە، خۆی لە وەڵامدانەوەی بوارد و، حیزبی شیوعیی عێراقییش لە ناوەڕاستی چلەکانی سەدەی بیستەم و دوای گیرانی سەرکردەکانی حیزب "فەهد –حازم –سارم" تووشی تەڵخی و تەمومژی سەرکردایەتی هات و، هەندێ سەرکردایەتیی حیزبیان گرتەدەست کە دۆخێکی ئەوتۆیان بۆ نەڕەخسا وەها مامەڵە لەگەڵ ڕووداوەکان بکەن وەک ئەوەی حیزبێکی سەقامگیری سیاسی و فیکری و ڕێکخراوەیی پێویستییەتی، جا

---

[٢٦] ـ بۆ زیاتر: سیف عدنان ارحیم، الحزب الشیوعي العراقي من اعدام فهد حتی ثورة ١٤ تموز ١٩٥٨، دار الحصاد، دمشق، ص٥٧-٥٨.

ئەو هەموو بارودۆخە بۆ حیزبی شـــیوعی نەهاتەپیش و، بگرە ڕۆژنامەی حیزبیش بە بەردەوامی دەرنەدەچوو و، لە دۆخێکی ناخۆش و بەردەوام گواســـتنەوەی چاپخانە و کەمیی ماددە و نووســـینی فیکریی لە ڕۆژنامەکەدا دەنووســران، جگە لەوانەی ناوەناوە لە ڕێی خانەوادەی بەندییەکانی بەندیخانەی کووتەوە لەلایەن ســـــەرکردایەتیی حیزبی نـاو بەنـدیخـانە دەنێردران. ســـــەرکردایەتیی ڕاســـــپێردراوی حیزبیش هەر بە دۆخێکی هەڵاوێردەدا تێپەڕی و، هـیـچ ئەوەی نەبوو ڕایەکی ڕوونی ســـەبارەت بە کێشـــەیەکی ئاڵۆزی وەک کێشـــەی فەلەســـتینی هەبێ.

ئەگەر بچینەوە سەر بابەتی دابەشکردنی فەلەستین و بابەتەکە بە سەرکردایەتیی حیزبەوە ببەستینەوە، کە پشتی بە نامیلکەی "لەژێر ڕۆشنایی کێشەی فەلەستین"[٢٧] بەستا و، ئەوەش باوەڕی هەندێ هێزی ســیاســیی فەرەنســا بوو و شــەریف ئەلشــێخ هێنابووی و ئەوجا بڕیاری دابەشکردنی پەسەند کرد، لەکاتێکدا پێش گەیشتنی نامیلکەکە حیزب بە توندی بڕیاری دابەشکردنی ڕەتدەکردەوە و ئەوەیشـــی لە ڕۆژنامەی حیزبدا نووســـی و هەندێ خۆپیشـــاندانیشـــی بۆ ناڕەزایی بەرانبەر بڕیارەکە

---

[٢٧] _ ڕاپۆرتەکە چواردە لاپەڕەی بچووک بووە و لێینووســـراوە "بەیاننامەی لیژنەی دیموکراتیی عەرەبیی پاریســـمان بەدەســـت گەیشـــتووە، وەک خۆی بڵاویدەکەینەوە چونکە لەگەڵ سیاسـەتی حیزبی شـیوعی دەگونجێ و بۆ بەرچاوڕوونیی ڕای گشتیمان ســـەبارەت بەو کێشـــە گرنگەی ئیســـتیعمار و بەکرێگیراوە کۆنەپەرســـتەکانی و [illegible] حیزبانەی لایەنگریـانن دەیـانەوێ لە ڕێی لادەن و بۆ کەوەڕیکردنی ڕای گشتیمان [illegible] ڕاستییەکان ساختە بکەن تا بە ئاسانی پیلانەکانی ئیستیعماران جێبەجێ بکەن [illegible] الحزب الشیوعی العراقي ، ضوء على القضية الفلسطينية، مطبعة القاعدة، بغداد، ١٩٤٨

ڕێکخســـت، بگرە ســـەرکردایەتیی حیزبیش لە بەندیخانە هیچ ڕێنمایەکیان ســـەبارەت بە بابەتی فەلەســـتین دەرنەکرد، هێندە نەبێ هەر بڕیـارێکی لە هێزە ئیمپریـالییەکـانەوە دەرچێ، کە بـابەتی دامەزرانـدنی دەوڵەتێکی یەهوودیی لە فەلەســـتین لە بەرنامەدابوو، دەبێ ڕەتبکرێتەوە.

حیزبی شــیوعی، پێش ئەوەی بە بڕیاری دابەشــکردن ڕازیبێ، چارەسەرێکی بۆ کێشەکە خستە بەردەست بەوەی دەوڵەتێکی دیموکراتیی سەربەخۆ دابمەزرێ و عارەب و جوولەکە پێکەوە، دوور لە بڕیـاری دابەشـــکردن و دامەزرانـدنی دەوڵەتێکی فەلەستینی و دەوڵەتێکی یەهوودی، تێیدا بژین. لەبەر ئەوە ئێمە داوای دابەشکردنمان نەکردووە و پشتمان نەگرتووە، دواترێ هەندێ گۆڕانکاری ڕوویاندا و هەڵوێستمان بووە ئەوەی خەبات بۆ دامەزرانــدنی دەوڵەتێکی فەلەســـتینی بەتەک دەوڵەتی ئیســـرائیلەوە بکرێ و، ئەو دابەشـــکردنەی حیزبی شـــیوعیی عێراقی پەیڕەوی کرد ئەوەبوو و، دواتریش فەلەســتینییەکانیش خۆیـان ئەوەیـان پەیڕەو کرد و تـا ئیســـتـاش داوای دەوڵەتی خۆیان دەکەن.

ڕای دروستی حیزبیش سەبارەت بە فەلەستین ئەوەیە، چونکە دیتی هێزە ئیســـتیعمارییەکان پشـــتگیریی ئیســـرائل و ڕژێمە عارەبییەکانیش دەکەن، هاوپەیمانیی هێزە عارەبییەکانیش یەک لەو هۆیانەبوو کە مافەکانی گەلی فەلەســـتینی بەفیڕۆ دا، بگرە وایکرد ئیسـرائیل ئەو خاکانەش داگیر بکا کە پێش دابەشـکردن بەدەست فەلەستینییەکانەوە بوو و دوای دابەشکردنێش کە تای تەرازووی هێز لە بەرژەوەندیی ئیســـرائیلییەکان گۆڕا، ئیدی

ئەوان لەبەر نەگۆڕیی هەڵویستی ڕژێمە عارەبییە کۆنەپەرستەکانی لەوەش پتر دەستبەرداری خاکی فەلەستین بوون کە پێشبینی دەکرا، ئیدی ئیسرائیلییەکان ئەوەندەیان خاک دەستکەوت کە لەوەی پێشبینییان دەکرد پتریش بوو.
ئەوە هێ لەوەی من تاقیکردنەوەیەکی ئەوتۆی حیزبیم نەبوو وابکا تان و پۆی بابەتەکە بزانم و، بگرە ئەو دەمای زمانی عارەبیشم بەباشی نەدەزانی و، مالک سەیفی بەرپرسی ئەودەمیی حیزب و یەهودا سدیق لە ملەیەکی نیمچە بەردەوامدا بوون لە سەر سەرکردایەتیی ڕێکخستنەکانی حیزب و، ئەوەش ناڕوونییەکی گەورەی بە باری ناوخۆی حیزب بەخشیبوو.
دوای دەستگیرکرانێ، هەڵوێستی حیزب ببووە تەوەری گفتوگۆمان و، نایشارمەوە کە ئەوە وایکرد بەرانبەر ئەوەی ڕوویدا وریا و بە پرسیار بم و، نایشیشارمەوە کە پاشان سەبارەت بە هەڵویستی حیزب بەرانبەر فەلەستین شتم خوێندەوە و دیتم حیزب بێ هەدادان خەباتی کردووە بۆ پشتیوانی و جەنگی کێشەکەی بە هیی خۆی زانیوە و، ئەوەش گومانی لە ناخمدا ڕەواندەوە.
دوای شەڕی ١٩٦٧ و، ئەو کاتەی من سکرتێری حیزبی شیوعیی عێراقی بووم، حیزبی شیوعی بە هاوکاریی حیزبە شیوعییە عارەبییەکان چووە ڕیزی ئەو بەرەیەی ناومان لێنابوو پشتیوانی تا شان بە شانی دەستەکانی بەرگریی فەلەستینی دژی هێزە داگیرکەرەکانی ئیسرائیلی بجەنگن و،

ئەودەمای یەکێتیی سۆڤیەتیش هەبوو و لە شەڕی ١٩٦٧ لایەنگری دەوڵەتە عارەبییەکان بوو[٢٨]

گەلێ پرسیار سەبارەت بەو جوولەکانە دەکرێ کە لە ڕیزەکانی حیزبی شیوعیی عێراقیدابوون داخوا چ ڕۆڵێکیان لە رازیبوون بە بڕیاری دابەشکردن هەبووە و، زۆربەیان باوەڕیان بە بیروباوەڕی زایۆنیی هەبووە و ئەوانیش بڕیارەکەی دابەشکردنیان تێپەراند، لەوانەش یەهودا سدیق و ئیبراهیم شائوولی کادیری حیزبی شیوعیی بەرپرسی چاپخانەی حیزب بوو.[٢٩]

حیزبی شیوعیی عێراقییش، دوای دەستگیرکردنی سەرکردە لێوەشاوەکانی، تووشی بەلابوو. هەر ئەوەش بوو وایکرد لە بڕیاری چارەنووسسازدا بشڵەژێ و پەلان بکوتێ، بەڵام بەستانەوەی هەڵوێستی حیزب بە یەهوودییە شیوعییەکانەوە بەڕاست نازانم. باشە چۆن تاوانی خیانەت بدەینە پاڵ ئەوانە لەکاتێکدا ئەوان بە هەموو توانایەک خۆیان بۆ کاروانی حیزبی شیوعیی عێراقی تەرخان کرد، خۆ ئەگەر هەندێک لەوانەی تۆمەتی زایۆنیبوونیشیان ئاڕاستەکرابوو دزەیان کردبێتە ناو حیزب کاریگەرییان لەسەر بڕیارەکانی حیزب نەبووە، بگرە یەکەم شەهیدی حیزبیش یەهوودییەک بوو و ناوی شائوول توێق بوو.[٣٠]

---

[٢٨] _ دیدارێک لەگەڵ عەزیز محەمەد ٢٠١٤/٤/٢٣.

[٢٩] _ مالک سیف، تجربتي في الحزب الشيوعي، دار القائع بيروت، ١٩٧٤، ص ٦٤.

[٣٠] _ دیدارێک لەگەڵ عەزیز محەمەد ٢٠١٤/٤/٢٣.

# لە سێدارەدانی فەهد و بەندیخانەی نوگرە سەلمان:

کە لە ١٩٤٩، هاوڕێیان یوسف سەلمان یوسف"فەهد" و زەکی بەسیم و حوسێن شبیبی لەسێدارەدران، ئێمە زیانێکی گەورەمان لێکەوت. ئاخر سەرباری ئەوەی ئەوانە سەرکردەی زیرەک بوون و شارەزاییەکی دەوڵەمەندیان هەبوو و پێگەیەکی گەورەیان لە دەروونی ئێمەدا هەبوو، بەشی هەرە زۆری کادیرەکانی حیزبیش لە بەندیخانە بوون. کادیرەکانی ڕیزی دووەم یان سێیەم لەدەرەوەی بەندیخانە بوون و، جا بەبێ کۆبوونەوە و هەڵبژاردن دەستپێشخەریی پێکهێنانی سەرکردایەتیی حیزبیان دەکرد و هەر خێراش دەگیران. دوای لەداردانی فەهد و هاوڕێیەکانی، چونکە فەهد لەناو بەندیخانەکەیەوە پەیوەندیی بە کادیرەکانی دەرەوەی بەندیخانەوە هەبوو، ئیدی حکوومەت بڕیاری دا بەندییە شیوعییەکان بگوازێتەوە بۆ بەندیخانەی نوگرە سەلمانی سنووری و، لەبەر ڕاکردنێش بە کۆتوبەندییان بردین و، سەلام عادلیشمان لەگەڵ بوو و دووساڵی لە بەندیخانە بەسەربرد و لە ١٩٥٢ بەردرا، هەر لەوێ، زەکی خەیری و محەمەد ئەبولعیس و عومەر عەلی ئەلشێخ و عەزیز ئەلحاج و خەڵکی دیکەشمان لەگەڵ بوون، جا هەواڵەکانی حیزبمان دەگەیشتی و بەهادین نوری لە ١٩٤٩ لیژنەی مەرکەزیی پێکهێنا و، لە ١٩٥٣ گیرا و بەندیی تاهەتایی بۆ بڕایەوە. سەرباری ئەو بارودۆخە تۆقێنەرە ناخۆشەش، حیزب توانیی لە کاری خۆیدا بەردەوام بێ و وەک

هێزێکی شـــکۆداری ناو هێزەکانی بزووتنەوەی نیشـــتمانیی عێراق بێتەوە ناو گۆڕەپانەکە. جا بزووتنەوەکەی موسـەدەق و خۆماڵیکردنی نەوتی ئێران لە بەراییەکانی پەنجاکانی ســـەدەی بیست و شۆڕشی یۆلیۆی ساڵی ١٩٥٢ی میسر و هەڵکشانی بزاوتی ئاشـــتیی جیهانی و ســـەرکەوتنەکانی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی نیشتمانی و بزووتنەوەی شۆڕشگێڕی کریکاری، هاریکاری ئەو هاتنەوەیەی حیزب بوون.

# جیابوونەوەی "راية الشغيلة" لە ساڵی ١٩٥٣،

سـەربـاری سـالانی بەندیی بەندیخانە، کەچی پەیوەندیی ڕێکخستنی حیزبیی ناو بەندیخانە تا رادەیەک لە ڕێی خانەوادەی بەندییەکانەوە هەر مابوو، کە هەواڵی حیزبیان بۆ دەهێناین و پێیان دەگوتین چ فیکر و بیروڕایەکی تێدا دەگەڕێ، نەخاسـمە دوای ئەوەی بەهادین نوری[٣١] ببووە سـکرتێری حیزبی شـیوعی. ئیدی هەندێ بیروڕا سـەرئاو کەوتبوون کە بەندییەکانی دوای راپەڕینی ١٩٥٢ پێیانڕاگەیاندین. سـەرکردایەتیی بەهادین نوری بیرۆکەی ڕووخاندنی ڕژێم و مافی جیابوونەوەی گەلی کوردی خستبووە ڕوو[٣٢] کە ئەوەش لە پەیماننامەی نیشتمانیی ساڵی ١٩٤٥ی حیزبدا نەبوو. ئەوەش وایکرد لەناو بەندیخانەی ناوەندیی بەغدایڕا نامەیەک بۆ بەهادین نوری بنێرین کە ئیمزای پیتی "م"ی لەسـەربوو و، ئەوەش پیتی یەکەمی ناوە حیزبییەکەمە - موخلیس. لە نامەکەدا هاتبوو کە حیزب زۆر بەلای هاسانکاری و نیانیدایە. وەک لە سیستەمی ناوخۆشدا هاتووە، ئەو نامەیە مافێکە لە مافەکانی ئەندامی حیزبی تا تێبینیی خۆی بخاتەڕوو. ڕای

[٣١] _ بەهادین نوری لە ١٩٢٧ لە شاری سلێمانی و لە خانەوادەیەکی جوتیاری دینداری خۆشگوزەران لەدایک بووە . خوێندنی دواناوەندیی خوێندووە، لە ١٩٤٤ چووەتە ریزی حیزبی شیوعیی عێراقی، لە ١٩٤٩-١٩٥٣ بووەتە سکرتێری حیزب، لە نیسانی ١٩٥٣ دەگیرێ و لە ١٩٥٨-١٩٦١بووەتە ئەندامی مەکتەبی سیاسی، لە ١٩٦٤ تا نەوەتەکان ئەندامی لیژنەی مەرکەزی بووە. بۆ زیاتر: حنا بطاطو الكتاب الثاني، ص٢٢٣.

[٣٢] _ جعفر عباس حميدي ، التطورات السياسية في العراق ١٩٤١-١٩٥٣. مطبعة النعمان، النجف، ١٩٧٦، ص٣٩٦.

ئێمەش ئەوەبوو داوای تێکۆشـان بۆ پێشـخسـتنی سـیسـتەمی پاشـــایەتی بکرێ و بەرەو دیموکراتییەت ببردرێ. بەڵام هەر دوای نـاردنی نـامەکە لەهیکڕا دیتمـان بڕیـاری لە حیزب دەرکردنمـان دەرچووە و، لە ســەر لاپەڕەکانی ڕۆژنـامەی "القاعدة" و بە پەتک پســاندن و بە شــێوازێکی بژاردەیی سووکایەتیمان پێ دەکرا و ناویان دەزراندین و ملەمان لەگەڵدا دەکرا. ئێمە ئـامـانجمـان یەککگرتوویی حیزب بوو، [33] بەڵام بەهادین نوری و بە دانپێدانانی خۆی، بێ ئەوەی بواری گفتوگۆ بدا، پەنای بۆ چەقۆی لەتکردن برد و[34]، دوای دەرکردنمان، کە هەســتمان کرد ســەرکردایەتیی حیزب غەدری لێ کردووین، ڕێکخراوێکمان پێکهێنا. ڕۆژنامەیەکمان بە ناوی"راية الشــغيلة" دەرکرد. جا ڕێکخراوەکەش ئەو ناوەی لێنرا، واتە بەرگریکارانی مافی کرێکاران و جووتیاران. ئێمە ئەو ڕێکخراوەمان، کە ناوی

---

[33] _ جاســم حەلوائی لە بیرەوەرییەکانیدا ئاماژە بۆ بارودۆخی جیابوونەوەی "راية الشــغيلة" دەکا، ئەو لەگەڵ عەزیز محەمەد لە بەندیخانەی باقووبەی لەیەک ژوور بەند بووە و دەڵێ: "عەزیز محەمەدی ماوەیەکی زۆر لەگەڵیدا لەیەک ژوور ژیام، قەتی خۆ لە وەلامی پرسـیارێک نەدەبوارد ئەگەر زانیاریی لەســەر هەبووایە، تەنیا ســەبارەت بە بارودۆخی جیابوونەوەی ڕێکخراوی "راية الشغيلة" نەبێ کە چەندی هەوڵمدا دنەی بدەم قســە لەســەر وردەکارییەکانی بکا، کەچی شـکسـتم خوارد و هەر ئەوەندەم لێی گوێ لێبوو"باوەڕبکە قەت بیرمان لە جیابوونەوە لە حیزب نەکردووەتەوە، نازانم ئەوە چۆن ڕوویدا" . بۆ زیاتر: جاســم الحلوائي الحقيقة كما عســتها، دار الرواد المزدهرة، ٢٠٠٦، بغداد، ص٥٥.

[34] _ بەهادین نوری باســی ئەوەی دەکا کە هەڵوێســتێکی بەپەلە و هەڵەی هەبووە و دەڵێ دەبوایە هێوربم و هەوڵدەم درزەکە پڕکەمەوە و بە هیچ لایەکیدا کێڵ نەکەمەوە و، ئەوەش لەو کاتیدا دەکرا، بەلام من پەنام بۆ چەقۆی لەتکردن برد، واتە دەرکردنی یەکسەریی ئەو دەستەیەی لە ڕیزەکانی حیزب جودابیوونەوە. بۆ زیاتر:بهاءالدين نوري، مذكرات، مطبعة جامعة صلاحالدين، السليمانية، ١٩٩٥، ص١٣٥.

جیابوونەوەی لێنرابوو، بەوەی دانا کە حیزب لەدەست سەرکردایەتییە لادەرەکەی دەردێنین. ئەو کردارەش بووە هۆی درزبردنی ڕیزەکانی حیزبی شیوعی و ڕێکخستنەکانی. بەشێکی زۆری ئەندامانی حیزبی شیوعی هاوسۆزی بیروڕایەکانی ئێمەبوون، نەخاسمە ئەندامەکانی ئەو ڕێکخراوە حیزبییانەی ڕایانگەیاند کە هاتوونەتە ناو ڕێکخراوی "رایة الشغیلة" چونکە ڕێوانی ڕاستەقینەی حیزبی شیوعییە. سەرکردایەتیی بەهادین نوریشمان بە لادەری ڕێوشوێنەکانی شیوعی دانا.[٣٥]

زۆریش ئاسایییە کە لە حاڵەتێکی ئاوادا مشتومڕی نێوان ئەو دوو کوتلە شیوعییە توندبێ و گفتوگۆ ببێتە جنێو و تۆمەتبارکردن، ئەگەرچی هەردوو کوتلەکەیش ناوی حیزبی شیوعیی عێراقیی لەسەر لاپەڕەکانی ڕۆژنامەکەی دانابوو و دەیگوت ئەو نوێنەری حیزبە. "القاعدة" لە ژمارە یەکی ساڵی یازدەیدا ، کە لە کۆتاییەکانی شوباتی ١٩٥٣ دەرچوو، نووسینێکی لەژێر ناونیشانی "حیزبی شیوعیمان ڕیزەکانی خۆی لە خەڵکە هەڵپەرست و تێکدەرەکان پاک دەکاتەوە". جا ئەو بێنە و بەردەیە ڕەهەندێکی گەورەتری وەرگرت و بووە سەرەتای بڕیاری دەرکردنمان لە حیزب. هەر خێراش ناومان لێندرا "رایة البلاط"، واتە ئاڵای دەرباری پاشایەتی، چونکە ئێمە چاکسازیی سیستەمی پاشایەتیمان بە پێویست دەزانی نەک رووخاندنی لەو بارودۆخە شلۆقەی مێژووی عێراق بە گشتی و حیزبی شیوعیی عێراقی بەتایبەتی.[٣٦]

---

٣٥ _ دیدارێکلەگەڵ عەزیز محەمەد ٢٠١٥/٥/٧.

٣٦ _ دیدارێک لەگەڵ عەزیز محەمەد ٥/٧ ٢٠١٥.

ڕێکخستنەکانی "رایة الشغیلة" بەرفراوان بوون، چونکە کادیرە حیزبییە ناسراوەکانی لە ڕیزەکانیدابوو و، لەوانەش جەمال حەیدەری و نافیع یونس و حەمزە سەلمان جبوری. بەهێزترین لقی ڕێکخراوەکەش لقی نەجەف بوو کە حوسێن سوڵتان سوبی و حیزام عەیال و نازم محەمەد و محەمەد سالح بەحرولعلوم بەڕێوەیان دەبرد، لە کووتیش، کە مامۆستا عەبدولخالق سەروەت نوێنەری کۆمەڵی "رایة الشغیلة"بوو و هەریەک لە موحسین علێوی و سەممان زاهی و کازم بەشیر کاریان لەگەڵ دەکرد و عەبدولڕەزاق سافییش لە بەغدا. چاپخانەکەی "رایة الشغیلة" لەماڵەکەی کادری شیوعی عەواد ڕەزا سەفار و خوشکەکەی بوو کە ناوی نەرجس ڕەزا سەفار بوو و لە گەڕەکی زۆیەی کەرادەی بوو. دواتریش خانەوادەکە چوونە خانوێکی دی لە گۆرەپانی حورییە و پاشانیش چوونە خانوێک لە تەل محەمەدی بەغداد جەدیدە.[٣٧]

دوای گیرانی بەهادین نوری لە ١٩٥٣، لیژنەی مەرکەزی لە کانوونی دووەمی ١٩٥٤کۆبوونەوەیەکی بە سەرکردایەتیی هاوڕێ کەریم ئەحمەد کرد و، بۆ یەکەم جاریش سەلام عادل تێیدا ئامادەبوو. لەو کۆبوونەوەیەدا دەست بە هەموارکردنەوەی ڕێچکەی سیاسی و ڕێکخراوەیی حیزب کرا. لەو کۆبوونەوەیەیدا بەڵگەنامەیەک لەژێر ناونیشانی "بەرەی خەباتی نیشتمانی دژی ئیستیعمار و شەڕ" دەرکرا، تێیدا هاتبوو: "ئەو ئایدیۆلۆژیا هەڵەیەی دەیگوت دەبێ سیاسەت لەبن دەستی

---

[٣٧] _ عبدالجبار حسن الجبوری ، المصدر السابق، ص١١٦.

ڕێکخستندا بێ وایکرد ململانێی بیروباوەڕی ناوخۆ وەلابندرێ و بنەمای سەرکردایەتیی بەکۆمەڵ لە جێبەجێکردندا هەلەرێ بکرێ. جا بە پەلْپ و بیانووی ئەوەی ببێتە هۆی دووبەرەکی و جیابوونەوە، هەموو ڕواڵەت و دیاردەیەکی ململانێی فیکریی ناوخۆ سەرکوت دەکرا، ئەوەش وایکرد ڕەخنەی زاتی نەمینی. جا بەسای ئەو بیرۆکراتییەشەوە لیبرالییەت و هەستی بەرپرسیاری نەمان و پابەندیی حیزبییش لەبەین چوو.[38] دەبێ ئاماژە بەوەش بکرێ کە ئەو ڕەخنەگرتنە لە سەرکردایەتیی پێشتری و لە هەڵەکانی کاردانەوەیەکی ئەرێنیی لای سەرکردەکانی "راية الشغيلة" دروستکرد، چونکە پێشتری ئاماژە بەو هەڵانە کران کە لەلایەن سەرکردایەتیی بەهادین نورییەوە بەرانبەری کرابوو. بەڵام دوای ڕاکردنی حەمید عوسمان لە بەندیخانە و وەرگرتنی سەرکردایەتیی حیزب، هەوڵی هەموارکردنەوەی سیاسەتی حیزب لەباربردرا.

حەمید عوسمانیش، سەرباری لەرزۆکیی بیروباوەڕی و پاشانیش چوونە ناو ڕیزی پارتی دیموکراتیی کوردستانی، هەر لەسەر ڕێچکەی ئەوەی پێش خۆی ڕۆیی و خەریکبوو جنێوی دەدا و تۆمەتی بۆ "راية الشغيلة" هەڵدەبەستا. دوای شۆڕشی ١٤ی تەممووزی ١٩٥٨ دیتم و پێمگوت دەبینم ئەوڕۆ لێرەی....ئەدی سبەینێ لە کوێ دەبی؟ وەلامەکەی ئەوەبوو کە حاڵی دنیا وایە.[39] بەڵام هەر ئەوەندەی حوسێن ئەحمەد ئەلڕەزی "سەلام عادل" سەرکردایەتیی حیزبی وەرگرت، ئیدی

---

[38] _ الحزب الشيوعي العراقي، وثائق الكونفرنس الثاني للحزب الشيوعي العراقي ١٩٥١

[39] _ دیدارێک لەگەڵ عەزیز محەمەد ٢٠١٥/٥/٧.

دەستی بە هەڵمەتێکی فراوانی ڕۆشنبیریی ناو ئەندامانی حیزب کرد تـا ئەو ڕێچکە دووبەرەکییە وەلانێ و حیزب یەکگرتوو بکاتەوە.[40]

ئەوەش وایکرد شـەپۆلی ڕەخنە لە یەکدیگرتن سـووک ببی و، دوایەش ڕیزەکانی حیزب لێکدرێنەوە و لە ١٩٥٦ یەکبخرێتەوە.[41] ئەوەی مایەی سـەرسـامییە، ئێمە لە کۆنگرە و میهرەجانەکاندا بە دوو شـاند بەشـداریمان دەکرد، شـاندێکی نوێنەری "راية الشـغيلة"بوو و شـاندێکیش نوێنەری دەسـتەی "القاعدة"بوون. بەڵام کە سـەلام عادل پەیوەندیی بە سـەرکردایەتیی "راية الشغيلة"کرد، کە جەمال حەیدەری بوو و پێشترێ لە بەندیخانە ڕایکردبوو، سـەلام عـادل بۆی دووپـاتکردبووەوە کە دەبێ سـنوورێک بۆ ئەو ئاڕاسـتەی جودابوونەوەیە دابندرێ. ئەوجا کێشمەکێشی نێوان هەردوولا بڕایەوە و یەکگرتوویی گەڕایەوە ناو ڕیزەکانی حیزبی شـیوعیی عێراقی. دەبێ ئاماژە بەوەش کرێ کە خالید بەگداشـی سـکرتێری حیزبی شـیوعیی سـوری، ڕۆڵی لە نزیککردنەوەی بۆچوون و یەکخسـتنەوەی هەردوو لایەندا هەبوو.[42]

---

[40] ـ جعفر عباس حميدي. المصدر السابق. ص ٣٩٧.

[41] ـ حیزب لە ١٩٥٦ بە سـەرکردایەتیی سـەلام عـادل توانی کوتلە جیاخوازەکان پاککاتەوە و ، کۆنفرانسـی دووەم لە ئەیلوولی ١٩٥٦دا بەسـترا. بۆ زیاتر: سـيف عدنان ارحيم القيسي، المصدر السابق، ص١٧٩.

[42] ـ دیدارێک لەگەڵ عەزیز محەمەد ٢٠١٤/٥/٢٢.

## ڕووداوەکانی بەندیخانەی کووت ۱۹۵۳:

هێشـــتا دوو مانگ بەســـەر ڕووداوەکانی بەندیخانەی بەغدادا تێنەپەڕیبوو ، "۱۸ی حوزەیرانی ۱۹۵۳"، کە کۆمەڵێ شـــیوعی بەدەســـتی هێزەکانی بەندیخانە کوژران، چونکە بەندییەکان ڕازی نەبوون بیانگوازنەوە بۆ بەندیخانەی باقووبە. ئەوجارەیان لاپەڕەیەکـی نـوێـی ڕووبەڕووبـوونەوەی نـێـوان بەنـدیـیە شـــیوعییەکان و هێزەکانی بەندیخانەی کووت دەســـتیپێکرد. بەنـدییەکـانی کووت لە تەمموزێ، لەبەر مـامەڵەی خراپی پۆلیسان بەرانبەریان دەستیان بە مانگرتنێ کرد.[٤٣]

عەزیز محەمەدی[٤٤] لە بەنـدیخـانەی کووت گیرابوو، وێنەیەکی دروســتتر لە ســەرچاوە مێژووییەکانمان دەداتێ، چونکە خۆی بەشــێک بووە لەو ڕووداوە و جا لە باســی ڕووداوەکە دەڵێ: گواســـترامەوە بەندیخانەی ناوەندیی بەغدا و، ئەوجا ڕەوانەی بەندیخانەی نوگرە ســـەلمانی بیابان کرام. دوای داواکاریی کەسـوکارەکانیان تا ڕۆلەکانیان بگوازنەوە جێی نزیکتر، چونکە گەیشتنە بەندیخانەی نوگرەسەلمان زۆر سەخت بوو، ئیدی لە ۱۹۵۳ گواســـترامەوە بەندیخانەی ناوەندیی کووت. ئەو کاتی لەبەر بـارودۆخی خراپی نـاو بەنـدیخـانەی نـاوەنـدیی بەغـدا دۆخەکە تەقیبووەوە و بەندییە شیوعییەکان لەگەڵ بەڕێوەبەریی

---

[٤٣] _ غائب طعمة فرمان، الحكم الاسـود في العراق، دار الفكر، بيروت، ١٩٥٧، ص٥٧ ١٥٨

[٤٤] _ ســـاڵی ١٩٥٣، زۆربەی شـــیووعییەکان و لەناویشـــیاندا عەزیز محەمەد، لە بەندیخانەی نوگرە سەلمانەوە گواسترانەوە بۆ بەندیخانەی کووت.

بەندیخانەکە ڕووبەرووی یەکدی ببوونەوە و ژمارەیەک شەهیدببوون ژمارەیەکیش بریندار. دۆخی بەندیخانەی کووتیش ئەوەندە لە هیی بەندیخانەی بەغدا جودا نەبوو؛ واتە ئەو مامەڵە خراپەی لەگەڵ بەندییە شیوعییەکان دەکرا، ئەگەرچی ئەوان بەندیی سیاسییش بوون. کۆمەڵێک بەندی ئەرزوحاڵێکیان دابووە بەڕێوەبەریی بەندیخانەکە و داوایان کردبوو مامەڵەی باشتریان لەگەڵ بکرێ، جا لەبەر ئەوە لە٢٧ی تەمووزی ١٩٥٣، دادگایەکی تایبەتی لە بەغداوە هاتبوو گەیشتەجێ و، جا لەجیاتیی ئەوەی گوێ لە سکاڵان بگرێ، تۆمەتی ئەوەی ئاراستەی شیوعییەکان کرد گوایە سروودی قەدەغەیان گوتووە و، منیش یەک لەو تۆمەتبارانە بووم و لەو داوایەیدا ناویان بە مەسعود محەمەد خوێندمەوە.[٤٥]
بەڕێوەبەریی بەندیخانە، هەر بەوەندەی ڕانەوەستا هەڕەشە لە بەندییەکان بکا، بەڵکو لەو گەرمای تەمووزی مرۆڤ پرووکێنەی ئاوی خواردنەوە و خواردن و کارەبای لەسەر بڕین. ئەوەش ناچاری کردین بیرێک لێدەین و هەموو بەندییەکانیش لە لێدانیدا بەشداربووین. بەڵام لەبەر شۆریی ئاوی بیرەکەی نەمانتوانی ئاوی خواردنەوەمان دەستکەوێ و هەوڵەکانمان شکستی هێنا.[٤٦] جا بەسای ئەو بارودۆخە و، لەبەر ئەو شەپۆلی ناڕەزاییەی دوای ڕووداوەکەی بەندیخانەی بەغدا وڵاتی گرتبووەوە، بەڕێوەبەریی بەندیخانە ویستی بەرەوڕووبوونەوەکەمان هێورکاتەوە. بەڵام بەندییەکان لەسەر

[٤٥] _ دیدارێک لەگەڵ عەزیز محەمەد ٢٠١٤/٤/٥.

[٤٦] _ غائب طعمة فرمان، المصدر السابق، ص٥٩.

مانگرتنەکەیان سووربوون و، مکوڕیش بوون هاوکاری بەڕێوەبەریی بەندیخانەی نەکەن. کەچی بەڕێوەبەریی بەندیخانە هەرخێرا هەڵوێستی گۆڕی. ئاخر سەرباری داواکاریی شیوعییەکانی داوایان دەکرد دوای ئەو داهێزرانە توندەی لەبەر بڕینی نان و ئاو تووشیان ببوو، کە هەتا دووی ئەیلوولی ١٩٥٣ بەردەوام بوو، گەمارۆی سەریان بشکێندرێ، کەچی بەڕێوەبەریی بەندیخانە بە ئەنجەتی گەڕان بە دوای چەکدا دەستی بە پشکنینی بەندیخانە کرد.[٤٧] جا دوای ئەو پشکنینەش، بەڕێوەبەریی بەندیخانە بانگی ژمارەیەک لە شیوعییەکانی کرد تا بیانگوازێتەوە بەندیخانەیەکی دیکە و، منیش لەناو لیستەکەیدابووم. لە ئەنجامی ڕەتکردنەوەی بڕیارەکەی، هێزی پۆلیس هێرشیان کردە سەر بەندییە شیوعییە بێ چەکەکانی نەیاندەتوانی بەرگری لە خۆیان بکەن. لە ئەنجامدا چەند شیوعییەک کوژران و چەندی دیکەش بریندداربوون. ئەوجا ئێمەیان گواستەوە بۆ بەندیخانەی ناوەندیی باقووبە.[٤٨]

---

[٤٧] _ حنا بطاطو، المصدر السابق، ص ٣٥٩-٣٦٠.

[٤٨] _ حنا بطاطو، الكتاب الثاني، ص٣٥٩ ٣٦٠.

## یەکخستنەوەی حیزبی شیوعی:

لەســـەر ئاســـتی حیزبیدا، کارەکە هەوڵێکی لێبڕاوانەی بەخۆوە دیت بۆ یەکخســـتنەوەی بزاوتی شـــیوعیی ســـاڵی ١٩٥٣ جیـابوونەوەیەکی بەخۆوە دیـت و، ئەنجـام دروســـتبوونی ڕێکخراوی "رایـة الشـــغیلـة" بوو و ڕێکخراوێکیش هەبوو کە پاشـماوەی حیزبی شـەعبی بەخۆوەگرتبوو و عەزیز شـەریفی کۆچکردوو ، کە کەســـایەتییەکی پێشـــکەوتنخوازی دیاربوو پێشـــڕەویـی دەکـردن. ئەو هەوڵە بەردەوامەی حـیـزب بە سەرکردایەتیی شەهید"سەلام عادل" حوسێن ئەحمەد ئەلڕەزی دای لە هاوینی ١٩٥٦ بەرەکەی یەکێتیی ڕێکخراوە شیوعییەکان بوو و، پێگەی حیزبی بەرزکردەوە و توانـای ئەوەی دایە بەهێزێکی مەزنترەوە بەرەی یەکێتیی نیشـتمانی دروسـت بکا. هەر بۆ نموونە، چـادرچیی خوالێخۆشـــبوو، ئەو بردەرانەی ســـەبارەت بە پێداویســـتیی بەرپاکردنی بەرەیەکی نیشـــتمانی قسەیان لەگەڵ دەکرد، لە وەڵامدا دەیگوت "جارێ ئێوە یەکگرن، پاشـان داوای بەرپاکردنی بەرە لەوانیدی بکەن ". جا لەوەشـدا مافی خۆی بوو وابڵێ[٤٩]

هەر دوای ئەو یەکگرتنەی لە ســـەر ئاســـتی بزاوتی شـــیوعیی عێراقی دەســـتەبەر بوو، لە پاییزی ١٩٥٦ ئەنجوومەنی حیزبیی دووەم بەسـترا و، ڕاپۆرتێکی سـیاسـیی گرنگ پەسـەند کرا، کە هاریکاری حیزب بوو تا لە هەموو بوارەکانی کارکردنی فیکری

---

[٤٩] _ دیدارێک لەگەڵ عەزیز محەمەد ٢٠١٥/٤/٢٢.

و سیاسی و ڕێکخراوەیی بەرەوپێش هەنگاو بنێ، بەتایبەت لە بواری دامەزراندنی "بەرەی یەکێتیی نیشتمانی"ی کە لە مارسی ١٩٥٧ و چەند مانگێک دوای پەرتەکردنی ئەنجوومەنی حیزبی، بەرپابوو.

ڕەنگە گرنگترین هۆکارەکانی هاریکاری بەرپابوونی "بەرەی یەکێتیی نیشتمانی"بوون، کە بووە بناغەی سیاسیی شۆڕشی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨و، بوونیشی هانی ئەفسەرەکانی دا تا ئەو هەنگاوە بە جورئەتە بنێن، ئەوا دەڵێم گرینگترین هۆکار، سەرهاری ئەوەی باسم کرد، ئەو ڕاپەڕینە بوو کە وڵات وەک پاڵپشتییەک بۆ میسری برا بەخۆیەوە دیت دژی هێرشی سێ قۆڵیی نامەردانەی پایزی ١٩٥٦ و ئەو سەرکوتکردنە خوێناوییەی لە دەیان شاری گەورە و شارۆچکان ڕووبەڕووی جەماوەر بووەوە، لەوانەش شاری "حەی"ی بە جەرگ، کە لەوێ دوو هاوڕێمان لەداردران و، ئەوانیش عەلی شێخ حمود و عەتا مەهدی ئەلدەباس بوون، کە شارەکە هەستابوو و رایگەیاندبوو پشتیوانی میسرە و، ڕیزەکانیشی تێکۆشەرانی هەموو ئاراستەیەکی سیاسیی دژە ئیمپریالیزمی تێدابوو.

جاسم حەلوائی ئاماژە بۆ ڕۆژەکانی دوادوایی عەزیز محەمەد دەکا لە بەندیخانەی باقووبەی، کە لەیەک ژووری بەندیخانە لەگەڵیدابووە و ، باسی ئەو بارودۆخە ناخۆشە دەکا کە تووشی شیوعییەکان بووە، لەوانەش بێ بەشییان لە کتێب و ڕۆژنامە و قەڵەم و کاغەز و پشکنینی ڕۆژانەی بە جنێو و ڕووشکێنی و سزای بەندیی تاکەکەسی. دۆخەکەش تا بەرپابوونی شۆڕشی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ بەردەوام بوو.[٥٠]

---

[٥٠] _ جاسم الحلوائي. الحقيقة كما عشتها، ص٥٩.

# شۆڕشی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨:

پێش سۆڕشی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨، هیچ حیزبێکی سیاسیی عێراقی هێندەی حیزبی شیوعیی عێراقی چەوسانەوەی بەخۆوە نەدیتووە. ئاخر گەورە پێشەوایەکانی ئەو حیزبە، کە بە نهێنی کاریان دەکرد، لەسێدارەدران و خرانە زیندانە تاریکەکانەوە، تەنێ ئەو سەرکردانەی ڕایانکردە دەرەوەی وڵات توانییان ڕای گشتیی دەرەوە لە سەردەمی پێشترێ هاندەن و، جەماوەریان لە دژ بورووژێنن و سۆزی جەماوەریش بەلای حیزبدا ڕاکێشن، ئەو خۆڕاگرییەی باوەڕی سەرکردە شیوعییەکان دژی سەردەمی کۆن نیشانیان دا، ئەو ئارامگرتنەی بەرانبەر بەلایان هەیانبوو، بووە جێی سەرسامیی جەماوەر و ململانێی ئەوانیان بەرانبەر سەردەمی کۆن بە نیشتمان پەروەرییەکی بێ خەوش و قارەمانێتییەکی بەڕاستی دانا. لە هەموو ئەوانەش گرنگتر، شیوعییەکان دووپاتیان دەکردەوە کە چالاکیی سیاسی و هەوڵی نیشتمانییان هیچی لە دڵسۆزیی لایەنگریی عێراق لە خەڵکی دی کەمتر نییە.[٥١]

جا کارەکە هەرچۆنێک بووبێ، شۆڕشی ١٤ی تەمووز بۆ هێزە نیشتمانییەکان گۆڕانێکی گەورەبوو، لەوانەش حیزبی شیوعیی عێراقیی کە ئەویش لەو قۆناغیدا لە خەفەیی سیاسییەوە چووە بواری چالاکیی ئاشکرا. حیزبی شیوعی،

---

٥١ _ مجید خدوری، العراق الجمهوري ١٩٥٨-١٩٦٨ "العهدين القاسمي و العارفي" منشورات الشريف الرضي، ١٩٩٠، ص١٦٥.

هەڵویستی پاڵپشتیی بۆ شۆڕش نیشاندا و، بووە بەرگریکاری لە ئامانج و ئاڕاستەکانی شۆڕش و، لای خۆیانەوە پیشوازییان لە شۆڕش کرد و لە ڕێی سەلام عادلی سکرتیرەوە برووسکەیەکی پشتگیرییان ئاڕاستەی شۆڕش کرد.[٥٢]
لەکاتی هەڵگیرسانی شۆڕش، ئێمە ماوەی بەندییەکەمان لە بەندیخانەی باقووبە بەسەردەبرد. ئاگاشمان لە وادەی ڕاستەقینەی هەڵگیرسانی نەبوو. دواتریش زانیم کە سەرکردەکانی دەرەوەی بەندیخانە ئاگایان لە وادە دیاریکراوەکەی هەبووە. لە بەرەبەیانی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨، کە دەنگی تەقە لە دەوروبەری بەندیخانە هات، کاتێکی کە لە هۆڵی بەندیخانە کۆببووینەوە پاسەوانەکان دەرگایان لەسەر داخستین. نیوەڕۆیەکەی هەواڵی شۆڕش و هەواڵی سەرکردەکانی شۆڕش و وێنەی عەبدولکەریم قاسم و عەبدولسەلام عارفی هەردوو سەرکردەی شۆڕشیشمان لە ڕێی پاسەوانەکانی بەندیخانەوە بەدەست گەیی. ئەوەش، دوای ئەوەی ترسی پشێوی کەوتنەوەی لەناو بەندیخانە لێ پەیدابوو، وای لە بەڕێوەبەری بەندیخانە کرد مل بۆ واقیعەکە بدا و، داوای لێکردین تا هەڵوێستەکە روون دەبێتەوە سیستەمی بەندیخانە نەشکێنین.[٥٣]
ڕاستییەکەی، پێش شۆڕش، حیزبەکەمان ژمارەیەکی ئەوەندە زۆری تێکۆشەر تێدا نەبوو. هەر تەنیا حیزبی کادیرانی قالبوو

---

[٥٢] _ عبدالفتاح علی البوتاني، العراق، دراسة في التطورات السياسية الداخلية ١٤ تموز١٩٥٨ – ٨ شباط ١٩٦٣. دار الزمان، دمشق، ص١١٠.
[٥٣] _ دیدارێک لەگەڵ عەزیز محەمەد ٢٠١٥/٤/٢٢.

بوو و ژمارەی ئەندامەکانی لە هەزار کەس تێنەدەپەڕی. بەڵام لە ڕێی زۆر شـــێوەی ڕێکخســـتن و یەکێتی و ســـەندیکا و کۆمەڵەکانەوە و، جۆری دیکەی ڕێکخســتنی جەماوەریی حیزب و بزووتنەوە نیشـــتمـانییەکـان، لە مەودای جودا و لە ڕێی ئامادەکردنی بەرفراوانی توێژە کۆمەڵایەتییە پەیوەندیدارەکانەوە ســـەپاندبووی، پەیوەندییەکی پتەوی بە جەماوەرەوە هەبوو. شـــوێنەواری ئەوەش بە روونی لە ســـەرکەوتنی شـــۆڕشـــدا بەدیارکەوت.[٥٤]

وەک هەنگاوێکی نیازپاکیی سـەرکردەکانی شـۆڕشیش، هەموو ئەو بەندییە شـــیوعییانە بەردران کە چەندین ســـاڵ بوو بە تۆمەتی شـــیوعیبوون لە بەندیخانەکاندابوون و، منیش یەک لەوانە بووم کە لە ئابی ١٩٥٨ بەردرام. چونکە یەک لە کادیرە کۆنەکـانی حیزبیش بووم، ئیـدی قۆنـاغێکی نوێ لە ژیـانی سـیاسـیم دەسـتی پێکرد. لە کۆبوونەوەیەکی فراوانی لیژنەی مەرکەزی و کادیرە پێشکەوتووەکانی حیزبی شیوعیی عێراقیی لە ئەیلوولی ١٩٥٨دا کرا، لیژنەی مەرکەزی هەڵبژێردرا، بە زیادکردنی چەندین کادیری ســـەرکردایەتییش فروان کرا و، بابەتی شـۆڕش تاوتوێ کرا و وەها وەسـفی کرا کە شـۆڕش "دەسەلاتێکی بۆرژوای نیشتمانیی شۆڕشگێڕە"[٥٥] .ئیدی بوومە ئەندامی ئەو لیژنەیە و ئەندامی لیژنەی لقی کوردســـتانیش. لە ئەیلوولی ١٩٦٠لیژنەی مەرکەزی کۆبوونەوەیەکی فراوانی کرد

---

[٥٤] _ دیدارێک لەگەڵ عەزیز محەمەد ٢٠١٥/٤/٢٣.

[٥٥] _ سمیر عبدالکریم، اضواء علی الحرکة الشیعیة، ٥اجزاء، دار المرصاد، بیروت، ج ٢، ص ١٣.

کە لەوەتی ســـاڵی ١٩٥٦ بە گەورەترین کۆبوونەوەی لیژنەی مەرکەزیی مێژووی حیزبی شـــوعی دادەنـدرێ.[56] جـا عەزیز محەمەد ســەبارەت بەو کۆبوونەوە فراوانە ئاماژە بەوەی دەکا بووەتە بەرپرسی لقی کوردستانی حیزبی شیوعیی عیراقی و، لقەکەیش هەرســێ پارێزگای هەولێر و سـلێمانی و کەرکووکی دەگرتەوە.[57] کە پرسیاری ئەوەیشم لێکرد داخوا بەرپرسیاریی لقی کوردســتانی هەڵقولاوی چوونەوەســەر نەتەوەکەیەتی، ئەو لێپێچینەوەیی بە شــتێکی ســەیردانا، چونکە حیزبی شـیوعیی عێراقی حیزبێکی نێونەتەوەییە و هەموو نەتەوەکـان لەخۆ دەگرێ. گوتی من لەبەر شـــارەزاییم لە ناوچەکە و ناســـینی خەڵکەکەی بوومە بەرپرس.[58]

لە باســی ئامانجەکانی حیزبی شـیوعیی عێراقیی منیش باوەڕم پێی هەبووە، پێویستیی جێبەجێکردنی سۆشیالیزمی بووە دوای ئەو گۆڕانکـارییە نوێیـانە، دەبێ ئـامـاژەش بەوەی بکرێ

---

[56] _ مدیریة الامن العامن، الحرکة الشـــیوحیة في العراق، ١٩٥٨ – ١٩٦٣، جزآین، بغداد، ١٩٦٦، ج ٢، ص ٢٣.

[57] _ لیژنەی لقی کوردســتانیش لیژنە ناوخۆییەکانی هەرسێ لیوای سلێمانی و هەولێر و کەرکووکی لەخۆدەگرت و لە بەراییەکانی ١٩٦٠دا بەرپرســـەکەی کەریم ئەحمەد داود بوو و دواتری عەزیز محەمەد بووە بەرپرس و دابەش دەکرا بۆ:

١_ موسلیح مستەفا، بەرپرسی لیژنەی ناوخۆی کەرکووک.

٢_ رەئووف قادر، بەرپرسی لیژنەی لیوای سلێمانی.

٣_ یوســـف حنا حکمت، بەرپرســـی لیژنەی ناوخۆی هەولێر. بۆ زیاتر: مدیریة الامن العامة، الحرکة الشیوعیة. ص ٦٦.

[58] _ عەزیز محەمەد پێشـــترێ لە دیـدارێکی لە ٢٠١٥/٥/٢٢ ئـاماژەی بەوەی کرد سـەرباری سـارەزایی لە دیمۆگرافیای ناوچەکە پێشتریش بەرپرسی لقی حیزب بووە لە ناوچەی هەولێرێ.

پابەندبوون بە دروشمی سۆشیالیستییەوە مانای وانییە دەبێ لە کاتێکی دیاریکراویش جێبەجێ بکرێ. ئێمە وەک کەسایەتییەکی نیشتمانی مامەڵەمان لەگەڵ عەبدولکەریم قاسم کرد و، ئەگەرچی ئێمە هێزی سەرەکی بووین کە پشتیوانیمان بۆ عەبدولکەریم قاسمی دابین کردبوو بانگەشەی بنیاتنانی دەمودەستی سۆشیالیستیمان نەکرد. جا سەرباری هەڵوێستی نارازیی ناو حیزبی شیوعیی نارازی لە شێوازی فەرمانڕەوایی عەبدولکەریم قاسم[٥٩] و لەو نارازییانەش خودی سەلام عادل[٦٠]، کەچی کە لێیشی دابڕاین بەردەوام بەرگریمان لە کۆمار دەکرد[٦١].

لە سایەی چەشەی چالاکیی ئاشکرایدا، حیزبی شیوعی، لە شارەکانی عێراق و لەژێر ناوی "میهرەجانی ئاشتی"، دەستی بە گێڕانی چەندین میهرەجان و چالاکیی حیزبی کرد و، لایەنگریی خۆی بۆ عەبدولکەریم قاسم دەردەبڕی. دوای

---

٥٩ _ حیزبی شیوعیی عێراقی، لەسەرەتای پەنجایەکانڕا خەریکبوو لە ناڕوونیی بارودۆخی سیاسی و ئابووریی عێراقی دەکۆڵییەوە، جا سەلام عادل لای خۆیەوە ئەوەی وا دانا کە هەندێ لایەنی سیاسیی گشتی بۆ هەندێ کەس ناڕوون و ئاڵۆزە و داوای ئەوەی دەکرد سیاسەتێکی بەرەی نیشتمانی هەبێ، چونکە تاکە ڕێگەی پاراستنی کۆماری عێراقە. سلام عادل . سیاسة و مواقف الحزب الشیوعي العراقي في سبیل انجاز مرحلتنا التحرریة الدیمقراطیة .مطبعة الاداب، النجف، ١٩٥٩، ص ٥ – ٢٠.

٦٠ _ دیدارێک لەگەڵعەزیز محەمەد ٢٠١٥/٤/٢٢.

٦١ _ جەرجیس فەتحوڵلای پارێزەر ئاماژە بەوەی دەکا کە باوەڕی شیوعییەکان بە عەبدولکەریم قاسمی بۆ ئەوەی دەگەڕایەوە ڕژێمەکەی قاسم دژی ئیمپریالیزم بوو، ئەونەیاری یەکێتی بوو لەگەڵ میسر، سەرباری ئەوەیش ڕژێمی حوکمەکەی ، بەراورد بە حوکمی کوتلەی قەومییەکان باشترینی هەردوو خراپان بوو.بۆ زیاتر: اوربل دان، ترجمة جرجیس فتح الله ، العراق في عهد قاسم ١٩٥٨- ١٩٦٣، دار نبز للطباعم و النشر، السوید، ١٩٨٩. ص١٢١-١٢٢.

ئەوەی قەومییەکانی لێ تەکینەوە، حیزبی شیوعی بووە ئەو هێزەی عەبدولکەریم قاسم پشتی پێ دەبەستا[٦٢]. موسلیش لە بازنەی چالاکییەکانی گێڕانی میهرەجانی لایەنگرانی ئاشتییان بوو. جا شیوعییەکان بێ ئەوەی شێواز و سروشتی ئایینی و قەومیی محافیزکاری شارەکە و سنووردارییی دەسەلاتی حیزب لەو شارەدا لەبەرچاو بگرن، خەریکبوون خۆیان بۆ ئاهەنگەکە ئامادە دەکرد. بەڵام پێدەچوو هەوڵی ئەوەی بێ هێزی نادیاری حیزبی پاڵپشتیکراوی قاسم دەرخەن. پێیشموانییە پێویست بووبی هەوڵی ئەوەی بدەن ئەو ئاهەنگە لەوێ بگێڕن، بەتایبەت لە سایەی ئەو بارە گرژییەی ناوچەکە بەخۆیەوە دەدیت و، دواتریێ بووە هۆی تەقینەوەی بارودۆخەکە.[٦٣] حکوومەتیش، سەرباری ئەوەی دەیزانی لەهەر چرکەیەکدا ئەگەری تەقینەوەی دۆخەکە لە ئارادایە، کەچی بە ڕێپێدانی گەیشتنەجێی بەشدارانی ئاهەنگەکە و ئامادەکردنی کەرەستەی گواستنەوە و دابینکردنی شەمەندەفەر بۆ گەیاندنیان، بەشداریی لە تەقینەوەی بارودۆخەکەدا کرد. جا کە عەبدولوەهاب شەواف بزاوتە کودەتاییەکەی خۆی لە ئازاری ١٩٥٩ بەرپاکرد، ئەو ئەگەرە بووە راستی و، لە موسڵ بوونی شیوعییەکانی کردە بیانووی کودەتایەکەی بەو ئەنجەتەی شیوعییەکان دەستیان بەسەر هەموو جومگەکانی دەوڵەتدا گرتووە و، ئیدی بۆ ئەوەی لەدەستیان ڕزگاربن دەبێ هێز بەکاربێنن. ئیدی دوای ئەوە

---

[٦٢] _ سمير عبدلكريم، المصدر السابق، ص ٦٥.

[٦٣] _ جاسم المطير، مواقف بين عبدالكريم قاسم و الحزب الشيوعي، امل الجديدة ...، ص١٢-١٣.

هەردوو لا، لە ڕێی کوشـــتار و ڕاکێشـــانی تەرمی یەکدی، خەریکبوون جامی توورەیی خۆیان بەســـەر یەکدیدا بەتاڵ دەکرد، کە حیزب دواتریش بە توندی ڕەخنەی لەو کارە گرت و گوتی لە باوەڕی حیزب دوورە.[٦٤]

ئەوەش، ڕەسـید ڕوشـدیی بەرپرسـی ناوخۆی موسـڵی کاتی ڕووداوەکانی شـــەواف دووپاتیکردەوە و، ئاماژەی بەو تەرم ڕاکێشـــان و کوشـــتنەی کرد کە دوای شـــکســـتی بزاوتەکەی شـــەواف ڕوویاندا "ســـەرباری ئەوەش ڕەخنەی ئەوەمان لێ دەگرن گوایە دادگایەکی قەســـابیمان لە موســـڵ دامەزراندووە، جا هەر خێرا دەڵێم کوشـــتنی حەقدەکەس لە ســـنجاری و کەشـــموولەیی و خەڵکی دیی لەو ڕووداوانە کوژران، کە پییدەڵێن دەمەلماجە، لە ڕۆژی ١٤ی ئازاردا ڕوویانـدا، هیچ پاســـاوێکیان نییە و گەورەترین هەڵەیە کە بەرگریی میللی و ســـەرکردەکانی کردوویانە و ئەوە کارێکی شـــەرمەزارکراو و ڕەتکراوەیە. فەرمانەکانی حیزبیش لە پەیوەندییەکی تەلەفۆنیی نێوان جەمال حەیدەریی ئەندامی مەکتەبی ســیاســی و حەمزە ســـەلمانی نێردراوی حیزب بۆ مووســـڵ دران و، یەکەمیان بەوەی دیکەی گوت "ســـەران بپەڕێنن" و حەمزە ســـەلمانیش پێیوابوو ئەوانە سەری پیلانگێڕی بوون.[٦٥]

---

[٦٤] _ عبدالفتاح علي البوتاني، المصدر السابق، ص ٢٠٩.

[٦٥] - رشيد رشدي، منعطفات خطيرة في تاريخ الشعب العراقي "اطلالة تاريخية" سانت بطرسبورج، روسيا ٢٠١٣، ص١٥٦.

# خۆپیشاندانی یەکی ئایاری ١٩٥٩ و داوای بەشداریکردن لە دەسەڵات،

لە یەکی ئایار، حیزبی شیوعیی عێراقی ئاهەنگێکی جەماوەریی ئەوتۆی ڕێکخست کە لە مێژووی خۆیدا کۆبوونەوەیەکی جەماوەریی ئاوای بە خۆوە نەدیبوو. ژمارەی بەشدارانی ڕێپێوانەکە بە ملیۆنێک کەس دەخەمڵێندرا. ئەوەش بۆ ئەوەی بوو دەریبڕی کە نوێنەری چینی کرێکاری عێراقییە و، لە هەمان کاتیشدا نیشاندانێکی شارستانییانەی هێزی ئەو حیزبەیە کە دەستی خۆی گەیاندووەتە هەموو جومگەکانی ڕێکخراوە پیشەییەکان. بۆنەکەیش چینی کرێکار و جووتیارانی کۆکردەوە. سەرکردەکانی حیزبی شیوعییش لە بەرایی ئاهەنگەکەیدا بوون. ئەوجا بەشدارانی ڕێپێوانەکە دەستیان بە گوتنەوەی ئەو هوتافەکرد: "عاش زعیمي عبدالکریمي.....حزب الشیوعي بالحکم مطلب عظیمي"[٦٦] لە کەرکووکیش ڕێپێوانمان کرد کە حیزب بۆ شکۆی هەمان بۆنە ڕێکی خستبوو، بەڵام ئەو دروشمەمان بەرز نەکردەوە. بەڵام ئەو دروشمە، بێ ئەوەی سەرکردەکانی حیزب تاوتوێیان کردبێ، لە بەغدا بەرزکرایەوە. سەرباری ئەوەی زۆربەی هەرەزۆری سەرکردەکانی حیزب لەوێبوون و سەلام عادلیش لە نزیک شوێنی خۆپیشاندانەکە بوو، کەچی سەرکردەکانی حیزب ڕێیان لە بەرزکردنەوی ئەو دروشمە نەگرت. پێشوەختە خۆیان بۆ ئەو هوتافە ئامادە نەکردبوو.

---

[٦٦] _ اوربل دان، المصدر السابق، ص٢٦٤.

ئەوەش بەڵگەی ئەوەیە وەک ئەوە نەبوو وەک باسـیان دەکرد و پێشـتریش نەخرابووە ڕوو و لە خۆپیشـاندانەکەی کەرکووکی حیزبی شـیوعیی عێراقی ئێمە ئەو دروشـمەمان بەرز نەکردەوە و داواشمان نەکرد.[٦٧]

داواکـاریی بەشـداریکردنی دەسـەڵاتی حیزبی شـیوعی، دەگەڕێتەوە بۆ گەشەکردنی هێزی ئەو حیزبە لەسەر گۆڕەپانی عێراقی. دوای کشـانەوەی هێزە قەومییەکـان لە حکوومەت، حیزب دیتی ئێستا کاتەکەی گونجاوە تا داوای ئەو بەشدارییەی بکـا. جا لاپەڕەکانی ڕۆژنـامەی"اتحاد الشـعب" لای خۆیەوە خەریکی تـاوتوێکردنی ئەو داواکـارییەی بوو بە هەڵقولاوی بیرۆکەکانی جەماوەریشـی دانا. مەبەسـتمان لە بەشـداریی دەسـەڵات گەشـەپێدانی ڕژێم بوو و، تا پاشـتریش بتوانین ئەو ئامانجەمان بەدیبێنین کە ڕامانگەیاندبوو و ئەویش سۆشیالیزم بوو. ئەو هەنگاوەی عەبدولکەریم قاسـم هەڵیهێنایەوە و نەزیهە دلێمیی کردە وەزیر، سـەربـاری ئەوەی یەکەم ژن بوو لە نیشـتمانی عارەبیدا ببێتە وەزیر، بەڵام بۆ حیزب شـتێکی ئەوتۆ نەبوو. خۆ ئەوە لە ئاسـتی خواسـتەکانی حیزبیش نەبوو کە یەک پۆستی وەزارەتی شارەوانی وەرگرێ.[٦٨]

---

[٦٧] _ دیدارێکلەگەڵعەزیز محەمەد ٢٠١٥/٥/٧

[٦٨] _ حیزبی شیوعی مستومڕی ئەوەی بوو گوایە عەبدولکەریم قاسم بەشدارییپێکردنی حیزبی لە وەزارەت پشـتگوێ خسـتووە و ئیدی هەڵمەتێکی ڕۆشـنبیریی لەناو حیزبی شـیوعیی عێراقی لە ٢٨ی نیسـانی ١٩٥٩ دەسـتپێکرد و داوای بەسـداریکردنی حیزبی دەکرد لە حکوومەتدا.ئەوەش ئەنجامەکەی ئەو خۆپیسـاندانەی یەکی ئایاری ١٩٥٩ بوو کە وایکرد نەزیهە دلیمی بکرێتە وەزیری شـارەوانی. بۆ زیاتر: موفق خلف جاسـم. نزیهة

# ڕووداوەکانی کەرکووك و خاڵی دابڕان لە عەبدولکەریم قاسم:

هێشـــتا ڕووداوەکانی موســـڵ بەتەواوی کۆتاییان نەهاتبوو ، ڕووداوی کەرکووکیش کەوتە سەر ئاوێ و، لە هەموو بوارێکدا ســـەرەتای چوارچێوەبەندکردنی چالاکیی شـــیوعییەکان بوو. حیزبی شـــیوعی خەریکبوو جەماوەرەکەی بۆ خۆ ئامادەکردن بۆ یەکەم ســـاڵیادی ســـۆڕشـــی ١٤ی تەممووزی ١٩٥٨ کۆدەکردەوە. حیزبی شـــیوعی دەســـەڵاتێکی بەهێزی لە کەرکووک هەبوو و، دەسەڵاتەکەش تەنیا هەر هیی شیوعییەکان نەبوو و، پارتی دیموکراتی کوردســـتانیش پێگەیەکی بەهێزی لەو شـــارەدا هەبوو و نەتەوەچییەکـانی تورکمـانیش کاریگەرییەکی باشـــیان هەبوو. ناشـــکرێ کەرکووک لە گەڵ مووســـڵ بەراورد بکرێ کە موســـڵ مەیلێکی ئایینی و قەومیی هەبوو. ئـاخر کەرکووک پەیڕەوانی ئـایین و نەتەوەی جودای تیدایە وەک کورد و عارەب و تورکمان. ئەو تێکەڵە یەکنەگرەش هەمیشـــە لەناو ئەو ڕکابەرییانەدا دەژیان کە لەگەڵ چالاکیی هێزە حیزبییەکـانی نـاوچەکە پەیـدادەبوون، کە هەریەکە و لە هەوڵی ئەوەیدابوو وادەرکەوێ خۆی خاوەنی بڕیاری سیاسیی ســەر ئەرزی واقیعە[٦٩]. جا خەریکبوو ئاکۆکی دەکەوتە ناو ئەو

---

الدليمي و دورها في الحركة الوطنية و السياسية العراقية، دار الرواد المزدهرة، بغداد، ٢٠١٤.

(٦٩)Benjamin Shwadran, The Power Struggle in Iraq, Council for Middle Eastern Affairs Press, New York, 1960,p65.

تێکەڵەیە و من لەکاتی ڕووداوەکان لە کەرکووک بووم و هەستم بەوەی کردبوو شتێک ڕوودەدا. پەیوەندیمان بە هێزەکانی دیکەوە کرد و، پێشنیاری ئەوەمان کرد خۆپیشاندانەکان یەکبخرێن و بە دروشمی یەکگرتوویشەوە بچینە ڕێپێوانەکە. بەڵام کورد و تورکمان پێشنیارەکەیان ڕەتکردەوە. ئیدی بەیانییەکەی ١٤ی تەمموزی ١٩٥٩ خۆپیشاندان دەرچوون و هەرسێ هێزەکە تێیدا بەشداربوون، واتە حیزبی شیوعی و پارتی دیموکراتی کوردستان و تورکمانەکان.[٧٠]

مەجید خەدوریی لێکۆڵەری عیراقی، ڕۆڵی شیوعی لە ڕووداوەکانی کەرکووک وا وەسف دەکا کە "ناشیرینترین کاری شیوعییەکان بوو لە پاکتاوی ئەو بنکانەی بە دژایەتیکردنی شیوعییەت ناسرابوون و، پاکتاوی موسڵیش، دوای سەرکوتکردنی شۆڕشی شەواف، یەکەم پاکتاو بوو کە شیوعییەکان لەوێ ناشرینترین تاوانیان کرد و، لە بەغداش شیوعییەکان هێرشیان کردە سەر بنکەکانی بانگەشەی یەکێتیی عارەبیی گشتگیریان دەکرد و خەڵکیان کوشت و شوێنیان تێکدا، کەچی پاکتاوی کەرکووک لە پاکتاوەکەی موسڵیش توندتربوو".[٧١]

عەزیز محەمەدیش دەیەوێ لای خۆیەوە لێکدانەوەیەک بۆ ڕووداوەکانی کەرکووک بکا و، ئاماژە بۆ ئەوە دەکا و دەڵێ کە ڕێپێوانەکەمان بەڕێکەوت بەخەیاڵماندا نەدەهات ئەوەی ڕوویدا

---

٧٠ _ دیدارێک لەگەڵ عەزیز محەمەد ٢٠١٥/٥/٢٢.

٧١ _ مجید خدوري، المصدر السابق، ص١٧٣.

ڕوو بدا. بڕیاربوو ڕێپێوانەکە بەرەو گۆڕەپانی کۆمپانیا بچێ. ژن و منداڵێکی زۆریش لە ڕێپێوانەکەدا بەشداربوون، لەکاتێکدا ڕێپێوانەکە بەشـەقامەکانی شـاردا دەڕۆیی و، بە دیاریکراویش لای سـینەمـا کەرکووک، گوێمـان لێبوو چەنـد تەقەیەک لە ڕێپێوانەکە کرا. سـەرچاوەی تەقەکان دیار نەبوو، من هەمیشـە دەمانچەکەی خۆم هەڵدەگرت، بەڵام بەڕێکەوت دەمانچەکەم پێ نەبوو، ئاخر پێشبینیی ئەوەمان نەکردبوو دۆخەکە بتەقێتەوە و هەوڵیشـمان بۆ نەدابوو. ئەوە سـەرەڕای ئەوەی دەمانزانی دۆخی کەرکووک چەند هەسـتەوەرە، بەتایبەت ئەو گرژییەی لەنێوان کورد و تورکمان هەبوو و، ئەو ڕۆڵەی کۆمپانیاکانی نەوتیش[٧٢] دەیـانگێڕا، کە خەریکبوون، دوای داواکـاریی شـیوعییەکانی بە پێویسـتیان دەزانی کۆمپانیا نەوتییەکان

---

[٧٢] _ ڕاپۆرتێکی بەریتانی ئاماژە بۆ ڕووداوەکانی کەرکووک دەکا و ڕاپۆرتەکە دەڵێ زانیارییەکانی لە چەندین گێڕانەوە هەڵێنجاوە، لەوانەش سـەرچاوەی خۆرئاوایی و تورکی و لوبنانی و میسـری و عێراقی، کە تورکمانەکان دەڵێن دەڕۆژ پێش ڕوودانی پشێوییەکان هەستیان بەوەی کردبوو پیلانێکیان لە دژی دەچنرێ و ئەو بانگەشەیەیشیان لەسەر ئەو شتانە بنیات نراوە:

١_ سـەرۆکی شـارەوانیی ناوی بەرزنجییە، بڕێکی زۆری تەقەمەنیی سـەربازی و جلی سەربازی و چەک کۆکەکردبوو.

٢_ بەرزنجی بە هەنـدێ برادەری گوتبوو پێویسـتە پێش ١٤ی تەمموز کەرکووک بەجێبێڵن، چونکە شـتێک لەو ڕۆژیدا لەناو شـاری ڕوودەدا، لەکاتی ڕێپێوانەکە[illegible] چەندین خۆپێشـاندانی پشـتگیریی شـۆڕش کران و، کورد و تورکمـان و تیێدا بەشداربوون و ژمارەیەکی زۆری میلیشیای پاشترێ زاندرا شیوعی بوون، بەشدار[illegible] خۆپیشـاندانەکانیان کرد، بەلام ، سـەرباری ئەوەی دروشـمەکانیان شـیوعییانە [illegible] کەچی هیچ بەلگەیەک نییە بیسـەلمێنێ کە ئەوان ئەندامی فەرمیی ئەو حیزبە [illegible] زیاتر: عثمان علي ، الكورد في الوثائق البريطانية ، مؤسسة موكرياني للبحو[illegible] اربیل، ٢٠٠٨، ص٥٠٢.

خۆماڵی بکرێن، ڕۆڵێکی زۆر مەترسیداریان دەگێڕا. جا ئەو کۆمپانیایانە هەوڵیان دەدا خەڵکێک بەکاربێنن و دۆخەکەی پێ بتەقێننەوە، تا خۆیان ببنە تاکە تەرەفی سوودمەند. ئیدی پشێوییەک کەوتە ناو ڕیزەکانی خۆپیشاندەران و، نەمانتوانی هەڵوێستەکە کۆنترۆڵ بکەین، بەتایبەتی دوای ئەو لەدەست دەرچوونەی ڕوویدا و ئەو تۆقینەی لەناو خۆپیشاندەراندا بەسەر ژن و منداڵاندا زاڵ بوو. هەموو ئەوشتانەش بوونە هۆی ڕوودانی شەپۆلێکی هیستیریی دوژمنداریی نێوان هێزەکانی لەملەیدابوون، بەتایبەتییش کورد و تورکمان، کە ئەوەش بووە هۆی ئەوەی چەند قوربانییەکی لێ بکەوێتەوە و بەتایبەتیش لە ڕیزی تورکمانەکان. تۆمەتی ئەو کوشتنانەش بە حیزبی شیوعی و پارتی دیموکراتییەوە نووسان، ئەگەرچی ژمارەیەک شیوعی و قوربانیی دیکەش کوژران، لەوانەش سەرۆکی شارەوانی و حوسێن بەرزنجیی برای کە هەردووکیان بێتاوان بوون.[٧٣]

شیوعییەکان ڕەتیانکردەوە هیچ دەستێکیان لە ڕووداوەکانی کەرکووک هەبووبێ، لە ١٥ی تەمموزی ١٩٥٩ نووسراوێکیان ئاڕاستەی عەبدولکەریم قاسم کرد دووپاتیان کردەوە کە نابێ کاری تاوانکاریی لەو جۆرە دووپات ببێتەوە. تێیدا ئاماژەیان بۆ ئەوەی کردبوو کە "ئێمە تکا لە بەڕێزتان دەکەین بەتوندی دژی ئەو خەڵکە پیلانگێڕە بوەستی و ، لێکۆڵینەوەیەکی گشتگیر بکرێ تا سەرانی[٧٤] ئەو کارەساتە ئاشکرا بکرێن و،

---

[٧٣] _ دیدارێک لەگەڵ عەزیز محەمەد ٢٠١٥/٥/٢٢.

[٧٤] _"اتحاد الشعب"، العدد ١٤٩، تموز ١٩٥٩.

دەستدرێژیکەران بدرێنە دادگا تا سزای دادپەروەرانەی خۆیان وەرگرن: بەڵام بە چاوپۆشـــی لە ڕاســـتیی ئەوەی ڕوویدا و داخوا تـاوانبـاری راســـتەقینەی ئەو ڕووداوانە کێ بووە، ڕووداوەکانی کەرکووک بوونە هۆی ئەوەی گرێی پشـــتیوانیی عەبدولکەریم بۆ شـــیوعییەکان شـــلببێتەوە و دوای گوتارە بەناوبانگەکەی کڵێسـای مار یوسـف دەستی لێ سـووشـتن و، لەوێ تانووتی لەو ڕووداوە خوێناوییانەی کەرکووک دا و بە شـاراوەیی ئاماژەی بۆ بەرپرسـیاریی شـیوعییەکان کرد، بەڵام بێ ئەوەی بە نـاو نـاویـان بێنێ و گوتی: "ئەگەر لە وتەکەی کڵێســـای مار یوســـفمدا ئەو جۆرە کارانەم مەحکوم نەکردایە، ئەوا شـــکۆمان لە دەرەوە نەدەما و، لەســـــەر ئاســـــتی نێو دەوڵەتییش هەرایەکمان بۆ دەندرایەوە".[75]

عەبـدولکەریم هەر بەو مەحکوم کردنە نەوەســـتـا، بەڵکو شەپۆلێک دەستگیرکردنی دەستپێکرد و زۆری لە شیوعییەکان گرت. وەک هەوڵێکیش، بۆ دەســـتەمۆکردنی ئەو شـــیوعییانەی خەریکبوون دەبوونە هەڕەشـــە بۆ ســـەر پێگەکەی، فەرمانی لەسێدارەدان بۆ هەندێکیان دەکرا[76]. ئەوانە تا کودەتای شوباتی ١٩٦٣ لە بەندیخانە مانەوە و لەســـەر دەســـتی ســـەرکردەکانی بەعس لە ســـێدارە دران. پێدەچوو قـاســـم ڕووداوەکـانی کەرکووکی بە هەلێک زانیبێ تا لە دەســـەڵاتی ئەو شـــیوعییانە دەربازبێ کە باڵیان بەســـــەر شـــەقامی عێراقیدا کێشـــابوو،

---

[75] _ ماجد شـبر، خطب الزعيم عبدالكريم قاسـم، ١٩٥٨ – ١٩٥٩، دار الوراق، لندن، ٢٠٠٧، ص٢٣٨.

[76] Benjamin Shwadranl bid,p69.

ئەوەیشـی هاوشـێوەی لە دەسـەڵات لادانی ڕەوتی قەومییەکان کرد دوای ئەوەی لە تشـرینی یەکەمی ١٩٥٨ عەبدولسـەلام محەمەد عارفی لە دەسەڵات لادا و، پاشانیش پیلانەکەی ڕەشید عـالی گەیلانیی پووچەڵ کردەوە کە قەومییەکـان لەدەوری کۆببوونەوە و، کۆتاییەکەیشـیان لەگەڵ پیلانەکەی شـەواف بوو لە موسڵ کە بووە هۆی لادانی هەموو ئەو سەرکردانەی مەیلی قەومییـان هەبوو. بەڵام ئەوجـارەیـان هەڵمەتەکە ڕووی لە شـیوعییەکان بوو و دوای ئەو قسـە و قسـەڵۆکانەی گوایە شیوعییەکان دەیانەوێ بەسەر دەسەڵاتدا بدەن، بەتایبەتیش لە ٥ی تەمموزی ١٩٥٩.[٧٧]

لە ئەنجامی ئەو سـیاسـەتی پاشـەکشـەیەی قاسـم بەرانبەر شیوعییەکانی گرتەبەر، شیوعییەکان لەلای خۆیانەوە هەوڵیاندا لە قاسـم نزیکببنەوە و، ئەو کارانەیشـان مەحکووم کرد کە کرابوون و، ئەوەش لە ئەدەبیاتی شـیوعیدا لە کۆبوونەوەی تەمـمـووزی ١٩٥٩ بە "لەخـۆدان" نـاسـراوە و، لەو کۆبوونەوەیەشدا عەزیز محەمەد خرایە پاڵ مەکتەبی سیاسیی حیزبی شیوعیی عێراقی و، ڕەشید ڕوشدیی کادیری شیوعی ئاماژە بە دەسـتنیشـانکردنی عەزیز محەمەد دەکا بۆ مەکتەبی سیاسی و دەڵێ: "بەو بۆنەیەوە لەبیرمە کەریم ئەحمەد داودی ئەندامی لیژنەی مەرکەزی زۆر تووڕەبوو و نامەیەکی کورتی نووسـی و تێیدا داوای دەسـت لەکارکێشـانەوەی لە حیزب کردبوو. سەلام عادل پارچە کاغەزەکەی نیشاندانی کە دەست

---

[٧٧] _ اوربل دان، المصدر السابق، ص ٣٩٤-٣٩٥.

لەکارکێشـــانەوەکەی تێدابوو. هۆیەکەیشـــی بۆ ئێمە روون و ئاشـــکرابوو و نارەزایی بوو، ئەویش ئەوەبوو کە لەجیاتی ئەو بکرێتە ئەندامی مەکتەبی ســـیاســـی عەزیز محەمەد کرابووە ئەندام و، ئەویش خۆی بە شـــایـانتر دەزانی بۆ ئەنـدامیتیی مەکتەبی ســـیاســـی. ئەو ڕەخنەی ئەوەی لە عەزیز محەمەد هەبوو گوایە پێشـــترێ لە ســـەرەوەی دەســـتەی جیابووەوەی "رایة الشـغیلة" بووە و گرنگیش بەوەی نادا کە خەڵکی دی هەن لە چوونە مەکتەبی سیاسیی ڕازی نین.[78]

[78] ـ رشيد رشدي، المصدر السابق، ص٢٠٧.

# ململانێی ناو حیزبی شیوعی و کوتلەی چوار کەسەکە:

حیزبی شـــیوعیی عێراقی، دوای دەســـتەبەربوونی هۆکار و ئەوزاری پێویســت، کەوتنە مشـتومڕی ئەوەی داخوا پێویسـتە دەســەڵات لە قاسـم وەرگرن یان نا. ئاخر شـیوعییەکان باڵیان بەســەر ڕێکخراوە میللییەکاندا کێشــابوو و دەســەڵاتیان لەناو سوپا و پۆلیس زیادی کردبوو. لەگەڵ پاشەکشەی پەیوەندییان بە عەبدولکەریم قاســـمەوە، مشـــتومڕێکی زۆر لە مەکتەبی سـیاسـی و لیژنەی مەرکەزی لەنێوان دوو بیروڕادا بەرپابوو. یەکەمیان ڕای سەلام عادلی بوو و جەمال حەیدەرییش هاوڕای بوو و، داوای لادانی قـاســـمی دەکرد چونکە نوێنەری چینی بۆرژوابوو و نەدەکرا بۆ دوارۆژ لێی ئەمین بن. هەرچی ڕایەکەی دیکەبوو ، ئەوا عـامر عەبـدوڵلا و زەکی خەیری و بەهادین نوری و محەمەد حوســـێن ئەبولعیس نوێنەرایەتییان دەکرد و، ئەوانە بە کوتلەی چوارکەســـەکە ناســـرابوون، کە سەلام عادل بە زێدەڕۆیی تاوانباری دەکردن و گوایە لە هەوڵی ئەوەیدانە لە ســکرتێریی حیزبی شـیوعیی عێراقیی لادەن[79] و، ڕاســـتییەکەی من بە خەیاڵمدا نەدەهات کەســـی دی هێندەی سەلام عادل لێوەشاوەبێ و شایانی پێگەی سکرتێریی لیژنەی مەرکەزی بێ. هەر بەو بۆنەیەشـــەوە دەڵێم ئەو گرژی و کوتلەکارییەی ناو حیزبی شـــیوعیی عێراقی لەو دژبەرییانەی

---

[79] _ س مير عبدالكريم ، المصدر السابق، ص ١٥٥-١٥٦.

باروودۆخی نێودەوڵەتی و ناکۆکییەکانی ناو بزووتنەوەی کۆمۆنیزمی و کرێکاری و دەرکەوتنی هەڵوێستی توندی چینی، دابراو نەبوو، کە وەک دەڵێن سەلام عادل پەیڕەوی دەکرد و ئەوانیش چاویان لەوەی بوو لە پێگەی سکرتارییەتی حیزب لایدەن.[80]

بابەتی ڕێکخستنی حیزبی شیوعیی عێراقی لە ڕیزەکانی سوپادا، لەو کێشانە بوو کە لەناو لیژنەی مەرکەزیدا ناکۆکییان لەسەربوو. ناڕازییەکان داوایان دەکرد ڕێکخستنەکانی ناو سوپا هەڵوەشێندرێتەوە چونکە وادەکا قاسم مەترسیی لە حیزبی شیوعیی عێراقی هەبێ.[81] سەلام عادل لەگەڵ ئەو ڕایەی بوو ڕێکخستنەکانی سوپا بمێنێ. دوای وەرگرتنی ڕای زۆربەی ئەندامانی لیژنەی مەرکەزی، لەسەر ئەوەی ڕێککەوتن کە لەو بابەتەدا پرس و ڕاوێژ بە هەندێ لایەنی دۆست بکرێ و، ڕایەکەش بە دژی هەڵوەشاندنەوە کەوتەوە. دوای سەفەری سەلام عادل و جەمال حەیدەری بۆ مۆسکۆ و هاتنەوە بەغدایان، کێشەی ئەو کوتلەیە دووبارە گفتوگۆی لەسەر کرایەوە، نەخاسمە دوای ڕووداوەکانی کەرکووک و ئەو هەلوێستەی قاسم بەرانبەر حیزبی شیوعی هەیبوو، کە تای تەرازووی هێزی بەلای سەلام عادلیدا شکاندبووەوە. ساڵی ١٩٦٢، جارێکی دی لە کۆبوونەوەی لیژنەی مەرکەزی بێنەوبەردە لەسەر بابەتەکە کراوەیەوە و، بڕیاری ئەوەی درا

[80] _ زكي خيري وسعاد خيري، دراسات في تاريخ الحزب الشيوعي العراقي، اصدار اليوبيل الذهبي، ١٩٨٤، ص٣٦٦-٣٧٧.

[81] _ دیدارێکلەگەڵعەزیز محەمەد ٢٠١٥/٦/١.

هەریەک لە عـامر عەبـدوڵـلا و بەهـادیـن نـوری لە پێگە حیزبییەکانیان لابدرێن و ئەندامێتیی حیزبیشـیان هەڵپەسـیردێ و سڕ بکرێ و، زەکی خەیریش لە پێگەکەی مەکتەبی سیاسیی داماڵرێ و بۆ کارکردن بگوازرێتەوە ناوچەی فوراتی ناوەڕاست و، محەمەد ئەبولعیسـیش، چونکە لایەنگریی کوتلەکەی کردووە لەلیژنەی مەرکەزی لابدرێ. ئەو لادانانەی ئەو کوتلەیەش دوای ئەوەی هـات کە بـاوەڕی زۆربەی هـاوڕێیـان لە بەرژەوەنـدیی بۆچوونەکەی سەلام عادلی گۆڕا.[82]

ســــابت حەبیب ئەلعانیی ئەنـدامی لیژنەی مەرکەزیی حیزبی شــــیوعیی عێراقی، لەو بـارەیەوە ڕایەکی دیکەی دەربـارەی هەڵوەشـاندنەوەی ڕێکخراوی سـەربازی و ڕای عەزیز محەمەد لەبارەیەوە هەیە و، دەڵێ "لەکاتی سەردانیکردنی "اتحاد الشعب" دیســـان چاوم بە هاوڕێ عەزیز محەمەدی کەوت و داوایەکی دامێ کە خۆی و هادی هاشــم ئەعزەمی واژوویان لەســـەر کردبوو و، داوایـان دەکرد کۆبوونەوەیەکی لیژنەی مەرکەزی بۆ تاوتوێکردنی هەڵوەشـــاندنەوەی ڕێکخراوەکانی ناو هێزە چەکدارەکان بکرێ".[83]

---

[82] _ دیدارێکلەگەڵ عەزیز محەمەد ٢٠١٥/٦/١.

[83] ا- ثابت حبيب العاني، صــفحات من الســيرة الذاتية ١٩٢٢ – ١٩٩٨، دار الرواد المزدهرة، بغداد، ٢٠١٤، ص ٢٣٥.

# کورد و شۆڕشی ئەیلولی ١٩٦١،

دوای سیاسەتی لێک نزیکبوونەوەی نێوان هێزە سیاسییەکانی عێراقیی، عێراق لە شۆڕشی ١٤ی تەمموزی ١٩٥٨ بەخویەوە دیت و، هەوڵدان بۆ ڕاکێشانی هێزە سیاسییەکان، بە جیاوازیی ئاڕاستە و بۆچوونیان بۆ ڕەگەڵکەوتنی شۆڕش، لە ئیشە هەرە لەپێشەکان چارەسەری کێشەی نەتەوەیی کورد بوو. کوردیش پشکی لە سیاسەتی کرانەوەی دوای شۆڕش هەبوو، مەلا مستەفای بارزانی، کە دوای ڕووخانی حکوومەتی مهاباد لە کوردستانی ئێران لە ١٩٤٦، فەرمانی لەسێدارەدانی درابوو و، پەنای بۆ یەکێتیی سۆڤیەت بردبوو، لێووردنی بۆ دەرچوو. دوای گەڕانەوەیشی حکوومەتی عێراق پێشوازییەکی گەرمی لێکرد و، مووچەیەکی مانگانەی بۆ بڕدرایەوە و لە خانووەکەی نوری سەعید نیشتەجێ کرا. پاشان، کە دەستووری کاتیی کۆماری عێراق لە ٢٧ی تەمموزی ١٩٥٨ دەرچوو، دەستوور دانی بە مافی گەلی کورددا نا و، دوای عارەب کردییە نەتەوەی دووەمی عێراق.[٨٤]

بەڵام، ئەو سیاسەتی لێکنزیکبوونەوەیەی نێوان هەردوو لایەنی حکوومەت و پارتی دیموکراتی کوردستان درێژەی نەکێشا، چونکە کوردەکان داوای ئۆتۆنۆمییان دەکرد و، ئۆتۆنۆمییش ئەودەمای لە خشتەی کارە لە پێشەکانی حکوومەتدا نەبوو. ئەوەش پاڵی بە پارتی دیموکراتی کوردستانەوە نا لە ئەیلولی

٨٤ _ شكيب عقراوي، سنوات المحنة في كردستان (اهم الحوادث السياسية والعسكرية في كردستان العراق ١٩٥٨-١٩٨٠)، مطبعة مناره، اربيل، ٢٠٠٧، ص٢٨.

١٩٦١دا شـــۆڕش دژی حکوومەتی عێراقی ڕاگەیەنێ[٨٥]. ئێمە وەک حیزبی شـــیوعی، مەیلمـــان لە ڕووبەڕووبوونەوەی چەکداری نەبوو و ، بگرە هەندێ لە ســـیاســـییەکانی پارتی دیموکراتی کوردســـتانیش پشـــتگیریی ڕووبەڕووبوونەوەی چەکدارییان نەدەکرد. من و سـەلام عادل، ئەو بابەتەمان لەگەڵ شـــاندێکی پارتی دیموکراتی کوردســـتان تاوتوێ کرد و، ئەنـدامـانی شـــانـدەکەش بڕیـاری ڕووبەڕووبوونەوەیـان ڕەتکردەوە. بەڵام بە شێوەیەکی سەرەکی ڕایەکە بەدەست مەلا مســـتەفای بارزانی بوو، کە بڕیاری خەباتی چەکداریی دابوو. جا لەپای ئەوە بەیاننامەیەکمان دەرکرد و دروشمی "ئاشتی بۆ کوردســـتان و دیموکراتی بۆ عێراق"ی هەڵگرتبوو. ئیدی، بۆ دەرهێنانی پڵیتەی ئاگری شـەڕ، خەریکبووین ئەو دروشـمەمان لە جەماوەر دەگەیاند. بەڵام، چونکە هەردوولا ســـووربوون چەک لێکدی هەڵگرن، ئیدی ئەو کارە سوودێکی نەبوو.[٨٦]

---

[٨٥] - مەسعود بارزانی لەبارەی ئەو هۆیە نادیارانەوە دەپرسێ کە پاڵیان بە کوردەوە نا شۆڕش لە دژی عەبدولکەریم قاسم ڕاگەیەنن. للمزید انظر: مسـعود البارزاني، البارزاني والحركة التحررية الكردية ، ٣أجزاء ,مطبعة وزارة التربية، اربيل، ٢٠٠٢، ج٣، ص٥

[٨٦] _ پێدەچێ پەرەســـەندنی قەیران لە باکووری عێراق لە نێوان حکوومەت و هێزە کوردییەکان و لەبەر سووربوونی هەردوولا کە دەبێ هەڵویستی خۆیان بە زەبری چەک یەکلاکەنەوە و بێ ئەوەی ، لەناو هەڵرشـتنی تۆمەت بۆ یەکتریی نێوان هەردوو لایەن، هیچ بەرابیەکی ڕەوینەوەی قەیرانەکە لە ئاســـۆدا دەرکەوێ و، ســـەرباری ئەوەی شیوعییەکان چەند پێشنیارێکیان ، بێ ئەوەی لای هیچ لایەکیان بگرن، بۆ چارەســەری قەیرانەکە خستەڕوو ، ئەوجارەیان دروشمێکی جودا لەوانەی پێشترێیان خستەڕوو و، ئەویش دروشمی "ئاشتی لە کوردستان" بوو. بۆ زیاتر: الحزب الشيوعي العراقي، رسالة من العراق (يحررها مكتب التثقيف والدعاية المركزي في الحزب الشـــيوعي العراقي، الرسالة السادسة عشر، نيسان ١٩٦٢.

عەبدولکەریم قاسمیش، بەشێکی پەرەسەندنی ئەو قەیرانەی دەکەویتە ئەستۆ. ئەو هەوڵی نەدا درزەکان پڕکاتەوە و دڵنیایی بۆ کوردەکان بنێرێ، بەڵکو خەریکبوو سوپای لە کوردستان کۆدەکردەوە. بەوەش، عەبدولکەریم قاسم قیروسیای لە هاوپەیمانیی کوردەکان کرد و قیروسیای لە هاوپەیمانیی شیوعییەکانیش کرد.. سەرەتا هەڵویستمان بێدەنگی بوو، چونکە دەمانزانی دەرەبەگێکی زۆری کورد داوای شەڕی دژی حکوومەتیان دەکرد و، ئەوەش هەڵویستێکی دیاری دژی حکوومەت بوو دوای ڕاگەیاندنی یاسای چاکسازیی کشتوکاڵی. ئیدی سەلام عادل ئەو هەڵویستەی خستەروو کە دەبێ حیزبی شیوعی لەبارەی ئەو کێشەیەوە هەیبێ و، بەوجۆرە بوو: "ئێمە لە داوای مافەکانی گەلی کورد لەگەڵ کورد و بارزانیداین و ، لە دژی دەرەبەگەکانیش لەگەڵ حکوومەتداین"[87]. ئێمە، پێمانوابوو شۆڕشی کورد درێژە ناخایەنێ، بەڵام چەند ساڵی خایاند و خەزێنەی دەوڵەتی بەفیڕۆ دا. خەڵکێکی زۆر لە هەردوولا کوژران. دەکرا کێشەکە بە گفتوگۆ چارەسەر بکرابا. لە سایەی بەردەوامیی ڕووبەڕووبوونەوەی چەکداری، ئێمە وەک حیزب، خەریکبوو، لەسەر بنەمای ئۆتۆنۆمی لە چوارچێوەی دەوڵەتی عێراقدا، بیرمان لە چارەسەری کێشەی کورد دەکردەوە. بەڵام دوای جودابوونەوەمان لە عەبدولکەریم قاسم ، ئێمەش هەڵویستمان گۆڕا و، پشتگیریی شۆڕشی کوردیمان کرد و، دوای کودەتای شوباتی ١٩٦٣ هاتینە ڕیزەکانی ئەو شۆڕشەوە.[88]

---

٨٧ _ الحزب الشيوعي العراقي، مجموعة وثائق برنامجية ، ص ص١٠٢-١٠٥.

٨٨ _ دیدارێک لەگەڵ عەزیز محەمەد ٢٠١٥/٥/١٧.

## هەڵوێست وەرگرتن بەرانبەر سیاسەتی عەبدولکەریم قاسم:

خۆ ئامادەکردن بۆ کودەتای هەشتی شوبات، شتێکی لەهیکڕا نەبوو. پێشی ئەو کودەتایەش، هێزە قەومییەکان بە پشتیوانیی کۆماری عارەبیی یەکگرتوو بەردەوام لە هەوڵی کودەتایەک بوون حکوومەتەکەی عەبدولکەریم قاسمی پێ بڕووخێنن. جا ئەو هەوڵانە بە بزاوتی عەبدولسەلام عارف دەستی پێکرد و، دوایەش بزاوتی شەواف. ڕاپۆرتێک دەڵێ قاسم شیوعی بووە، لەکاتێکدا خەلیل ئیبراهیم حەسێنی یەک لە مێژوونووسانی شۆڕشی تەمموزە ئەوەی ڕەتدەکاتەوە و دووپاتیدەکاتەوە دوای ئەو ڕووداوانە "قاسم هێشتا فریوخواردووی ئەو ڕاوێژکارانەی بوو کە بڵاوکراوەی ساختەیان دەخستە بەردەستی و، ئەویش تاقیکردنەوەیەکی سیاسیی بای ئەوەندەی نەبوو"، [89] ئەوجا لە تشرینی یەکەمی ١٩٥٩ هەوڵی تیرۆرکردنی عەبدولکەریم قاسم درا و، ، دوای وتارەکەی عەبدولکەریم قاسم لە کڵێسای مارِ یوسف و ئەو ڕێوجێیانەی بەرانبەر ئەو ئەفسەرانەی گرتەبەر کە مەیلی چەپڕەوییان هەبوو و، یان لە پێگەکەیان لایدان و یان خانەنشینی کردن، ئیدی هێزە قەومییەکانی لەوەی دڵنیابوون مانگی هەنگوینیی نێوان قاسم و

---

[89] _ خليل ابراهيم حسين الزوبعي، العراق في الوثائق البريطانية ١٩٥٨-١٩٥٩، ٦ اجزاء، بيت الحكمة، بغداد، ٢٠٠٢، ج٤، ص٢٢٥.

شیوعییەکان کۆتاییهاتووە، چالاکانە دەستیان بە پلاندانان کرد تا بەسەریدادەن و لەناوی ببەن[٩٠].

ئەو وتارە بە خاڵی جیابوونەوەی عەبدولکەریم قاسم و شیوعییەکان دادەندرێ. عەبدولکەریم خەریکبوو گومانی لە نیازەکانی حیزبی شیوعیی عێراقی دەکرد. خەریکبوو لە سیاسەتەکانی تووشی نەپێوی[٩١] دەبوو[٩٢]، ئیدی قەومییە پیلانگێڕەکانی بەندیخانەی بەردا و، سەرباری ئەوەی دەیزانی چ نیازێکیان هەیە، کەچی لە خۆی نزیکخستنەوە. بەوەش، عەبدولکەریم قاسم زۆر برادەری لەدەستدا و لەوانەش حیزبی ئێمە، کە ڕۆژنامەکەی داخستین و زۆربەی کادیرەکان راوەدوونران و ژمارەیەکی زۆریشیان گیران. بەڵام دوای هەوڵی تیرۆرکردنی، لە نەخۆشخانە سەرمان لێدا و ڕامانگەیاند پشتیوانی ئەوین و بەرگریی لێدەکەین. کەچی وەک دەردەکەوێ ئەو بڕیارێکی بنەبڕی دابوو کە گەڕانەوە بۆ ئەو هێزەی

[٩٠] - Benjamin Shwadran, I bid,p75.

[٩١] _ نەپێو: ئەو زەوییەی قوڕێکی ئەوتۆ بێ نەتوانی هەنگاوی تێدا باوێی. ل.ب.

[٩٢] _ باقر ئیبراهیمی سەرکردە لە حیزبی شیوعی، باسی ئەوەی دەکا کە دوای رووداوەکانی کەرکووک ، پاشەکشەیەک لە پەیوەندییەکانی حیزب و قاسم ڕوویدا و، لە کۆبوونەوە بەرفراوانەکەشدا ڕەخنەی زاتی هاتەگۆڕێ و ئەوەش هەڵویستێکی دروست بوو. بەڵام دەکرێ بگوترێ کە ڕەخنە لەخۆگرتنەکە ئەوەندە قووڵ و گشتگیر نەبوو و، هەر لەبنجرا مەبەست ئەوەبوو پەیوەندیی نێوان حیزب و سەرکردایەتیی شۆڕش "عەبدولکەریم قاسم" چاکبکرێتەوە، کە ئەوەش بە شێوەیەکی تەواو دەستەبەر نەبوو ، لە کاتێکدا دوژمنانی حیزب ئەوەیان قۆستەوە تا هەڵمەتێکی دژی شیوعییەکان هەڵگیرسێنن و حیزبەکەیان تەریک بکەن. بۆ زیاتر: باقر ابراهیم، مذکرات باقر ابراهیم، دار الطلیعة، بیروت، ٢٠٠٢، ص٨٤

شــیوعییەکان مەحاڵە. پاشـــان عەبدولکەریم قاســـم، لە ١٩٦١ لەگەڵ کوردەکان کەوتە ململانێ و، ســـوپای بۆ شـــەڕی دژی کورد بردە باکوری عێراق. بەوەش هەلی بەسەرداڕانی هاتبووە بەرێ، چونکە چەنـدین بەرە لە دژی کرابووەوە و ئەوانیش هێزە نەتەوەییە کوردەکـان و دەوروبەرە عـارەبەکەی بوون، نەخاســـمە دوای ئەوەی داوای کوێتی دەکرد، ســـەرباری ئەو هێزە بزوێنەرەی کودەتـا، واتە کۆمپـانیـاکـانی نەوت، دوای ئەوەی عەبدولکەریم قاســـم هەندێ ڕێوشـــوێنی خۆماڵیکردنی بەشـــێکیانی گرتبووە بەر و ، لەپشـــت ئەو کۆمپاذیایانەش ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و بەریتانیا و هاوپەیمانەکانیان لە ناوچەکەدا هەبوون.[٩٣]

ڕایەکی دی دەربارەی عەبدولکەریم قاســـم هەبوو ، کە عەزیز محەمەد خستییەڕوو "ڕایەک لە سەرکردایەتیی حیزبمان هەبوو و پێیوابوو عەبدولکەریم قاســـم ناتوانێ بێ ئێمە بجووڵێتەوە، بێگومان ئەوە لە ســـەرەتایەکان بوو، بۆیە ئەوانەی ئەو ڕایەیان هەبوو دەیانگوت: با هەندێ کات بدەینە عەبدولکەریم قاســـم تا بە هەڵوێستەکانیدا بچێتەوە، چونکە پێویستی پێمانە و، ئەوەش لە کورتبینیمان بوو بۆ عەبدولکەریم قاسم"[٩٤].

ئەگەرچی هەوڵی پڕکردنەوەی درزی نێوان خۆمان قاســـممان دا، بەڵام دوای ئەوەی ڕازی نەبوو مۆڵەت بداتە حیزبی شیوعی عێراقی هەوڵەکانمان ســـوودێکیان نەبوو، لەکاتێکدا مۆڵەتی دایە

---

[٩٣] _ دیدارێک لەگەڵ عەزیزمحەمەد ٢٠١٥/٥/٢٢.

[٩٤] _ توفیق التمیمي ، شـهادات عراقیة(حوارات في ذاكرة عراقیة)، دار الحصـاد، دمشـق، ٢٠١١، ص٣٣.

داود ئەلسـائیغی لە خولگەی ئەودا دەخولایەوە و، ئامانجیشـی لاوازکردنی حیزب بوو، چونکە دەیزانی لەگەڵ سـائیغـدا ناکۆکیمان لەبەینێیە، ئەگەرچی یەقینیشی هەبوو کە سائیغ ئەو هێزە میللییە پشـتگیریکەرەی بۆ حیزبەکەی نەبوو. ئێمە دیواربڕیی حیزبەکەی داود ئەلسـائیغمان کرد و ژمارەیەکی زۆری کادیرەکانی خۆمان ڕەوانەی ناو حیزبەکەی کرد تا بتوانین سـوود لە پێگە و ڕۆژنامەکەی وەرگرین. ئاخر هەر هەموو وتـارەکـانی لە ڕۆژنـامەکەی داود ئەلسـائیغیـدا بڵاودەبوونەوە، لە سەروتارەکەی بترازێ کە خۆی دەینووسی، ئێمە دەماننووسـین. وەک دەردەکەوێ، ئامانجی قاسـم ئەوەبوو حیزب لە سەرکردایەتییە ناسراوەکەی داماڵێ.[95]

بەڵام ئێمە، نە باسـی نیشـتمان پەروەیی عەبدولکەریم قاسـمی دەکەین و نە پـاکی و بێگەردییەکەی. بەڵکو بـاسـی هەڵەی سـیاسـەتەکانی دەکەین، ئەگەرچی ئەوەی خۆیشـمان بێ هەڵە نەبووین. ئـاخر ئێمە عەبـدولکەریممـان وەک پێویسـت نەخوێنـدەوە، بە جوانییش دەسـتنیشـانمـان نەکرد تـا بە شـێوەیەکی گونجـاو مـامەڵەی لەگەڵ بکەین. ڕەنگە قـاسـم ویسـتبێتی بەو هەڵویسـتانەی بۆ دنیای دەرخا کە ئەو بەلای یەکێتیی سـۆڤیەتیـدا کێـل نەکردووەتەوە و، ئەو ، وەک ڕۆژنامەکانی خۆرئاوا بانگەشـەیان بۆ دەکرد "کێرنسـکی"ی[96] عێراقە. ئێمە وەک حیزب هەڵەمـان هەبوو و، هەموو حیزب و

---

[95] _ دیدارێکلەگەڵ عەزیز محەمەد ٢٠١٥/٥/٢٢.

[96] _ سیاسییەکی ڕووسیی دیار و خانەدان بووە و لە کاتی حکومەتی کاتیی ١٩١٧دا سەرۆکوەزیران بووە.

هێزەکـانی دیکەیش هەڵەیـان هەبوو. هەر لەبەر ئەوەش بوو کودەتـاچییەکـانی ٨ی شــــوبـاتی ١٩٦٣ توانییـان بگەنە ئامانجەکانیان کە پێشترێ حیزبی شیوعی ئەو بەردەبوو ببووە تەگەرەی ڕێیان. ئەو کارەشــیان پاش ئەوە بۆ چووەســەر کە قاسم دوای هەڵوێستە نەرێنییەکەی بەرانبەرمان، وەک حیزبێکی جەماوەری، لەسەر ڕێیەکەی لادابن.

ئەو مـاوەیەی ١٤ی تەمموز خۆشـــترین ڕۆژەکـانی ژیـانی حیزبەکەمان بوو. بەڵام دواترێ کەوتینە ژیانی ڕاوەدوونان و خۆشاردنەوە، تەنانەت هەر بۆ ئەوەی خۆمان لە بەریەککەوتنی عەبدولکەریم بپارێزین، ناچاربووین دوو کادیری دیاری حیزب، کە مەهدی حەمید و حەمزە سەلمان جبووری بوون، رادەستی قـاســـم بـکەیـن. کە مەهـدی حەمـیـد لە بەشـــدارانـی ڕوڕوبەوبوونەوەی بزاوتی شـــەواف بوو و پاش کودەتای ٨ی شـــوباتی ١٩٦٣یش ئەو هاوڕێیانە خرانە ژێر ئەشـــکەنجە و لەناوبردران.[٩٧]

---

[٩٧] ــ توفيق التميمي، المصـــدر الســـابق، ص ٣٧ ، دیدارێک لەگەڵ عەزیز محەمەد ٢٠١٥/٦/٨.

# کودەتای ٨ی شوباتی ١٩٦٣ و خۆئامادەکردنەکانی حیزبی شیوعی؛

دەبێ، وەک توندوتیژییەکی لە ڕستەت بەربوو ی نیوان لایەنەکانی بزووتنەوەی نیشتمانی ئاماژە بۆ شەقامی سیاسیی عێراقی بکەین، بەتایبەتییش حیزبی شیوعیی عێراقی لەلایەک و ، ڕەوتە قەومییەکەی حیزبی بەعسی عەرەبیی ئیشتیراکی نوێنەرایەتیی دەکرد لەلایەکی دی. ئاخر هەردوو لایەنەکە هەستیان دەکرد زوڵمیان لێ کراوە، هەر لەو دەمیشدا زمانی گفتوگۆ لەنێوان لایەنەکانی بەرەی یەکێتیی نیشتمانیدا نەما و گۆڕا بۆ زمانی پەت و چەقۆ و چەک.[٩٨]

وەک ئاماژەشم پێکرد، کودەتای ٨ی شواتی ١٩٦٣ ڕووداوێکی لەناکاو نەبوو، بەڵکو نموونەی ڕستێک هەوڵی کودەتایی بوو کە هێزە نەیارەکانی دەسەڵاتی قاسم ڕێکیانخستن و، بەشێوەیەکی تایبەتیش خۆی لە حیزبی بەعسی عەرەبیی ئیشتیراکی و هێزە قەومییەکانی دیکەدا دەنواند کە پێیانوابوو دەسەڵاتەکەی قاسم لادانێکە لە ئامانجەکانی شۆڕش و ، ئەوجا ئەو هێزانە ڕوویان بەرەوە دەرەوە وەرگێڕا و وەک پێشتر باسمان کرد پشتیوانییان کرا.[٩٩]

حیزبی شیوعی ئاگای لە هەوڵە کودەتاییەکان هەبوو و، ڕاشیدەگەیاندن. بەڵام، سەرباری ئەوەی دەیزانی چ دەگەڕێ،

---

[٩٨] _ حميد حمد السعدون، المصدر السابق، ص ٦٠-٦١.

[٩٩] _ دیداریکلەگەڵعەزیز محەمەد ٢٠١٥/٦/١٠.

کەچی گوێچکەکانی عەبدولکەریم قاسم بۆ حیزب شل نەکران. حیزبی شیوعی پلانێکی ڕووداوی لەهیکڕایی هەبوو و، پلانەکە لە بارەگای سەرکردایەتیی حیزب بوو لە بەغدا و، لە بازنەی هەندێ لایەنی دیاریکراویشدا بوو، چونکە حیزب پێیوابوو هەر هەوڵێکی کودەتایی هەبێ ئەوا لە بەغدا دەبێ.[100] واشمان بیردەکردەوە کە ئامادە دەبین تا بەرەوڕووی هەر هەوڵێکی کودەتایی ببینەوە. هەرچی عەبدولکەریم بوو، وایدەزانی ئامانجی ئاشکراکردنی ئەو هەوڵە کودەتاییانەمان پاڵنەری سیاسیان لە پشتە. وەک سەربازێکیش، پێیوابوو هێز لە سوپادایە و پێویستی بە هێزی دیکە نییە.[101]

بەرەبەیانی کودەتای ٨ی شوبات لە کەرکووک بووم. کە هەواڵی کودەتایەکەمان گوێ لێبوو، چەند خۆپیشاندانێکمان دژی کودەتایەکە کرد. داواشمان لە ئەفسەرە شیوعییەکان کرد

[100] _ باقر ئیبراهیمی سەرکردە لە حیزبی شیوعی دەڵێ دوای هەوڵی تیرۆرکردنی قاسم لە تشرینی یەکەمی ١٩٥٩، هەوڵی ئەوەی درا "پلانی ڕووداوی لەناکاو" لەناو حیزب دابندرێتەوە، کە ئامانجی بەرووبوونەوەی هەر کودەتایەکی سەرەوەیی بوو، چونکە بە بڕوای حیزب، هەر ئەوە نەبوو بە کودەتایەکی کۆنەپەرست و دژە شۆڕش دابندرێ و بەس. بۆیە دەبوایە حیزب بە چەک و بە بەکارهێنانی ئەو دەسەڵاتەی لەناو هێزە چەکدارەکان هەیبوو و بە بەرەورووبوونەوەی میللییش بەرەنگاری ببێتەوە. سەلام عادلی سکرتێری یەکەمی لیژنەی مەکەزی پێیگوتم دوای ئەوەی دڵنیابووە کە زۆرینەی ئەندامانی مەکتەبی سیاسی ڕەتیدەکەنەوە، جا بە هیوای ئەوەی لە هەلێکی گونجاودا جارێکی دی پێشنیاری بکاتەوە، ئەو پرۆژەکەی خۆی کێشابووەوە. من ئەودەمی لەگەڵیدابووم و، دوای ئەو شتانەی ڕوویشیان دا گومانەکانم لە ئاستی سەرکەوتنی ئەو پلانە قووڵتربوونەوە.. بۆ زیاتر: باقر ابراهیم، المصدر السابق، ص ٨٦-٨٧.

[101] _ دیدارێکلەگەڵ عەزیز محەمەد ١٠/٦/٢٠١٥.

بۆ بەرگریکردن بچنە بارەگا سەربازییەکان و ڕێگە نەدەن کودەتاچییەکان دەست بەسەر بارودۆخەکەدا بگرن. بەڵام دوای ئەوەی ئەفسەرانی لایەنگری کودەتا دەستیان بەسەر بارودۆخەکەدا گرتبوو لێنەگەڕان ئەفسەرە شیوعییەکان بچنە ناو بارەگاکان. سەرباری ئەوەش ناوچەی کەرکووک دوای ڕووداوەکانی تەمموزی ١٩٥٩ ئەوەندە بە ناوچەیەکی هاوسۆزی شیوعییەکان دانەدەندرا. لەگەڵ ئەوەشدا چەند دەستەیەکی بەرگریمان دروستکرد و دەستمان بە دروستکردنی مەتەرێزان کرد و، بەرگریکردنمان هەشت ڕۆژی خایاند. دوای کۆتاییهاتنی بەرگری لە بەغدا و شارەکانی دیکەی عێراق، دیتمان دوای ئەوەی هەڵویستەکە لە بەرژەوەندیی کودەتاچییەکان یەکلابۆتەوە، دەبێ پاشەکشە بکەین. پاشان ڕوومان لە ناوچەی کوردستان کرد و مستەفا بارزانی[١٠٢] سەرباری ئەوەی لایەنگری کودەتای شوبات بوو، کەچی پێشوازیی لێ کردین . بارزانی ماڵێکی حیزبیی بۆ دابینکردین و ، گوتی: "من متمانەم بەوانە نییە، هەڵوێستیشمان بەرانبەریان هەڵوێستێکی دۆستانەی کاتییە"[١٠٣].

---

[١٠٢] _سەمیر عەبدولکەریم لە کتێبی ڕووناکییەک بۆ سەر بزووتنەوەی شیوعی دەڵێ ڕێککەوتنی نێوان عەزیز محەمەد و بارزانی دەگەڕێتەوە بۆ کانوونی یەکەمی ١٩٦٢، ئەو کاتەی عەزیز محەمەد کۆبوونەوەی لیژنەی کەرکووکی کرد تا دواتریێ حیسابێک بۆ بزووتنەوەی چەکداریی شیوعی بکا و خۆ لە پێکدادانی نێوانیان بپارێزن. بۆ زیاتر: سمیر عبدالکریم، المصدر السابق، ج٣، ص١١٧.

[١٠٣] _ دیدارێک لەگەڵ عەزیز محەمەد ٢٠١٥/٦/١٠.

دوای ئەو دیدارە، عەزیز محەمەد توانیی پشـــتیوانیی بارزانی دەســـتەبەر بکا تا هێزی پشـــتیوانیی شـــیوعییەکان لە ناوچە کوردییەکان بمێننەوە و، پاشـان بنکە و بارەگایان لە هندرێن و ڕەواندز و شـەقڵاوە و دارەبیی قەزای کۆیە و چیای ئاوەگردی ئەو ناوچەیە دروستکرد و، لە چیای ئەلقووشیش کۆبوونەوە و خەڵکێکی زۆری لە بەغدا و جێی دیکە لەدەســـت "حەرەس قەومی"یان دەربازیان ببوو پەنایان بۆ ئەو بنکانە هێنا.[١٠٤]

ئەگەرچی شـیوعییەکان گەیشـتبوونە ناوچە کوردییەکان، بەڵام هەندێ ئەندامی مەکتەبی سیاسیی پارتی دیموکراتی کوردستان ســـەریان دەکردنە ســـەرێ و بێزاریان دەکردن. بەتایبەتییش ئیبراهیم ئەحمەد، جا مەسـعود بارزانی باسـی ئەو ناخۆشـییەی دەکا تووشـــی عەزیز محەمەدی بووە کاتێ لە ماوەت ئیبراهیم ئەحمەدی دەبینێ و، ئەویش چۆن بێڕێزیی پێدەکا و ســـووک ســـەیری دەکا و وەک دەرکردنێک دەریدەکا، ئەویش بە دڵێکی شکاو و ئازارێکی دەروونییەوە دەگەڕێتەوە، کەچی کە بارزانی دەبینێ ئیدی ئەو خەمەی تـاری دەبێ و لە دڵی پەرت دەبێ، چونکە بـارزانی زۆری بەخێردێنێ و ڕێزی لێ دەنێ و چاودێری و پاراستنی خۆی و ئەندامەکانی حیزبەکەی بۆ دابین دەکا و هەرچیی پێویسـتیانە بۆیان دەسـتەبەر دەکا. جا لەپای ئەو مامەڵەیەشـەوە، حیزبی شـیوعیی عێراقی هەموو توناکانی خۆی خســتە خزمەتی ســەرکردایەتیی شـۆڕش و، هەردەم

[١٠٤] _ فیصل الفؤادي، الحزب الشیوعي العراقي والکفاح المسلح(منذ تأسیس الحزب عام ١٩٣٤ حتی المؤتمر الخامس ١٩٩٣، دار الرواد المزدهرة، بغداد، ٢٠١٠، ص٦٣.

هەڵوێستی شەرافەتمەندانە بوو و، سەرکردایەتییەکەی ببوونە جێی متمانە و سەرکردایەتیی شۆڕشیان پێ سپێردرابوو. جا لە هامێزگرتنی شیوعییەکان هەر بەوەندە پشتیوانییەی بەرەی کوردی نەوەستا، بەڵکو گرنگییەکەی، وەک مەسعود بارزانی دەڵێ "لە هەڵوێستی بە باوەڕی بارزانیدابوو بەرانبەر بەو کارەساتەی بەسەر شیوعییەکاندا هاتبوو و، دەنگدانەوەیەکی ئەوەندە فراوانی لە وڵاتە سۆشیالستییەکان و لە بەراییشیاندا یەکێتیی سۆڤیەت دابووەوە، تا ئەو ئاستەی بارزانی لەلایەن نەیارانی خۆی و نەیارانی شیوعییانەوە، مەبەستم بەعسییەکان و دەستە قەومییەکانی دیکەیە، وەک تۆمەت و گەپجاری نازناوی مەلای سووری درابوێ"[105]

عەزیز محەمەد ئاماژە بەو نزیکبوونەوەیەی لەگەڵ بزووتنەوەی کوردی دەکا و، دەڵێ دەستمان بە چەکدارکردنی هێزەکانی پشتیوانی کرد. بەڵام بارزانی، چونکە لە حکوومەتی کودەتا نزیک بوو، سەرەتا ڕەتیکردەوە چەکمان بداتێ، بەڵام دوای ئەوەی سەرکردایەتیی بەعس شەڕیان دژی کوردستان ڕاگەیاند، ئێمەش بووینە بەشێک لە پێشمەرگەی کورد و، هێزەکانمان بەرانبەر کودەتا یەکیان گرت، بەڵام ئێمە خۆمان بڕیاری خۆمان دەدا و بنکە و ڕاهێنانەکانیشمان جودا بوو و،

---

[105] _ مسعود البارزاني، البارزاني وحركة التحرر الكردية ١٩٦١-١٩٧٥، ٣ اجزاء، مطبعة وزارة التربية ، اربيل، ٢٠٠٢، ص٨٨-٨٩

خۆیشمان ئەو بەرە و کاتەمان هەڵدەبژارد تا شەڕی هێزەکانی حکوومەتی تێدا بکەین.[١٠٦]

دوای کودەتا، شەپۆلێکی ترسناکی لەسێدارەدان و کوشتن بەرانبەر شیوعییەکان و دیموکراتییەکان دەستی پێ کرد و، شیوعییەکان هیچ بژاردەیەکیان لەبەردەستدا نەبوو، یان مردن بوو یانیش دانپێدانان. جا وەک هەوڵێکی تۆڵەسەندنەوە یان هەوڵی زانیاریی پتری ڕێکخراوەکانی حیزبی شیوعی، ناشیرینترین شێوازی ئەشکەنجەیان بەکارهێنا. حەسەن عەوێنەی کادری سەرکردایەتی ئەشکەنجەیەکی گیانکێشی درا و، داوایان لێکرد دان بە تۆمەتەکاندا بنێ تا لەمردن دەربازبێ، ئەویش گوتبووی چ جۆرە ئەشکەنجەیەکتان ماوە بەکاری بهێنن چونکە لەگەڵ مردنێ چەند ساتۆکەیەکمان لەبەینێ ماوە.

دوای کودەتای ٨ی شوبات خەریکبووین بەراوردی نێوان مامەڵەی ڕژێمی پاشایەتی و ڕژێمی کۆماریمان دەکرد، نەخاسمە دوای کودەتای ٨ی شوباتی ١٩٦٣[١٠٧]. دیتمان جیاوازییەکی زۆر لە نێوان ڕژێمی پاشایەتی و ڕژێمی کۆماریدا هەیە. هەر بۆ نموونە، فەهد دوای گیرانی نە لێیدرا و نە

---

[١٠٦] _ دیدارێک لەگەڵ عەزیز محەمەد ١٦/ ٢/ ٢٠١٢.

[١٠٧] _ دکتۆر تەحسین معەلەی هاتبوو چارەسەری بەندییە شیوعییەکانی "قەسری نیهایە" بکا کە ئەشکەنجە درابوون ، ئاماژە بەوەی دەکا شوێنەواری ئەشکەنجەکەیان وەها بەسەرەوە بووە کە خەریکبووە لەبەر توندوتیژیی ئەشکەجە نەناسرێنەوە. بۆ زیاتر: علي كريم سعيد، عراق ٨ شباط من حوار المفاهيم الى حوار الدم مراجعات في ذاكرة طالب شبيب، دار الكنوز الادبية، بيروت، ١٩٩٩.

سـوووكـايەتيى پێ كرا و، "غەزبـان سـەعـد"ی بە تۆمەتی شـیوعیبوون گیرابوو و، ئەفسـەرێكی سـوپا بوو، ئەشـكەنجە نەدرا. عەریفەكەی بەندیخانەش بە وشـەی "گەورەم" بـانگی "سـەعد"ی دەكرد. جا ئەو بەهایانە، بەتایبەت لە سـەردەمی بەعسدا، ئیدی نەمان.[108]

جا سـەرباری توندوتیژیی بەعس دژی شـیوعییەكان،[109] بابەتی داروخانی دۆخی ڕێكخراوەیی حیزب هەموو كادیرەكانی حیزبی سـەرقـاڵ كردبوو، داخوا چۆن پەیوەنـدیی نێوان ڕێكراوە حیزبییەكان دروسـتكەنەوە. لە تەممووزی ١٩٦٣ دا توانیمان دوو ژمارەی "طریق الشـعب"[110] چاپ بكەین. سـەرباری ئەو شـەپۆلە توندوتیژییەی بەرانبەر حیزب كرا، وەک دەربڕینێک كە هێشـتا ڕێكخسـتنەكانمان ماون، هەندێ بڵاوكراوە لە كوردسـتانی عێراق چاپكران. ئەوەی پاشترێ بوارەكەی بۆ حیزب كردەوە ئەو شەڕ ڕاگەیاندنەی سـەركردەكانی بەعس بوو كە لە دژی كوردسـتانی عێراقیان ڕاگەیاند، جا كە پێشـترێ چالاكیمان هەر لەسـەر ڕێكخسـتنەوەی دەسـتەكانمان چڕ ببووەوە، ئەو بڕیارەی ئەوان هەڵوێسـتی ئێمەی بەهێزكرد. ئیدی چالاكییە سـەربازییەكانمان لەگەڵ بزووتنەوەی نەتەوەیی كورد یەكی گرت.[111]

---

[108] _ لەو مامەڵانەی لەگەڵ شـیوعییان كرا، دەركردنی یاسـای ژمارە"١٣"یە كە دەڵێ شـیوعییەكان لە هەر جێیەک بوون لەناویان ببەن. بۆ زیاتر: "جریدة الجماهیر"، العدد ١، ١٣ شباط ١٩٦٣.

[109] _ دیدارێک لەگەڵ عەزیز محەمەد ٢٠١٥/٦/١٠.

[110] ڕۆژنامەی "طریق الشـعب" لە ماوەی نێوان كودەتای ٨ی شـوباتی ١٩٦٣ – ١٨ی تشرینی دووەمی ١٩٦٣ یەک ژمارەی لێ دەرچووە و ئەویش بەدەست نووسرابووەوە.

[111] _ دیدارێک لەگەڵ عەزیز محەمەد ٢٠١٥/٦/١٠.

ئێمە بووینە هاوپەیمانی پارتی دیموکراتی کوردستان و هەماهەنگیمان لەگەڵ کردن. ئەوەش جاری یەکەم نەبوو ، بۆ نموونە، دوای پێکهێنانی بەرەی یەکێتیی نیشتمانی لە ساڵی ١٩٥٧[١١٢]، ئێمە تاکە حیزب بووین کە سەری پەیوەندیی نێوان بەرەی یەکێتیی نیشتمانی و بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد بووین. مەبەستیشم لێرە پارتی دیموکراتی کوردستانە کە ئەودەمای چەندین دەستە و کۆمەڵەی کوردیی تێدابوو. لەکاتێکدا، حیزب و لایەنەکانی دیکەی عێراقیی ناو بەرەی یەکێتیی نیشتمانی نەک ئامادەنەبوون کاریان لەگەڵ بکەن، بەڵکو دانیشیان پێدا نەدەنان.[١١٣] لەلایەکی دیکەشەوە، لە ڕێی ڕێکخستنەکانی کوردستانمان و لە ڕێی ئەو پەیوەندییانەی لەگەڵ ڕێکخستنە کوردستانییەکانمان هەبوو، کاریگەرییەکی سیاسی و مانەویی گەورەمان هەبوو. ئاخر کە شتێکت لە جێیەک هەبوو تا پرد و ڕێگای هاوکاریی لەگەڵ ئەو لایەن یان ئەم لایەن پێ دروستکەی جیاوازە لەگەڵ ئەوەی هیچ شتێکت لەوێ نەبێ[١١٤]

---

[١١٢] _ بەرەی یەکێتیی نیشتمانیی لە ١٩٥٧ پێکهات بریتیبوو لە هەریەک لە حیزبی شیوعیی عێراقی و حیزبی وەتەنیی دیموقراتی و حیزبی بەعس و حیزبی بەرەی گەلی یەکگرتوو و هەندێ کەسی سەربەخۆ . بۆ زیاتر: عبدالرزاق الحسني، الجبهة الوطنية في العراق (جذورها التاريخية وتطورها)، بغداد، ١٩٧٨، ص٤٤.

[١١٣] _ لەبەر ئەو باوەڕانەی بانگەشەی جیابوونەوەیان دەکرد، هیچ کام لە حیزبی ئیستیقلالی عێراقی و حیزبی بەعس ئامادە نەبوون پارتی دیموکراتی کوردستان لە بەرە قبووڵ بکەن. بۆ زیاتر: سيف عدنان ارحيم ، المصدر السابق، ص٢٠١

[١١٤] _ دیدارێک لەگەڵ عەزیز محەمەد ٢٠١٥/٦/١٠.

# کودەتای عەبدولسەلام عارف و هەڵویست بەرانبەر سۆشیالیزم:

ڕاستییەکەی ئەو دۆخەی دوای کودەتای ٨ی شوباتی ١٩٦٣ باڵی بەسەر وڵاتدا کێشابوو، ئەوەندەی نەخایاند. ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ دابەشبوونی سەرانی کودەتا خۆیان، واتە لەنێوان بەعسییەکان و خەڵکی ناو سوپا. پاشانیش دابەشبوونی ڕیزەکانی حیزبی بەعسی بەدوادا هات، واتە باڵی مەدەنی و باڵی سەربازی، ئەوەش سەرباری دۆخی ئەو قەیرانە گشتییەی هەڵویستی توندی بەرانبەر حیزبەکانی دی لێکەوتەوە و، حیزبی شیوعی و ئەو شەڕەی کودەتاچییەکان بەرانبەر کورد بەرپایان کرد[١١٥] جگە لەو بارگرژییەی پەیوەندییان لەگەڵ کۆماری عەرەبیی یەکگرتووی سەرەتا پشتگیریی کودەتاچییەکانی کرد. ئەودەمی عەبدولسەلام عارفی یەک لە کۆڵەکەکانی کودەتای ٨ی شوباتی ١٩٦٣ بوو، دیتی هەلەکە هاتووە تا لەسای ململانێی کودەتاچییەکان هەڵکوتێتە سەردەسەڵات و ، دیتی کاتی گونجاویش بۆ ئەو کارەی ١٨ی تشرینی دووەمی ١٩٦٣یە. بەوەش قۆناغێکی دیکە بۆ شیوعییەکان هاتە پێش، بەڵام هێندەی پێشتریٚ قورس نەبوو، ئاخر دوای ئەوەی

---

١١٥ _ لەکاتی لێکنزیکبوونەوەی حیزبی بەعس و کورد تۆزێک پێش کودەتای ٨ی شوباتی ١٩٦٣، مەبەست لە کێشانەوەی هێزە سەربازییەکان لە باکووری عیراق ئەوەبوو کە کورد لە کودەتاچییەکان کەلی کەن، دوای ئەوەی کورد شۆڕشی خۆیان لە ١١ی ئەیلوولی ١٩٦١ ڕاگەیاندبوو، بەڵام ئەو مانگی هەنگوینییە ئەوەندەی نەبرد و ڕژێمی بەعس هەر خێرا لە ١٠ی حوزێرانی ١٩٦٣ شەڕی لە دژی کورد ڕاگەیاند. بۆ زیاتر: شكيب عقراوي، المصدر السابق، ص١٢٥.

عەبدولسەلام عارف جڵەوی دەسەڵاتی لە وڵاتدا گرتە دەست، تەنیا دژایەتیکردنی شیوعییەکان، لەگەڵ بەعسییەکان و قەومییەکان کۆی دەکردەوە. ڕەنگە تاکە شتی گۆرابوو ئەوە بووبێ کە لە هەڵمەتەکانی ئەشکەنجەی کاتی لێکۆڵینەوە لەگەڵ گیراوە شیوعییەکان ئەشکەنجەکان سووکتر کرابوون.[116]
ڕاستییەکەی و بە بڕوای ئێمە، کودەتا تەنیا گۆڕینی سەرباز بە سەرباز بوو. ئەوەش بەشێک بوو لەو ململانێیەی سەر دەسەڵاتی ناو دامەزراوەی سەربازیی خۆی خزاندبووە ناو ململانێی سیاسی. بەڵام بۆ ئێمە، لەبەر قەبارەی ئەو قەسابخانەیەی بەعسییەکان بەرانبەر ئێمە کردیان، بەلایە سووکترەکەبوو. لەبیریشمە ماوەیەک دوای کودەتا، نامەیەکم بۆ بنکەی دەرەوەی حیزب نووسی تا بزانم هەڵوێست بەرانبەر کودەتا چییە. وەڵامەکە ئەوەبوو کە دەبێ شێوازەکانی کارکردن سووکتر بکەین، کە لە ناوچە کوردییەکاندا خەباتی چەکداریمان دەکرد. لە لایەکی دیکەشەوە نەدەبوو ئەستۆ پاکی بدەینە ئەو ڕژیمە کە دەیویست خۆی لە تاوانەکانی بەعس دوورخاتەوە و خەریکبوو کردەوەکانی ڕژێمی پێشتریێ ئاشکرادەکرد. بەڵام ئەو ڕاستییەی ناکرێ نکۆڵیی لێ بکرێ ئەوەبوو کە ئەو ماوەیە هەناسە هەڵکێشانەوەیەکی هێزە سیاسییەکان بوو و، بەتایبەتییش بۆ شیوعییەکان. خەریکبوو ڕیزەکانی ڕێکخراوە

---

[116] ـ علي ناصر علوان الوائلي، عبدالسلام عارف ودوره السياسي والعسكري حتى عام ١٩٦٦، رسالة ماجستير غير منشورة، المعهد العالي للدراسات السياسية والدولية العليا، الجامعة المستنصرية، ٢٠٠٥، ص١٠٣.

حیزبییەکان چالاکییان تێدەکەوتەوە و پەیوەندییەکی فراوان دەگەڕایەوە ناو شیوعییەکان و ڕێکخستنەکانیان، کە تەنانەت لە ژێر دۆزەخی هێرشی سەر ڕێکخستنەکانیش هەر نەپسابوو. دوای ئەوەش، پەیوەندی لەنێوان باقر ئیبراهیم لە باشوور و عومەر عەلی شێخ لە ناوچە کوردییەکان هەر مابوو. یەک لە ئامانجەکانی وای لە ڕژێم کردبوو چاوپۆشی لە چالاکییەکانی شیوعییان بکا هەوڵی ئەوەی بوو بڵێ لە ڕژێمی پێشتری جودایە، ئەگەرچی عەبدولسەلام[117] خۆی هاوبەشی کودەتای ٨ی شوبات بوو و پشتگیریی لەناوبردنی شیوعییەکانیشی دەکرد.

لێرەدا، خاڵێکی یەکجار گرنگ هەیە، ئەویش ئەوەیە کە عارف خەریکبوو خۆی لە یەکێتیی سۆڤیەت هەڵدەسوو تا پشتیوانیی سەربازی و هونەریی و تەکنیکیی دەستکەوێ، ئەوەشی لە سایەی ئەو هەڵمەتی گرتن و ڕاوەدوونان و لە سێدارەدانانە بۆ دەستەبەر نابێ کە بەرانبەر شیوعییەکانی دژی بەعسییەکان ڕاپەڕێبوون، دەکرا . جا ڕژێم سەرباری ئەوەی هەندێ شیوعیی لە گرتووخانە و بەندیخانەکان بەردا و، حەرەس قەومیی هەڵوەشاندەوە و هەندێ بەڵگەنامەی بڵاوکردەوە کە تاوانەکانی ئەوانی مەحکووم دەکرد و، هەندێک لەوانەیشی گرت کە ئەودەمی سەروکاری حەرەس قەومییان دەکرد و، ئەوەشی لە خۆشەویستیی شیوعییان نەبوو بەڵکو لە ترسی

[117] _ دیدارێک لەگەڵ عەزیز محەمەد ٢٠١٥/٦/١٠.

ئەوەی بوو نەکا حەرەس قەومی بەرەوڕووی دەسەڵاتی عارف ببنەوە.[118]

سیاسەتی نزیکبوونەوەی عارف و یەکێتیی سۆڤیەت چڵەپۆپەکەی هەندێ چاکسازیی ناوخۆ بوو لەژێر ڕواڵەتی بەرەو "سۆشیالیزم" چوون. دامەزراندنی "یەکێتیی سۆشیالیزمی"ی ڕاگەیاند، [119] وەک هەوڵێکی لاساییکردنەوەی ئەو ڕێوشوێنانەی جەمال عەبدولناسر لە میسر کردبوونی. ڕاگەیاندنی یەکێتیی سۆشیالیستییش، تەمومژێکی فیکریی لەناو حیزبدا لەدەوری خۆی دروستکرد، هەندێک یار و هەندێک نەیاری بڕیارە "سۆشیالیستی"یەکان بوون. جا دوای کۆبوونەوەی لیژنەی مەرکەزی، چڵەپۆپەی مشتومڕەکانی ناو حیزبی شیوعییش گەیشتە ڕاگەیاندنی بەڵگەنامەیەکی فیکریی سیاسیی ناوی لێنرا هێڵی ئابی ١٩٦٤ و، پشتگیریی لە یەکێتیی سۆشیالیستی کرد.[120]

---

[118] _ علياء محمد حسين الزبيدي، العهد العارفي في العراق ١٩٦٣-١٩٦٨، دار ومكتبة عدنان، ٢٠١٣، ص٨٥-٨٦

[119] _ عەبدولسەلام عارف باوەڕی بە ڕێچکەی سۆشیالیستی نەبوو، بەڵام وەک ئەوانەی نزیکی بوون باس دەکەن هەوڵێک بوو بۆ تواندنەوەی هێزە حیزبییەکان و بەدەستەوەگرتنی سەرەداوەکان ، ڕۆژگاریش بە شکستی تاقیکردنەوەی یەکێتیی سۆشیالئستی ئەوەی سەلماند. بۆ زیاتر: عبدالكريم فرحان، حصاد ثورة(مذكرات تجربة السلطة في العراق ١٩٥٨-١٩٦٨)، دار البراق، دمشق، ١٩٩٦، ط٢، ص .ص ١٣٢-١٣٣.

[120] _ باقر ئیبراهیمی لە کادیرەکانی ناو بەغدایە بووە ، لە بیرەوەرییەکانیدا باسی ئەوەی دەکا دوای دەرچوونی بڕیاری دروستکردنی یەکێتیی سۆشیالیستی، کادیری

# عەزیز محەمەد لە ١٩٦٤ دەبێتە سکرتێری حیزبی شیوعی؛

حیزبی شیوعیی عێراقی، لەوەتی لە ٨ی شوباتی ١٩٦٣ سەرکردایەتیی لە سێدارە درابوو، بە گەلێ بارودۆخی تەنگ و ناخۆشدا تێپەڕی. سەرباری ئەو لەناوبردنە فراوانەی بۆ سەرکردایەتی و کادیر و ئەندام و لایەنگرانی کرا، بەشێکیشیان بە دەستبەسەری و گیراوی مانەوە. هەندێکیشیان پەنایان بۆ ناوچە کوردییەکان برد و، هەندێکیشیان لە دەرەوەڕا و دوور لە گورزی ئاسایش دەستیان بە بەڕێوەبردنی چالاکییەکانی حیزب کرد، بەتایبەت لە پراگ و مۆسکۆ. کەناڵی پەیوەندیکردن بە ناوخۆوە هەبوون و، ڕۆژنامەی "طریق الشعب" بە نهێنی ناوەناوە دەگەیشتە دەست خوێنەران، ئەویش بەپێی ئەو بارودۆخەی حیزبی پێدا تێدەپەڕی و دەکرێ ناوی لێنێین هەڵکشان و داکشان، تا ئەوەی کۆبوونەوەی پراگ لە ١٩٦٤ بەسترا و ئەوەش یەکەمین کۆبوونەوەی دوای ئەو گورزەبوو

---

سەرکردایەتی لەبەردەم دوو بڕیاردا بوو، یەکەمیان لە ناوەوە کە ئارەزوو و فشاریکی توندی هەمواری سیاسی و ئاڕاستەگۆڕییەکی توندی ئەو وشکییەی رووخانی ڕژێمی دەویست بۆ داوای مامەڵەکردن و دیداری ڕژێمی عارف بوو و، ڕەوتی دووەم لەدەرەوەرابوو و دەربڕێ باوەڕی زۆرینەی ئەو کادیرانەی سەرکردایەتی بوو کە لە دەرەوە کاریان دەکرد، جا چ ئەوانەی لەدەرەوە مانەوە و چ ئەوانەی وردەوردە خزەیان دەکردەوە ناو کاری نهێنیی ناوەوە. قەبوولکردنی ئەو هێڵ و ئاراستەیە زۆر پێویست بوو، بەڵام تاکە خەوشی لەوەیدابوو بێ ئامادەکارییەکی فیکریی پێویست و گفتوگۆیەکی کراوە و لەسەرەخۆی نێوان کادیرانی حیزب بوو و ، ئەو داواکارییانەی تێدا نەبوو کە ئاستی گونجاوی ماف و ئازادییە دیموکراتییەکانی ئەو بارودۆخەی دیاری دەکرد. بۆ زیاتر: باقر ابراهیم ، المصدر السابق، ص ١٣٠.

كە لە ٨ی شوباتی ١٩٦٣ بەری كەوت و لەوێ گفتوگۆ لەسەر كۆمەڵێ كێشەی ناوخۆی حیزب كرا و، لەوانەش سكرتاریەتی حیزب دوای لە سێدارەدانی سەلام عادل و ڕكابەریی دووان لەسەر پۆستەكە كە عەزیز محەمەد و عەبدولسەلام ئەلناسر[١٢١]ی بوون.

جا ئەو ئەندامانەی مەكتەبی سیاسیی حیزبی شیوعیی عێراقیی بە زیندوویی مابوونەوە، ڕێنمایی چالاكییەكانی حیزبیان دەكرد، بەتایبەتییش عەبدولسەلام ئەلناسری. ئیدی پێویستبوو كۆبوونەوەیەكی لیژنەی مەركەزی بكرێ تا بابەتی سكرتاریەتی حیزب یەكلا بكرێتەوە، كە دوای لەسێدارەدانی حوسێن ئەحمەد ئەلڕەزی "سەلام عادل"ی سكرتێری حیزب بە بەتاڵی مابووەوە. ئیدی ئەو ئەندامانەی لیژنەی مەركەزی و مەكتەبی سیاسیی لە ژیاندا مابوون خۆیان بۆ كۆبوونەوەیەك ئامادە دەكرد بۆ ئەوەی حیزب ڕێكبخەنەوە، لەوانەش هەڵبژاردنی سكرتێری حیزبی شیوعیی عێراقی. ئیدی زۆر ناو خرانەڕوو تا ببنە سكرتێر. لەوانەش زەكی خەیری و عەبدولسەلام ئەلناسری و منی كە لە ڕاستیدا دژی خۆ كاندیدكردنێ بووم، چونكە پێموابوو بۆ سەركردایەتیی حیزبێكی وەك حیزبی شیوعیی عێراقی ناشێم.[١٢٢] ئاخر من، سەرباری ئەوەی پێشترێ باسم

---

[١٢١] _ باقر ابراهیم، المصدر السابق، ص ١٣١-١٣٢.

[١٢٢] _ سابت حەبیب ئەلعانی باسی بارودۆخی هەڵبژاردنی عەزیز محەمەد دەكا بۆ سكرتێریی حیزب.

کرد کە حیزبی شیوعیی عێراقی نەخوێندەواریی منی نەهێشتا، بەڵام ئەو ڕۆشـــنبیرییە مارکســـییە پێویســـتەم نەبوو بمکاتە شـایانی ئەو پۆستە. بەڵام دەنگدانەکە لە بەرژەوەندیی من بوو تـــا ببمە ســـــکرتێری حیزب. دەکرێ ئەو هەڵبژاردنەش بە هاوگونجانێک دابنێین[122].

کەچی حوسێن سوڵتان سوببیی کادری حیزبی شیوعی دەڵێ، هەڵبژاردنی عەزیز محەمەد بۆ ســـکرتێریی حیزبی شـــیوعیی عێراقی، ڕەهەندێکی دیکەی لەپشـــتەوە بووە و پێموایە عەزیز محەمەد بۆیە هەڵبژێردرا چونکە بەدرێژایی ژیـانی حیزبیی نەچووبووە ناو ململانێی فیکریی ئاشکرا و، خووی گشتییشی، لە ڕێی دۆزینەوەی چارەســـەریی مامناوەندی هاوگونجانێکی تێدابوو و، ڕوو لە ئاشـــتەوایی و پێکهاتنە، ســـەرباری ئەوەش ژمـــارەیەک ســـــەرکـــردەی حـــیـــزب لە لـــیـــژنەی مەرکەزی

---

لە کۆبوونەوەکەدا ســـەرکردایەتییەکی نوێ هەڵبژێردرا و چاوەکان ســـەرنجیان لەســـەر هەردوو هاوڕێ عەزیز محەمەد و ســـەلام ئەلناســـری بوو و، عەزیز محەمەد بنەبڕ ڕەتیکردەوە خۆی کاندید بکا و، سەلام ئەلناسریی بۆ ئەو پۆستەی سکرتێر کاندید کرد، جا مکوڕیی هاوڕێ عەزیز محەمەد لە خۆ کاندید نەکردن، بەرانبەر مکوڕیی هاوڕێیان لەســـەر کاندیدکردنی وایکرد بچمە ناو بابەتەکەوە و گوتم ئەگەر هاوڕێ عەزیز محەمەد ڕەتیدەکاتەوە ئیدی پێویســـت ناکا زۆری لێ بکەن تا خۆی بۆ ئەو پۆســـتە کاندید بکا، ئاخر ئەو پۆســـتە ئەرکێکی حیزبی و کارێکی حیزبییە، ئیدی قســـەکانم نارەزایی هاوڕێ عامر عەبدوڵڵای لێکەوتەوە کە لەســـەر کاندیدکردنی هاوڕێ عەزیز محەمەد گەرموگوڕ بوو و نیمنیگای ئەوەی دا کە دیارترین سیفەتی سکرتێر ئەوەیە دەبێ لە مامەڵەدا مرۆیی بێ و پێچەوانەی هاوڕێ ســـەلام ناســـرییە کە بە توندوتیژ ناســـراوە و، عامر عەبدوڵلا هاوڕێ عەزیز محەمەدی بە باشـــترین کاندید دانا.... جا عەزیز محەمەد بە زۆرینەی دەنگ بۆ سـکرتێریی لیژنەی مەرکەزی هەڵبژردرا. بۆ زیاتر: ثابت حبيب العاني، المصدر السابق، ص٣٣٩.

[122] _ دیدارێک لەگەڵ عەزیز محەمەد ٢٠١٦/٦/١٠.

لادرابوون"کوتلەی چواری" لە کۆبوونەوەی ئاب شـــکۆیـان درایەوە، جا لەبەر نیشـتەنیی ڕابردوو نەدەکرا کەسـێک لەوانە بۆ ئەو پێگەیە بهێنرێتە پێشـــەوە و، چونکە عەبـدولســـەلام ئەلناسـرییش کاندیدی مەکتەبی سـیاسـی بوو و عەزیز محەمەد ئەندامێکی تەواوی مەکتەبی سـیاسـی بوو، ئیدی هێنانەپێشـەکە بەلای عەزیز محەمەدیدا بوو نەک عەبدولسەلام ئەلناسری"[124]

---

[124] _ خالد حسين سلطان، اوراق من حياة شيوعي حسين سلطان صبي ١٩٢٠-١٩٩٢، دار كنعان، دمشق، ٢٠٠٧، ص١٠٦.

# كۆبوونەوەی ١٩٦٥ و
# دروشمی كاری یەكلاكەرەوە:

سەرباری هەموو كۆسپ و تەگەرەكان، حیزب لەلایەك بەخێراییەكی پترەوە كاری بۆ ڕێخستنەوەی ڕێكخستنەكانی دەكرد و، لەلایەكی دیكەشەوە پێداچوونەوەی بۆ هەڵسەنگاندنی حوكمی عارف دەكرد. ئیدی حیزب لە ١٨ی نیسانی ١٩٦٥ بڕیاریدا واز لە هێڵی ئابی ١٩٦٤ بێنێ، چونكە پێیوابوو هێڵێكی نەرمی نوێنە بەرانبەر عەبدولسەلام عارفی ڕژێمی دەسەڵاتەكەی یەك هەنگاویش بۆ چارەسەركردنی ئەو شتانە بەرەوپێش نەچووبوو كە كودەتای ٨ی شوبات وێرانی كردبوو. هەمووان لەسەر ئەوەی هاوڕابوون ڕێچكەیەكی كاری یەكلاكەرەوە بگیرێتەبەر تا بزاوتێكی كودەتایی بەسەر دەسەڵاتی عارفدا بكرێ. جا ئەو بڕاردەیە دەربارەی میكانیزمی كاری یەكلاكەرەوە هەر لەژێر گفتوگۆدا بوو، چ لە ڕێی سوپای بەسەر ئەو هێزانەدا داخرابوو كە لایەنگری عارف بوون یان لە ڕێی جەماوەری كە دوای ٨ی شوباتی ١٩٦٣ گەلێ ڕۆڵەی خۆی لەدەستدابوو[١٢٥]. جا حیزب سەبارەت بەو ڕێچكەیە، دەستی بە هەڵمەتێكی ڕۆشنبیری كرد. پلانی ئەو كارەشمان پشتی بەوەی دەبەستا دووبارە ڕێكخستنەكانمان بە سوپاوە ببەستینەوە، تا بە پلەی یەكەم پشت بە ئەفسەرە بچووكەكان و سەربازان ببەستێ. ئەوەش دەگەڕێتەوە سەر ئەو قەناعەتەی

---

١٢٥ - فیصل الفؤادي، المصدر السابق، ص٧٧.

هیچ کارێکی یەکلاکەرەوە، ئەگەر سوپا بۆ یەکلاکردنەوەی دەستی نەخاتەناوێ، سەرناکەوێ. لە هەندێ قۆناغی، ئەوەندە دوورنین، ئەوە لە عێراق ڕوویداوبوو، لەوانەش بزاوتی ۱۹٦۳ و ۱۹٤۱، تا دەگاتە ١٤ی تەممووزی ۱۹٥٨ و، ئەو کودەتایەی، لە ٨ی شوباتی ۱۹٦۳سەرباز پێشڕەوییان کرد، سەرباری ئەوەی شیوعییەکان پێگەیەکی جەماوەریی بەرفراوانیان هەبوو و لایەنگری قاسمیش بوون و، هەر بەڕاستییش ئەو لایەنگیرییەی شیوعییەکان لەو بەرگرییەدا بەرجەستە بوو کە لە گەلێ ناوچەی عێراقدا بەرانبەر کودەتاچییەکان نواندیان و، بەتایبەت لە بەغدای بەرگرییەکە لە ناوچەی باب ئەلشێخ – گەڕەکی کوردان و چەند ناوچەی دی چڕ ببووەوە. ئیدی گەیشتینە ئەو قەناعەتەی کاری یەکلاکەرەوە لە دالانەکانی سوپادا دەکرێ.[126]

جاسم حەلوائیی ئەندامی لیژنەی مەرکەزیی حیزبی شیوعیی عێراقی، ئاماژە بەوەی دەکا کە هەوڵەکەی عارف عەبدولڕەزاق لە ١٥ی ئەیلوولی ۱۹٦٥ وایکرد لەناو ڕیزەکانی حیزبدا پتر بانگەشە بۆ کاری یەکلاکەرەوە بکرێ و ، ئەوەش سەرکردایەتیی ناوەوەی ناچارکرد کۆنگرەیەک ببەستێ و ٢٥ ئەندام ئامادەی بوون و تەوەری کۆبوونەوەش ئەو خالانەبوو:
١_ بە ئاشکرا تانە لە هێڵی ئاب درا.

[126] _ زكي خيري وسعاد خيري، المصدر السابق، ص ٤٣٨-٤٣٩.

٢_ لە کۆبوونەوەکەدا گفتوگۆی سەندنەوەی ئەندامێتی، مەکتەبی سیاسی و لیژنەی مەرکەزی لە هەندێ کادیرانی حیزبی شیوعی کرا، لەوانەش کادیرانی دەرەوەی عێراق هی لە عەزیز محەمەدی.

٣_ بڕیاری کاری یەکلاکەرەوە درا: دوای گفتوگۆیەکی فراوان، کۆبوونەوە بە زۆرینەی هەرەزۆری دەنگ بڕیاری پلانی کاری یەکلاکەرەوەی دا و، بڕیار درا یەکەی مەدەنیی سەربازی بۆ پشتیوانیی کودەتا دروست بکرێن و ئەو ڕێکخستنەش ناوی لێنرا "هێڵی حوسێن" و بڕیاردرا پشتیوانیی هێزەکانی دیکەی وەک کورد و قاسمییەکان و قەومییەکان وەدەست بهێنرێ.

کە هەواڵی کۆبوونەوەکەی بەغداش گەیستەجێ، عەزیز محەمەد لە پراگ لە ١٨ – ١٩ی تشرینی دووەمی ١٩٦٥ گفتوگۆی لەسەر کرد و، عەزیز محەمەد لە کۆبوونەوەکەدا ڕوونیکردەوە کە زۆربەی خەملاندن و سیاسەتەکانی هێڵی ئاب لە ژیان نەهاتنەجێ و، هەڵەبوون و لەکاتێکدا ئاگاداریی ئەوەی دا کە پێشبڕکێی خستنەرووی هەڵەکان نەکرێ و، دووپاتیکردەوە دەبێ هاوڕێیانی حیزب لە ڕەخنەگرتندا ئازادبن و تێبینیی ئەوەی کرد کە بارودۆخێکی هەلاوێردە کۆبوونەوەی تشرینی یەکەمی بەغدای ناچارکرد ئەو گۆڕانکارییانە لە لیژنەی مەرکەزیدا بکا و، ڕەخنەیشی لەوەی گرت دەستەی سەرکردایەتی لەکۆبوونەوەدا لاوازبووینە و پەلەیان لە کۆبوونەوە کردووە"[١٢٧]

[١٢٧] _ عزيز سباهي، المصدر السابق، ج٢، ص ٥٥.

لەکاتێکدا، عەزیز ئەلحاجی ئەندامی مەکتەبی سیاسیی حیزبی شیوعی و بەرپرسی بەغدای ڕێکخستنەکانی حیزبی، لە هەوڵی پێکهێنانی باڵی سەربازی بوو ، کە پێیدەگوترا هێڵی حوسێن و تەنیا هەندێ ڕێکخستنی بچووکی کەمبایەخ بوون، ئەوا عەزیز محەمەدی سکرتێری حیزبی شیوعیی عێراقی بە کەمدوویی ناسرابوو، پێموابێ باوەڕی بەو هەموو قسانە نەبوو کە لە کاری یەکلاکەرەوەدا هاتبوو.[128]

ئاخر دوای دۆخە مژاوییەکەی ناو حیزب، هەڵمەتی ڕۆشنبیرکردن لەناو ڕێکخستنەکانی حیزبی شیوعیی عێراقی دەستی پێ کرد و بە پلەی یەکەمیش بۆ دروستکردنی بنچینەیەک بوو ، دوای ئەو نائومێدییەی لە ئەنجامی کودەتای ٨ی شوباتی ١٩٦٣ تووشی جەماوەر ببوو، تا بایی ئەوەندەی بکا کودەتایەکی پێ بەرپا بکرێ. ئەو نائومێدییەی لە بێتوانایی شیوعییانەوە پەیدابوو، ئەو کاتەی لە چڵەپۆپەی هێزی جەماوەریدابوون، نەخاسمە دوای شۆڕشی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨، کە ئەو دەمی نەیانتوانی دەسەڵات وەرگرن و بەتایبەتیش کە قاسم لەو هاوپەیمانییە رانەگەیەندراوەی لەگەڵ شیوعییان هەیبوو پەژیوان ببووەوە. ئەو کێشەیە، ئەو دەمای، حیزب و سەرکردایەتییەکەی خستە گێژاوی بێنە و بەردەیەکی دواترێ دوای هەڵکشانەوەی ڕەوتی شیوعی زۆربەی لایەنگرەکانی

[128] ـ عزيز الحاج ، رحلة مع تحولات مفصلية(اوراق في مسيرتي الفكرية والسياسية)، مكتبة عدنان، بغداد، ٢٠١٢، ص٥٩.

لەدەستـــتـدا. وامـان دانـا ئەو هەنگـاوەی ڕوشـــنبیرکردنی زەمینەیەکی پتەوی ئەوتۆ دەبێ کە لە ڕێیەوە دەتوانین پشتیوانیی جەماوەر بۆ هەوڵێک بەدەستبێنین کە شیوعییەکان لە داهاتوودا بیدەن.[١٢٩]

[١٢٩] _ دیدارێک لەگەڵ عەزیز محەمەد ٢٠١٥/٥/٢٢.

## جیابوونەوەی عەزیز ئەلحاج لە ١٩٦٧:

حیزبی شیوعیی عێراقی تووشی گەلێ ڕاهەژاندنی توند بووە، جارێک بە جودابوونەوە و جارێک بە ڕاوەدوونانی ڕێکخستنەکانی و جارێکیش بە لەسێدارەدانی سەرکردەکانی. ئەوەش شوێنەواری ئەوتۆی بەسەر حیزبەوە بەجێهێشت کە سڕینەوەیان مەحاڵبوو. سەرباری ئەوەش حیزب لە چالاکی نەکەوت. ئاخر لە هەموو ڕووداوێکی شیوعییەکان تووشی هاتن، شیوعییە عێراقییەکان توانییان ڕێکخستنەکانیان کشتەک بکەنەوە و، ڕێوجێیەکانیان سەرلەنوێ ڕێکخەنەوە و دیسان ئەو واقیعە ڕاکەنەوە سەرپێیان کە لە قۆناغەکانی مێژووی دووردرێژیان تووشی ببوون، ئەویش لە سایەی کاری نهێنی و گیرانی ناو بەندیخانەی ڕژێمە پاشایەتی و کۆمارییەکاندا بەسەریان برد.

بەڵام جیابوونەوەی ١٩٦٧ ئەو دابڕانە ئاساییە نەبوو کە چاوپۆشیی لێ بکرێ، چونکە ئەوجارەیان بەدەستی بەرپرسی ڕێکخراوەکانی بەغدای حیزبی شیوعیی عێراق و یەک لە سەرکردە دیارەکانی کرابوو، ئەویش عەزیز ئەلحاج بوو، کە پێدەچوو لە هەموو سەرکردەکانی حیزب بە هەڵپەتر بووبێ. ئاخر ئەو، بەپێی وەسفی خەڵکێکی زۆری هاوسەردەمی خۆی، پێیوابوو لە سەرکردایەتیکردنی حیزبدا لە هەمووان لێوەشاوەترە و، ئەو هەوڵەی جیابوونەوەی خۆیشی، لە ١٧ی ئەیلولی ١٩٦٧ی بە بزاوتێکی ڕاستەڕێکردنەوەی ڕزگارکردنی

حیزب دانا له‌ده‌ست ئه‌و سه‌رکردایه‌تییه راستڕه‌وه‌ی باوه‌ری به کاری شۆڕشگێڕی نییه."[130]

چونکه ئه‌لحاج، لێکدانه‌وه‌یه‌کی زۆر ڕوونی بۆ جیابوونه‌وه‌که‌ی هه‌بوو، ده‌یگوت ده‌گه‌ڕێته‌وه بۆ "ئه‌و جیاوازییه ناوخۆییانه‌ی سه‌باره‌ت به‌و شێوازی خه‌باته هه‌بوو که ده‌بێ بۆ رووخاندنی ڕژێم و دامه‌زراندنی ڕژێمێکی دیموکراتی به‌کاربهێندرێ، ئه‌وا هه‌مووان و بێ هه‌ڵاوێردن، له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی کۆک بوون که تاکه ڕێگا به‌کارهێنانی شێوازی خه‌باتی نائاشتییانه‌یه و، ناومان لێنا کاری یه‌کلاکه‌ره‌وه و حیزبیش پێشتری له‌سه‌ر ئه‌و باوه‌ڕه‌ی نه‌بوو"[131].

له کاتێکدا، باقر ئیبراهیمی کادیری شیوعی و نزیک له ڕێکخستنه‌کانی به‌غدای کاتی جیابوونه‌وه‌، ده‌ڵێ چه‌ند مشتومڕ و داواکارییه‌ک هه‌بوون و له‌و بابه‌تانه‌ی خواره‌وه‌دا کۆده‌بوونه‌وه‌:

١ــ وه‌رگرتنی ده‌سه‌ڵات ئه‌رکی حیزبی شۆڕشگێڕه‌.

٢ــ بانگه‌شه بۆ سه‌ربه‌خۆیی بزووتنه‌وه‌ی شیوعیی عێراقی"له‌وه‌یدا مه‌به‌ست یه‌کێتیی سۆڤیات بوو".

٣ــ ده‌بێ کێشه نه‌ته‌وه‌ییه‌کان و کێشه‌کانی یه‌کێتی و هه‌ڵوێست به‌رانبه‌ر کێشه‌ی فه‌له‌ستین و بڕیاری دابه‌شکردن چاویان پیدا بخشێندرێته‌وه‌.

---

[130] ـ حنا بطاطو، المصدر السابق، ج٣، ص٣٨٣-٣٨٤.

[131] ـ عزيز الحاج، رحلة مع تحولات مفصلية، ص٥٨-٥٩.

٤_ توندوتیژی شێوازی خەبات بێ.[١٣٢]
من لە عەزیز ئەلحاج نزیکبووم، لەبەر ئەوەی نا ئەندامی یەک حیزب بووین، بەڵکو لەبەر ئەوەی ماوەی دەیەیەکمان لە بەندیخانە بەیەکەوە بەسەربرد. زۆرجارانیش لە یەک زینداندا لێمان پاڵدەدایەوە، بەڕای من ئەو بانگەشەکەری سەرەکیی ئەو جیابوونەوەیە نەبوو، ئاخر ئەو ئەندامی مەکتەبی سیاسیی حیزبی شیوعیی عێراقی بوو. من پێموایە خەڵکێکی ناو ڕێکخراوی بەغدای ئەلحاج سەرۆکایەتیی دەکرد، بۆ ئەو جیابوونەوەیە پاڵیان پێوەنا.
ڕەنگە عەزیز ئەلحاج لەو بارودۆخەی ناڕازی بووبی کە حیزبی پێدا دەڕۆیی و پەیوەستی بانگەشەی کاری یەکلاکەرەوە بوو. ئا لەو بارودۆخە تەنگەی حیزب دووچاری ببوو، ئەلحاج و کۆمەڵێک ڕێکخستنی بەغدا جودابوونەوە، لەوانەش ئەحمەد مەحمود ئەلحەلاق و کازم سەفار و عەبدولحەمید سافی و مەتی هیندۆ و کەسانی دیکەش. جا لەناو ئەو شتانەی لەو جیابوونەوەیە کەوتنەوە بانگەشەی دەستە و تاقمەکەی ئەلحاج بوو بۆ بابەتێکی دیکە، واتە خەباتی چەکداری لە هۆڕاوەکان. خالید ئەحمەد زەکیی تێکۆشەر لەو کارە چەکدارییەدا بەشدار بوو. لێرەدا بابەتێک هەیە دەبێ ئاماژەی پێ بدرێ، ئەویش ئەوەیە کە کەس ناتوانێ گومان لە پاکی و تێکۆشەریی ئەوانە بکا، تەنانەت ئەگەر لەگەڵیشمان هاوڕا نەبن.

---

[١٣٢] _ باقر ابراهیم، المصدر السابق، ص ١٤٢.

ئەوانی، کە ڕێیەکانی ناوچەکەیشـــیان نەدەزانی، ڕوو یان لە هۆراوەکان کرد. لەکاتێکدا جوولەی پشـــتیوانان پشـــت بە جوگرافیای ناوچەکە و شـــوێنە ســـروشـــتییەکانی و تەکتیکی گونجاوی ڕووبەڕووبوونەوەی دەسـەڵات دەبەستێ، بەخۆی و بە هێزە ســـەربازییە بێ کەموکوورییەکانی. ئیدی هێزەکانی حکوومەت دەورەی گرتن، ئەوەی شەهید بوو و ئەوەیدی گیرا. ئاخر ئارەزووی شـــۆڕشـــی چەکداری پێویســـتی بەوەیە بارودۆخەکەی پێگەیشتبێ.[133]

بابەتی دووەمی کە دەبێ باسی بکرێ ئەوەیە، خەباتی چەکداری پێویســـتی بە پێداویســـتیی تەکتیکی و خاڵی پەیوەندیی نێوان پێگەکانی چەکداران و بنکەی ســـەرەکی هەیە تا پەیوەندییان بەردەوام بێ و بەردەوامیش چەک و ئـازووخەیـان بگـاتێ، ئەوەش بنەمـایەک بوو لە نـاوچەی هۆراوەکـانـدا دەســـت نەدەکەوت. دەکرێ هەوڵەکەی هۆراوەکـانی عەزیز ئەلحـاج بەهەوڵە ســـەرنەکەوتووەکـانی گیڤـارا بـچـوێـنـین دوای بەدەســـتهێنانی ســـەرکەوتن لە قۆناغەکانی بەرایی خەباتی لە کووبا. ئەلحاج وای مەزەندە دەکرد کە هێشـتا زیتی و چالاکیی دەیەی چلەکانی و ئەو شـــۆڕشـــگێڕییەی ماوە کە لەنزیکەوە بەوەوەم دیـتـبـوو ئەو کـاتەی لە یەک شـــیشـــەبەنـدی بەنـدیخـانەدابووین. ئەو بە بەرگریکردنی لەو بـاوەڕانەی هەیبوون لە مـردنـیـش نەدەتـرســـا. بەڵام لووتـوبـزووت بەرەوڕووی بـارودۆخە گشـــتییەکەی نـاوچەکە بـووەوە،

---

[133] ـ دیدارێکلەگەڵ عەزیز محەمەد ٢٠١٥/٦/١٢.

سەرباری هەڵوێستی خەڵکەکەی ناوچەکەی هیچ ڕێی پەیوەندییەکیان لەگەڵ ڕێکخستنەکانی ئەلحاج نەبوو.[١٣٤]
عەزیز ئەلحاجیش، کە ئاماژە بۆ ئەوەی دەکا "خاڵێکی گرنگ هەیە و دەبێ روونبکرێتەوە، ئەگەرچی ئێمە پێشتر لە ڕۆژنامەی نهێنیی حیزبی سەرکردایەتیی ناوەندی ڕوونمان کردبووەوە، ئەو خاڵەش تۆمەتبارکردنی حیزبی سەرکردایەتییە، جارێک بە "ماو"یبوون و زۆرجاریش بە گیڤاراییبوون، بەڵام ئێمە دوای ڕێچکەی سەربەخۆبوونی بزووتنەوەی شیوعی کەوتین"[١٣٥] ئیدی بەوەی ئەو تۆمەتانە ڕەتدەکاتەوە کە ئاڕاستەی دەکران.

---

١٣٤ _ دیدارێکلەگەڵ عەزیز محەمەد ٢٠١٥/٦/٢٣.

١٣٥ _ عزيز الحاج، رحلة مع تحولات مفصلية، ص٦٠.

## بەرەوڕووبوونەوەی هەردوو ڕێکخراوە شیوعییەکە،

لە سایەی ئەو بارودۆخە نوێیەی لەگەڵ جیابوونەوەی عەزیز ئەلحاج هاتە پێش، ئەوجارەیان حیزبی شیوعیی عێراقی بووە دوو کوتلە؛ یەکیان تاقمی لیژنەی مەرکەزی و عەزیز محەمەدی سکرتێری و، ئەویدی تاقمی سەرکردایەتیی مەرکەزیی سکرتێرەکەی عەزیز ئەلحاج بوو. جا کارەکە هەرچۆنێک بێ، هەردوو کوتلە ڕکابەرە نوێیەکە هەر یەکە و ڕێچکەی تایبەت بەخۆی گرتەبەر. تاقمی لیژنەی مەرکەزی، لە ڕێوشوێن و بڕیارەکانیدا، هەڵوێست و بیروڕایان هەمان هەڵوێست و بیروڕای حیزبی شیوعیی سۆڤیەتی بوو و لەسەر ڕێنوێنییەکانی تیۆری مارکسی- لینینی دەڕۆیی. لەکاتێکدا عەزیز ئەلحاج، لای خۆیەوە خەریکبووو ڕێچکەی حیزبی شیوعیی چینیی دەگرتەبەر کە "ماو تسی تۆنگ" ئەودەمی خەریکبوو هەرمێنی دەدایە و، دژی ڕێچکەی یەکێتیی سۆڤیەتیش دەوەستایەوە.[١٣٦]

ئیدی، ئەوانەی جوداببوونەوە خەریکی ئەوەی بوون لە دەستپێکێکی چەپڕەوییەوە ڕەخنەیان لە ئێمە دەگرت و، بەڕاستڕەوی تۆمەتباریان دەکردین. جا عەزیز ئەلحاج خۆیشی هەندێ جاران دەکەوتە هەڵوێستی هەرە ڕاستڕەوییەوە. هەڵوێستی ئێمەی سیفەتی ڕاستڕەویی دەدرایە، ڕەنگە هیی ئەو بارودۆخە بووبی کە لەو ماوەیەدا حیزبی پێدادەڕۆیی. وەک نموونەیش، هەڵوێستمان

---

[١٣٦] _ زكي خيري وسعاد خيري، المصدر السابق، ٤٤٢-٤٤٣.

بەرانبەر خۆپیشـــاندانی یەکی ئـایـاری ١٩٥٩ی بە یەک ملیۆنی ناسـرابوو و، لەویّ حیزب هێزی خۆی خسـتەروو. ئەودەمی حیزب حیســـــابی بۆ کـاردانەوەی لایەنەکەی دیکە نەکردبـوو. ئەو کاردانەوانەی پاشـەکشــەی عەبدولکەریم قاســمیان لە ڕێچکەکەی پێشـتریّی لێکەوتەوە و دابران لە شـیوعییەکانیش و، ئیدی شـک و گومان لای قاسـم بەرانبەر شـیوعییەکان گەورەتر بوو نەکا هەوڵی وەرگرتنی دەسەلات بدەن.[137]

جا ئەو کارەش وامان لێدەکا لەکۆمەڵیّ ســـەروبەرکردنی خۆمان وردەکاربین و، لێکۆڵینەوەیەکی سەررێژ بۆ واقیعی سیاسیی گشتی بکەین و، هەڵپەی شـۆڕشـگێڕی وامان لیّ نەکا هیچ حیسـابێک بۆ ئەنجامەکان نەکەین.

ڕەنگە بدۆڕێین و زیانمان لیّ بکەویّ و، بگرە زۆریشـــمان کادیری شـارەزا و قاڵبوو لەدەستچوو، نەخاسـمە دوای ٨ی شـوباتی ١٩٦٣. ئەو زیـانـانە وایـان لێکردین هەزار جـار بە هەر هەنگـاوێکمـانـدا بچینەوە.[138]

سـەرباری ئەو شـەڕە بەیاننامەیەی نێوان ڕاسـتڕەوی و چەپڕەوی، کە عەزیز ئەلحاج هەندیّ ئەندامی لیژنەی مەرکەزیی گرت، لەوانەش زەکی خەیری و بەهادین نوری، ئیدی کارەکە گرژتر و ئاڵۆزتر بوو. ئەلحاج هەر بەوەندەش دەســـتبەردار نەبوو، بەڵکو، بەو ئەنجەتەی ئەو ئەوباڵەیە کە نوێنەری حیزبی شیوعییە، هەولیدا دەست بەسەر دارایی حیزب و ئۆتۆمۆبیلەکەی حیزبیشدا بگریّ.[139]

---

[137] _ دیدارێک لەگەڵ عەزیز محەمەد ٢٠١٥/٦/١٠.

[138] _ دیدارێک لەگەڵ عەزیز محەمەد ٢٠١٥/٦/٢١.

[139] _ شـوکت خزندار، سـفر ومحطات 'الحزب الشـیوعي العراقي ، رؤیة من الداخل، دار الکنوز الأدبیة، بیروت، ٢٠٠٥، ص١٨٩-١٩٠.

لەلایەکی دیکەشـەوە، زۆربەی ڕێکخسـتنە حیزبییەکان لەناو [illegible] بوونە دوو بڕ، هەندێک لایەنگری لیژنەی مەرکەزی و ئەوانیدیش لایەنگری عەزیز ئەلحاج. ئەوەشـــیان بە پلەی یەکەم دەگەڕێتەوە بۆ ئەو مگێزی شۆڕشگێڕییەی باڵی بەسەر وڵاتدا کێشابوو و، لەوانەش حیزبی شـــیوعیی عێراقیی کە لە ڕووداوە عارەبی و جیهانییەکان دابڕاو نەبوو و، بەتایبەتیش شەڕی پێنجی حوزێرانی ١٩٦٧ و ڕۆڵی ڕژێمە سەرشۆڕەکانی عارەبی بەرانبەر دوژمنداریی ئیسرائیل. ئەو کارەش مگێزی شـۆڕشـگێڕیی نیشـتمان پەروەرانی بەرزکردەوە و، عەزیز ئەلحاجیش ئەوەی بۆ بەرژەوەندیی خۆی قۆسـتەوە و بە ڕوڕووبوونەوەی لەگەڵ حکوومەت و لەگەڵ ڕێکخستنەکانی ئێمەی چالاکاییەکانی بە ڕاسـتڕەوی وەسـف دەکردین، گەرمتری کرد و، ئەوان نەیشـیاندەزانی، دوای ئەو هەموو گورزەی بەریکەوتبوو، حیزبی شیوعی چ توانایەکی کەمی هەیە.[140]

بـابەتێکی دیکەش هەیە و دەبێ بـاس بکرێ، تـاخمەکەی ئەلحـاج خەریکبوون بۆ پەیداکردنی پشـتیوانی و توانایەکی ماددی، بەسـەر بەڕێوەبەرایەتییە حکوومەتییەکانیاندا دەدا. ئەوەش کارێک بوو کە لە مێژووی حیزبی شـیوعیدا پێی ئاشـنا نەبووین. ئێمە دژی دەسـەڵاتە سـتەمکارەکان دەوەستاین، بەڵام دەسـتمان بۆ سـامان و موڵکە گشتییەکان نەدەبرد.[141]

---

[140] _ دیدارێک لەگەڵ عەزیز محەمەد ٢٠١٥/٦/١٠.

[141] _ حمید حمد السـعدون، عناقید النار(جدلية التأويل في السـياسـة العراقية)، مكتبة عدنان، ٢٠١١، ص١٦٣.

## عەزیز ئەلحاج و پەیوەندیکردنی بە بارزانی:

عەزیز ئەلحاج، خەریکبوو پەیوەندی بە مەلا مستەفای بارزانییەوە بکا، هەوڵی دەدا بەرەیەکی دی لە ناوچە کوردییەکان بکاتەوە کە ئێمە لەوێ چەندین بنکەی هێزی پشتیوانیمان هەبوو. ئەو پەیوەندییەش لە ڕێی حەبیب محەمەد کەریمی ئەندامی مەکتەبی سیاسیی پارتی دیموکراتی کوردستانەوە کرا، کە کوڕە پووری عەزیز ئەلحاج بوو. جا یەک لە داوایەکانیشیان ئەوەبوو چەکیان بدرێتێ. بەڵام داوایەکەی لەلایەن بارزانییەوە ڕەتکرایەوە، چونکە پێیوابوو ئێمە نوێنەری حیزبی شیوعیین. جا بارزانی لای خۆیەوە پێشنیاری ناوبژیی کرد تا ڕیزەکانی حیزبی شیوعیی عێراقی یەکبگرنەوە و، ئێمە نیشانماندا کە لاریمان لە بابەتەکە نییە. بەڵام ئەو دەسپێشخەرییە هیچ پێشکەوتنێکی بەخۆوە نەدیت، ڕەنگە لەبەر ڕەتکردنەوەی ئەلحاج بووبێ و، جارێکی دیکەش پەیوەندیی بە بارزانییەوە نەکردەوە.[١٤٢]

دیدارەکەی بەغدایشی لەگەڵ نوێنەری بارزانی وەها وەسف دەکا گوایە بۆ ڕێککەوتنی کاری هاوبەش بووە لە دەرەوەی

---

[١٤٢] - مەسعود بارزانی دووپاتیدەکاتەوە: ئەوەی لەو بارەیەوە لەبیرم بێ کە عەزیز ئەلحاج ویستی درزێک بخاتە ناو حیزبی شیوعییەوە و داوای کرد بێتە کوردستان، ڕێگەی پێ درا و لەگەڵ حەبیب محەمەد کەریم لە ئازاری ١٩٦٨ هاتە دیلمان و داوای پشتیوانیی لە بارزانی کرد و ئەویش داواکەی ڕەتکردەوە و ئامۆژگاریی کرد بچێتەوە ناو حیزبەکەی. بارزانی گوتیشی ئامادەیە ناوبژیوانییان بکا، لەبیریشمە بارزانی گوتی من هەمیشە پشتیوانیی ئەو لایەنەی دەکەم کە عەزیز محەمەدی تێدابێ، ئەوەی باش بزانن. بڕوانە مسعود البارزاني، البارزاني وحركة التحرر الكردية، ص٨٨

هەرێمی کوردســـتــان و، گوایە بەرانبەرەکەیشـــی نـاراز
نەبووە.[143]
لەکاتێکدا ئارا خاچادۆر دەڵێ، پەیوەندیکردنی عەزیز ئەلحاج بە حەبیب محەمەد کەریمی نوێنەری بارزانی، بۆ ئەو مەبەســتە بووە تـا بە هـانـدانی چەنـد لایەنێ وابکەن عەزیز ئەلحـاج لە حیزبی شـــیوعی ببێتەوە و ئەوەیش بۆ لەبـاربردنی پرۆژەی کاری یەکلاکەرەوە بووە و دواییش لەناوبردنی حیزب.[144]
راســـتییەکی ئاشـــکرایش هەیە کە ئێمە دوای کودەتای ٨ی سـوباتی ١٩٦٣، هەر خێرا کشـاینەوە ناوچە کوردییەکانی لەبەر شوێنە جوگرافییەکەی هەندێ سیفەتی ئەرینیی بۆ ئێمە هەبوو. سەرباری ئەوەش، پەیوەندیی هاوبەشمان لەگەڵ پارتی هەبوو. ئەگەرچی ڕژێم ڕێچکەی خۆ نزیککردنەوەی لە بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد گرتبووە بەر، بەڵام وەک پێدەچوو مەبەســتی ڕێککەوتنێکی کاتی بێ تا خۆی بۆ شـــەڕێکی گشـــتگیری دژە کورد ئامادە بکا. بەرەوپێشـــچوونی ڕووداوەکانیش هەر ئەوەی بەردا. ڕژێمی بەعس و پارتی، لەســـەر ئەوەی ڕێککەوتن چەند وەزیرێکی کورد لە حکوومەتەکەی کودەتـا بەشـــداربن. هەڵوێستی بارزانییش شـک و گومانی بەرانبەر کودەتاچییەکان پێوە دیاربوو. واباشـــە ئاماژە بەوەش بکەین کە هەڵوێســـتی عەبدولڕەحمان عـارفی جێی عەبدولســـەلام عـارفی گرتەوە،

---

[143] ـ عزيز الحاج، رحلة مع تحولات مفصلية، ص٥٩.

[144] - ارا خاجادور ، المصدر السابق، ص٨٠

بەرانبەر بە هەمووان ئەوەندە توند نەبوو، ئاخر ئەو ڕێی خۆ نزیککردنەوەی لە هەموو هێزەکـان گرتبووە بەر و، لەوانەش بزووتنەوەی کورد. ڕێکخسـتنەکانی ناوچە کوردییەکانمان زۆر کاریگەرتر بوون، چونکە ئێمە لەگەڵ پارتی خەباتی چەکداریمان لە دژی ڕژێمە دیکتـاتۆرییەکـان کردبوو. ئەوەش، پەیوەنـدیی ئەوتۆی لەنێوان هەردوولا دامەزراندبوو کە بە عەزیز ئەلحاج لەق نەدەبوو. سـەرباری هەموو ئەو قسـانەی دەکران، گوایە بارزانی دەسـتی لە جیابوونەوەی ئەلحاج هەبووە، بەڵام ئەو رایە بەشی لە راستیدا نییە.[١٤٥]

ئەحمەد بـانیخێلانیی کـادیری شـیوعیی ڕێکخسـتنەکـانی کوردسـتـان، گێڕانەوەیەکی دیکەی بۆ ئەو بـابەتە هەیە کە باسـکرا و ، دەڵێ ماوەیەک پێش جیابوونەوەکە، هەواڵێکمان گەیشـتێ گوایە عەزیز ئەلحاج لەگەڵ حەبیب محەمەد کەریمی ئەندامی پارتی دیموکراتی کوردسـتان هاتووەتە سـەردانی بارزانی و، دوایی ئەوەی هەندێ چەکی وەرگرتووە گەڕاوەتەوە بەغدا و، پاشـان لە هەواڵەکە دڵنیابووین و ئامانجی پارتییش لەو یارمەتیدانەی ئەوە بووە :

١ـــ ڕەنگە ئەوەی ئێمە ڕەتمانکردبووەوە ئەو جێبەجێی بکا.

٢ـــ تاقمەکەی ئەو هەوڵی ڕووخاندنی ڕژێم بدەن، یان یان لە بەستانی کۆنگرەی سێی حیزبدا فشارێکی بەڕاستی بخەنە سەر ئەو بابەتە.[١٤٦]

---

[١٤٥] - دیدارێک لەگەڵ عەزیز محەمەد ٢٠١٥/٦/١٢.

[١٤٦] - احمد باني خيلاني ، مذكراتي، دار الرواد المزدهرة ، بغداد، ٢٠٠٩، ص٢٠٩.

## گفتوگۆی شیوعی و بەعسییان دوای کودەتای ۱۷ی تەمموزی ۱۹٦۸:

وەک پێدەچوو، کودەتا ببووە سـیفەتێکی هەمیشـەیی ڕژێمە سـەربازییەکان. ئەوەش دیاردەیەکە ڕەنگدانەوەی ویسـتی گەیشـتنە دەسـەڵات و ، هەوڵی لادانی هێزە سـیاسـییەکانە. بەشێوەیەکی سەرەکییش، ئەو هێزە قەومییانە ئەو ڕێچکەیەیان گرتەبەر کە دەستاڕی کودەتایان بەرووی یەکدیدا دەگێڕا. هەر کوتلە و لە هەوڵی ئەوەیدابوو ئەو هێزانە بەلای خۆیدا ڕاکێشێ، کە پێیوابوو دەتوانێ بیگەیەنێتە ئێزگە تا ئەو شـتەی تێدا بخوێنێتەوە کە ناویان لێنابوو "بەیانی ژمارە یەک". جا عێراقییەکان ناوەناوە هەسـتیان لەوەی ڕادەگرت داخوا چ گۆڕانێک لە لایەنگیری و لاپیڕیی[147] سـیاسـی یان سـەربازیدا ڕوودەدا، بەڵام لەیەک تەوەرەدا ڕوویدەدا، ئەویش چوارچێوەی دامەزراوەی سەربازی بوو.[148]

چونکە دوو سـاڵی دوایی سـەردەمی هەردوو عـارفـان هەڵکشانێکی بزاوتی دیموکراتیی بەخۆوە دیت، حیزب ڕیزەکانی خۆی پتەوکرد و بەشـێوەیەکی تێبینیکراو هاتەوە گۆڕەپانی سـیاسـی و توانی هەندێ مانگرتنی کرێکاری ڕێکبخا.[149] ئەو

---

[147] _ لاپیڕ: ئەو لایەنگرەی بەلای خۆتیدا ڕادەکێشی. ل ب.

[148] _ سيف عدنان ارحيم القيسي، المصدر السابق، ص

[149] _ ثورة نصيف جاسم الربيعي، التطورات السياسية الداخلية في العراق في عهد الرئيس عبدالرحمن محمد عارف ١٩٦٦-١٩٦٨، رسالة ماجستير غير منشورة، معهد التاريخ العربي والتراث العلمي للدراسات العليا، ٢٠١٠، ص ٩٨-٩٩.

ڕێکخستنەی قوتابییانی شیوعییەکان پێشڕەوییان دەکرد، لە هەڵبژاردنی یەکێتیی قوتابیانی هەموو کۆماری عێراقدا لە بەغدا و موسڵ و بەسرا بەڕێژەیەکی زۆر بەرز سەرکەوت و بردییەوە و، ئەوەش دەسەڵاتەکانی فەرمانڕەوایی عارفی تۆقاند. دوای خۆهەڵکێشانی دەزگا ڕاگەیاندنەکانی گوایە هەڵبژاردنەکە دیموکراتییانە و ئازادە، کەچی ئەنجامەکانی ڕەتکرایەوە. لێیشنەگەران ئەو قوتابییانەی سەرکەوتوو بوون چالاکییەکانیان لە لیژنە هەڵبژێردراوەکانی قوتابیان پیادە بکەن.[150]

دەشڵێن، سەدام حوسێن ئەوێ ڕۆژێ قوتابیی کۆلێژی ماف بووە و، بە ئاشکرا و بە هاوکاریی پیاوانی ئاسایش، لە دژی قوتابییە شیوعی و دیموکراتەکان، دەمانچەی لەبەر پشتێ بووە و کاری بۆ شکاندنی مانگرتنانەکانی قوتابییان کردووە کە دەسەڵات زۆری لێ دەترسا .[151]

حیزب، خەریکی ڕاکێشانی هێزە نەیارەکانی دەسەڵاتی دیکتاتۆریی عارف بوو، کە کاریان لەپێناو گۆڕانکاریی دیموکراتیدا دەکرد و، لەگەڵ بزاوتی سۆشیالیستیی عەرەبی و حیزبی بەعسی عەرەبیی ئیشتیراکیی چەپڕەوی پەیوەست بە سەرکردایەتیی قەومیی ئەوکاتیی سوریا و کۆچکردوو فوئاد ریکابی، هاوکاربوو. هیچ پەیوەندییەکی بە تاقمەکەی ئەلبەکر-سەدامی ڕاستڕەوەوە نەبوو کە بەرپرسی سەرەکیی قەسابخانەکانی کودەتای ٨ی شوباتی ١٩٦٣ بوون، چونکە ڕای

---

[150] _ خالد حسين سلطان، المصدر السابق، ص١٠٦.

[151] _ دیدارێک لەگەڵ عەزیز محەمەد ٢٠١٥/٦/١٢.

گشـــتیی حیزبیی ئەوکاتی دژی ئەو جۆرە پەیوەندییانە بوو، ئەوە باسی هاریکاریکردنی ئەو تاقمە هەر مەکە.[152]
لەلایەکی دیکەوە، دوای لادانی باڵی بەعس، لەناویشـــیاندا ئەحمەد حەســـەن ئەلبەکر، بەعس ســـەرقاڵی ئەوەی بوو هێزە قەومییەکـان و بە پلەی یەکەمیش بەعســـییەکـانی لەخۆ کۆدەکردەوە تـا عەبـدولڕەحمـان عـارفی بەوەی نـاســـرابوو بەرانبەر نەیارەکانی نەرمە، لەسەر کار لابدەن. دوای ماوەیەک، هەواڵی هەوڵی کودەتایەکی لە ١٧ی تەمموزی ١٩٦٨ ئیبراهیم عەبـدولڕەحمـان ئەلـداود و عەبـدولڕەزاق نـایفی ســـوێندی گەورەیان بۆ خواردبوو وەفاداری دەبن، لە دژی عەبدولڕەحمان عــارف دابوویــان، بڵاو بووبووەوە و، پێـدەچوو بەڵێنی وەفادارییەکەش لە ڕێ خۆشــکردنی کودەتایەکە بترازێ، کە بە هاوپەیمانیی ئەلبەکر بوو، شتێکی دیکە نەبووبێ.[153]
شــــیوعییەکـان، لە هەوڵە کودەتـاییەکـانی ئەلبەکر و بەعس دوورنەبوون. ئـاخر هەوڵێـک بۆ پەیوەنـدیکردن بە حیزبی شــــیوعیی عێراقەوە، لە ڕێی جەلال تاڵەبانییەوە، لە ئارادابوو. ئەوەیشـــیان جەلال تـاڵەبـانی دووپـاتیکردەوە کە "جـارێکیـان ئەلبەکر داوای لێ کردم وادەی دیدارێکی لەگەڵ عەزیز محەمەد بۆ ڕێکخەم، منیش ئارەزووەکەیم گەیاندە عەزیز، بەڵام گوتی

---

[152] _ دیدارێکلەگەڵ حەزیز محەمەد ٢٠١٥/٦/٢٢.

[153] _ ثورة نصيف جاسم الربيعي، المصدر السابق، ص ١٤١-١٤٣.

ناتوانم ببینم، ئاخر دوای ئەو قەســـابخانانەی بەرانبەر ئێمە کردیان چۆن دەتوانم ببینم"[١٥٤]

دوای ڕەتکردنەوەی ئەو دیدارەی ئەلبەکری لە ڕێی نامەکەی بە جەلال تالەبانیدا ناردبووی، پێدەچێ جەلال تالەبانی ڕێی موکەڕەم تالەبانیی نیشـــاندابن، تا ئەلبەکر لە ڕێی عیزەت مستەفای سەرکردە لە حیزبی بەعسدا و بە موکەڕەم تالەبانیی ســـەرکردە لە حیزبی شـــیوعیی عێراقی، کە کەســـایەتییەکی ناســـراو و ئاشـــکرای شـــیوعی بوو و، بەڕێوەبەری گشـــتیی بەڕێوەبەرایەتیی وەرگرتنی تووتن بوو، بە نامەیەکی زارگۆیی ئارەزووی ئەوەمان پێ ڕاگەیەنێ کە حەزدەکەن لەگەڵ حیزبی شـــیوعیدا هاوکاری بکەن. ئەلبەکر، گوتی ئێمە ئامادەی ئەوەین دەســـەڵات وەرگرین و دەمانەوێ بە لەبیرکردنی ســـیاســـەتی پێشـتریێ لەگەڵماندابن. ئەلبەکر بەڵێنی ئەوەیشـی دا کە ئاسـۆی نوێی هاوکاریی نێوان هەردوولا دەکەنەوە. ئەوە گەوهەری ئەو بیرۆکەیە بوو کە ئەلبەکر دەریبڕی. بەڵام هۆی ڕاســـتەقینەی پشـت ئەو بانگێشـتە ئەوەبوو دەیانویسـت شـیوعییەکان بەلای خۆیاندا ڕاکێشـــن، نەوەکا حیزبی شـــیوعی کاری گەڕانەوە دەســـەڵات لە حیزبی بەعس تێکبدا و ، وەک کودەتای ٨٨ی شوباتی ١٩٦٣ بەرەنگاری بەعس ببنەوە.[١٥٥]

---

[١٥٤] _ حوار العمر مذكرات الرئيس جلال طالباني(رحلة ستون عاماً من جبال كردستان إلى قصـر السـلام)، اعداد:صـلاح رشـيد، ترجمة:شـيرزاد شـيخاني، الدار العربية للعلوم ناشرون، بيروت، ٢٠١٨، ص٢٥٨. "بە کوردییش هەیە ل ب".

[١٥٥] _ مقابلة مع مكرم الطالباني، 2012/6/11(السليمانية).

موکەڕەم تاڵەبانی، بابەتەکەی خستە بەردەستی حیزبەکەی و ،
کارەکەیش لە چەند کۆبوونەوەیەک تاوتوێ کرا و لەناو حیزبی
شـــیوعی گفتوگۆ لەســـەر ئەوەی کرا داخوا هاوپەیمانی لەگەڵ
تاقمەکەی ئەلبەکر بکەن یان لەگەڵ حیزبی بەعس"باڵی چەپ" و
بزووتنەوەی سۆشیالیستی عەرەبی و کوردەکان، کە ئامانجیان
پێکهێنانی بەرەیەکی نیشـتمانی بوو و ئامانجی کودەتایەک بوو
و وەرگرتنی دەســەڵات. جا گەیشــتنە ئەوەی ئەگەر تاقمەکەی
ئەلبەکر لە کودەتا نزیک بن ئەوا با تۆزی چاوەڕێ بکەین و
بزانین ئەنجامی دواتریّ چ دەبێ، ئەوەش یەک لەو هۆیـانەی
پەککخســـتنی پێکهێنانی ئەو بەرەیە بوو کە حیزبی شـــیوعیی
عێراقی زۆری هیوا لەسەر هەڵچنیبوو.[١٥٦]

دیسان پەیوەندی کرایەوە و، دیسان داوایەکە دووبارە کرایەوە.
وەڵاممـان ئەوەبوو ئێوە خەریکی کودەتـای خۆتـان بن و ئێمە
بێلایەن دەبین. بەداخەوە ئێمە بەردەوام ڕژێمەکانی دەسەڵاتمان
لاواز دەکرد و خەڵکی دی دەهـاتن بەرەکەیـان دەچنییەوە و،
هەر بەڕاستییش لە ١٧ی تەمموزی ١٩٦٨ کودەتایەکەیان کرد
و، سەرباری ئەوەی حیزبی شیوعی ئاگای لەو هەوڵەی بەعس
هەبوو، کەچی وا پەشـــۆکابووین نەمـاندەزانی چۆن مـامەڵە
لەگەڵ ڕووداوەکان بکەین و هەڵوێسـتەکە چۆن ڕاسـتکەینەوە،
نەخـاســـمە دوای ئەوەی ئەلبەکر پەیوەنـدیی پێوەکردین و ،
ڕۆژی دوای کودەتـایەکەش چوومە مـاڵی بـاقر ئیبراهیم
موســـەویی ئەندامی مەکتەبی ســـیاســـی و، دوای گفتوگۆ،

---

[١٥٦] _ زكي خيري وسعاد خيري، دراسـات في تاريخ الحزب الشيوعي العراقي، 1984، ص502.

ڕێککەوتین کە پەیوەندی نەپچڕێنین و تەنیا داواکارییەکانمان پێشـــکەش بکەین و چاوەڕێی ئەنجامان بکەین. ئەوجا مەهدی عەبدولکەریمی کۆچکردووی ئەندامی لیژنەی مەرکەزیی حیزب گەیشـــتەجێ و پشـــتی ئەو بۆچوونەی ئێمەی گرت، لەکاتێکدا بەهادین نوری بەتوندی ئەو ڕایەی ڕەتکردەوە و، ئەو ئەندامی لیژنەی مەرکەزی بوو و، دەریخســـــت کە ئەگەر هەل بدرێتە حیزبی بەعس چ مەترســـــییەکی هەیە و ، داوای کرد هەر یەکســەر دروشـمی ڕووخاندنی دەســەلات بەرزبکرێتەوە، بەڵام زۆرینە لەسەر پێشکەشکردنی چەندین داوا و پابەندی هێمنی و وریایی ڕێککەوتن، دواتریش موکەڕەم تاڵەبانی ســـــەردانی ئەلبەکری کرد و پیرۆزبـایی ســــەرکەوتنی بزاوتەکەیـانی لێ کردن و، ئەلبەکر پێیگوتبوو چەندم ئاوات بوو بەعســـی لە لای ڕاســـتم و شـــیوعی لەلای چەپمدا ببینم. لە بیســـت و نۆی تەمووزی ١٩٦٨ بەیاننامەیەکمان دەرکرد و ، تێیدا ئاماژەمان بۆ بارودۆخی کودەتا کرد و، ســـــەرکردە نوێیەکانمان لەوەی وریاکردەوە داخوا بەردەوامبوون لەســەر ڕێچکەی پێشـتری چ ئەنجـامێکی خراپی دەبێ و، گوتمــان پێویســـــتە دیموکراتی بەرکەماڵ بێ و ناڕازیبووین وەک پێشـــتری ســـەرباز جڵەوی سەرکردایەتی بگرنە دەست.[157]

سـەرباری هەڵوێسـتی ڕاڕایی و وریامان، کەچی ئەوان داوایان لێکردین بەشداری لە پێکهاتەی وەزارەتی نوێدا بکەین و دەست بە گفتوگۆ بکەین. جـا وەڵامی ئێمە ئەوەبوو چۆن گفتوگۆتـان

---

[157] _ دیدارێک لەگەڵ عەزیزمحەمەد ٢٠١٥/٦/١٢ .

لەگەڵ بکەین کە هەزاران هـــاوڕێمـــان لەودیو دیوارەکانی
بەندیخانەکانن.جا لەپای ئەوە بەدەم ئارەزووەکانمانەوە هاتن
بۆ داخســـتنی بەندیخانەی نوگرە ســـەلمان و بەردانی کۆمەڵیک
لە شـــیوعییەکانی لە بەندیخانەبوون. چونکە هێشـــتا پێیان لە
زەوی تونـــد نەببوو، هەمـــان ڕێچکەیـــان بۆ نزیکبوونەوە لە
هێزەکانی دیکەش گرتەبەر، ئاخر عێراقییەکان ئاگایان لە ڕێچکە
و سیاسەتەکانی پێشترییان هەبوو.[158]

---

[158] _ دیدامحەمەد ۲۰۱۵/٦/۱۰. ڕێک لەگەڵ عەزیز

## حیزبی شیوعیی عێراقی و وەرگرتنی دەسەڵات:

پێشتری، ئاماژەمان بەو دەمەتەقێیە کرد کە لەناو حیزبدا سەبارەت بە وەرگرتنی دەسەڵات کرا. ئەو دەمەتەقێیەش لە ساڵی ١٩٥٩ وە و، دوای ئەو سیاسەتی پاشەکشەیەی عەبدولکەریم قاسم بەرانبەر شیوعییەکان گرتییەبەر، لەناو حیزبی شیوعیدا ببووە بابەت. پێشڕەوی ئەو ڕایەش سەلام عادل و جەمال حەیدەری بوون، لەکاتێکدا کەسانێکی زۆری ئەندامی مەکتەبی سیاسی و لیژنەی مەرکەزی دژی بوون، سەرباری ئەو ئیمایانەی مۆسکۆی دەیگوت دەسەڵاتی قاسم دەسەلاتێکی نیشتمانییە و، دەبێ پشتی بگیرێ. جا ئەو دەمەتەقێیە لەناو حیزبی شیوعیدا توند بوو، دواتری بووە هۆی ئەوەی بەعس لە ٨ی شوباتی ١٩٦٣ بگاتە دەسەڵات. حیزبی شیوعییش ئەو هەلەی بۆی هەڵکەوتبوو لەکیسی چوو.

دواتری، حیزبی شیوعی چووە قۆناغی ڕاگەیاندنی "یەکێتیی سۆشیالیستی"، جا لە گێژەنی هەڵوێست بەرانبەر دەسەڵاتی عارف، حیزب هێڵی ئابی ١٩٦٤ی خستەڕوو. دواتریش حیزب دەستبەرداری ئەو هێڵە بوو و ڕێچکەی کاری یەکلاکەرەوەی گرتەبەر. وەک باسیشمان کرد حیزب دەستی بە هەڵمەتێکی ڕۆشنبیرکردنێ کرد. بەڵام کۆسپێکی گەورەمان هاتە بەردەمی و ئەویش ئەوەبوو داخوا کێ پێشڕەویی گۆڕان و کودەتاکردنێ دەکا. دیتمان کە گۆڕانکاری لە دامەزراوەی سەربازیدا بەرتەسک بووەتەوە. جا خۆمان بۆ ئەو گۆڕانکارییەی ئامادە دەکرد، بەڵام دوای دار و پەیوانەی ئەو توانایانەی

لەبەردەســــتدابوون، دیتمان بەشـــــی ئەو کارەی ناکا. ئاخر ئەوانەی لە ١٧ی تەمموزی ١٩٦٨ دەســــەڵاتیـان وەرگرت پشــــتیان بەو هێزانەیان بەســــتا کە لەناو کۆشـــکی کۆماریدا هەیانبوو، لەوانەش ئەلداود و ئەلنایف و ســــەعدون غێدانی بێ بەرگریی لایەنگرانی عارف دەستیان بەسەر کۆشکی کۆماریدا گرت. ئێمە ئەو جۆرە توانــایــانەمــان نەبوو، ئــاخر ئێمە لەنوشــوســــتییەکەوە بۆ نوشـــوســــتییەکی دیکە چووین. بەعســــییەکـان، بە بەلای خۆدا راکێشـــــانی ئەوانە توانییـان دەسـەڵات وەرگرن. بەعسـییەکان هەرخێراش دەستیان لە باڵی ئەلداود – ئەلنـایف تەکـاند، چونکە گومـانیـان لە لایەنگیرییـان هەبوو. لەلایەکی دیکەوە، ئەو شــــتەی ناکرێ پشـــــترِێ بکرێ، کـاریگەریی جیـابوونەوەی ئەلحـاج بوو بەســــەر تواناکـانی حیزبەوە. جیابوونەوەکە وایکرد رێکخستنەکان پەرتوبڵاو بن و هێزی حیزبی شـیوعیی عیراقییش لاوازبێ. جیابوونەوەکە بووە هۆی ئەوەی شـــەرِچەقە[159] لەنێوان هەردوو لادا دروســـتبێ و، رۆژنامەی هەردوولا تۆمەت و جنێویان بۆ یەکدی دەنارد و، ئەوەش حیزبی شـیوعیی عێراقیی لەبەردەم یەکگرتوویی هێزە قەومییەکانی ئەو قۆناغی لاواز کرد.[160]

عەزیز ئەلحاج، ســــەبارەت شـــکســـتی شـــیوعییەکان لە دەســـتپێشـــخەری و وەرگرتنی دەســــەڵاتدا دەگەرِێنێتەوە بۆ شـــپرزەیی و ململانێی گەرمی نـاوخۆی نێوان هێڵی ئـابی پاشکۆیی و رێککەوتن لەسەر دروشمەکانی رووخاندنی "کاری

---

[159] _ شەرەچەقە: چەلەحانێ

[160] _ دیدارێک لەگەڵ عەزیز محەمەد ٢٠١٥/٨/١٨.

یەکلاکەرەوە". دۆخی دابەشــبوونی حیزبیش یەک لە هۆیەکانی نوشــوســتیی بزاوتی شــیوعییەت بوو، کە ڕێی بۆ کودەتای دووەمی تەمووزی ١٩٦٨ ی بەعسییەکان خۆشکرد.[161]

---

[161] _ عزيز الحاج، رحلة مع تحولات مفصلية، ص٦١.

# هەرەسی سەرکردایەتییەکەی عەزیز ئەلحاج

هەڵوێستی توندی تاقمەکەی سەرکردایەتیی مەرکەزی، کاریگەرییەکانی لە کۆی ڕێکخستنە حیزبییەکان ڕەنگیدایەوە، کە بنکەکەی خەریکبوو پەرش و بڵاو دەبوو، جا چ لە ژێر فشاری دەزگای ئاسایش و ڕاوەدوونان و کوشتن، بەتایبەت لە بەندیخانەی قەسری نیهائی و، چ لەبەر ئەو ڕایەی دەڵی هۆیەکەی چالاکییەکانی تاقمەکەی سەرکردایەتیی مەرکەزی بووە و سەرباری ئەوەی سەرکردایەتیی مەرکەزی دەرگای گفتوگۆی لەگەڵ بەعسدا کردووەتەوە و "کازم ڕەزا ئەلسەفار" نوێنەرایەتیی کردوون، بەڵام ئەو کرانەوەیە لەبەر نیشتەنییەکانی ڕابردوو هەر خێرا شکستی هێناوە و، ئەوەش وای لە حکوومەت کردووە چنگ لەسەر ئەندامانی سەرکردایەتیی مەرکەزی توند بکا و، لەنێوان ٨ – ١٠ی شوباتی ١٩٦٩زیاتر لە "٣٠٠" کادیری ڕێکخستنەکانی سەرکردایەتیی مەرکەزی کەوتنە دەست پیاوانی ئاسایش و ڕاپێچی بەندیخانەی قەسری نیهائی کران و، ئەوجا لە ٢٢ی شوباتی ١٩٦٩ عەزیز ئەلحاجیش گیرا.[١٦٢]

لە ٢٢ی شوباتی ١٩٦٩، لە ناوچەی کەڕادەی بەغدا بووم و لە ماڵی مەهدی عەبدولکەریمی ئەندانی لیژنەی مەرکەزیی حیزبی شیوعیی عێراقی. دەنگوباسی گیرانی عەزیز ئەلحاجمان کەوتە بەر گوێ و، لە سایەی ئەو گۆڕانکارییانەی لەگەڵ هاتنی

[١٦٢] ـ حمید حمد السعدون، المصدر السابق، ص١٧٦.

بەعسـدا رووياندابوو و لە ڕێی ئەو ڕێچکەیەی عەزیز ئەلحاج گرتبووی و دروشمی ڕووخاندنی دەسەڵاتی بەرزکردبووەوە، ئیدی ئەو کارەش کارێکی پێشبینیکراو بوو. ئاخر بەعسییەکانی بە هەموو ڕێیەکدا دەیانویست پێی خۆیان لە سەر زەویی دەسەڵات جێگیرکەن ئەو کارەیان لا قابیلی قبوول نەبوو، جا جارێک بە زۆر و جارێک بە خوایشت.[١٦٣] بەعسییەکان لە ڕێی بڵاوکردنەوەی تۆڕی سیخوڕی و تۆمەتبارکردنی چەندین وەزیر و ئەفسەری پێشتریی و خەڵکە ناسراوەکەیش، وەک عەبدولڕەحمان بەزاز و فوئاد ڕیکابی، ڕێیەکیان گرتەبەر وایکرد بتوانن دەنگی نەیارانیان بێدەنگ بکەن. بەعسییەکان هەوڵیان دا بەو "فابریکە"یە دەنگی نەیاران بێدەنگ بکەن.[١٦٤]
بەڵام بابەتی عەزیز ئەلحاج لەوەی جودابوو، ئەو دروشمی ڕووخاندنی دەسەڵاتی هەڵگرتبوو. بەڵام بەعسییەکان دەیانویست بە هەر ڕێگایەک بێ ئەو بابەتەی کۆتایی پێ بهێنن، چونکە لە سایەی ئەو ڕێچکە نوێیەی گرتبوویانەبەر و لەسەر خۆتێهەڵسوینی هێزە حیزبی و سیاسییە نەیارەکانیان بەرپابوو، ببووە بار بەسەریانەوە.[١٦٥]
ڕاستییەکەی، دوای گیرانی ئەلحاج، ئێمە ئەگەرچی لە ڕا و ڕێچکە لەگەڵی جودابووین، لە ڕێی کەناڵەکانی پەیوەندیمانەوە

---

[١٦٣] _ دیدارێکلەگەڵعەزیز محەمەد ٢٠١٥/٦/١٢.

[١٦٤] _ حازم صاغیة، بعث العراق (سلطة صدام قیاماً وحطاماً)، دار الساقي، بیروت، ٢٠٠٣، ص٧٣.

[١٦٥] _ سیف عدنان ارحیم القیسي، الحزب الشیوعي العراقي في عهد البکر 1968-1979، دار الحکمة، لندن، 2014، ص212.

لەگەڵ بەعس داوامان ئەوەبوو ژیانی ئەلحاج پارێزراو بێ، ئاخر ئەو تێکۆشەرێکی شیوعیی ناسراو بوو. بەلام پێدەچوو ئەلحاج لە پێویست پتری پێشکەش کردبن، ئیدی هاتە سەر شاشەی تەلەفزیۆن و دەستی بەوەی کرد کە تاقیکردنەوەکانی پێشتری بە هەڵە دابنێ و خۆی بەگایەک چوواند قۆچی لە بارستاییەکی کۆنکریتی دابێ. پاشان عەزیز ئەلحاج بووە نووسەرێک لە ڕۆژنامەکانی بەعس و بۆ ئابڕووبردن و ناوزڕاندنی حیزبی شیوعیی عێراقی بەکاریان دەهێنا و، پاشان، وەک نرخی لایەنگیری لەلایەک و دوورخستنەوەی لە ناوخۆی عێراق دوای لێکنزیکبوونەوەی ئێمە و بەعس، کرایە نوێنەری عێراق لە ڕێکخراوی یۆنسکۆ.[١٦٦]

سەرباری هەموو ئەو شتانە و ئەو جوداییەی کەوتبووە نێوانمان و ئەو مەودا دوورەی لەنێوانماندا بوو، بەلام دوای ڕۆژگارێک لە بەعس دوورکەوتەوە و خەریکبوو ڕێچکەکەی پێشتری بە هەڵە دادەنا و ئەو هێرشە بێ پاساوەیشی کە کردبوویە سەر حیزبی شیوعیی عێراقی. من، پێش ماوەیەک و وەک ئەرکی هاوڕێیەتییەکی دوورودرێژ، لە فەرەنسا پەیوەندیم پێیەوە کرد تا لە تەندروستیی بپرسم. پێموایە دەبێ پەردە لەسەر ڕووداوەکانی ڕابردوو دادەینەوە و بەدوای شتی نوێدا بگەڕێین.[١٦٧]

---

[١٦٦] _ دیدارێکلەگەڵ عەزیز محەمەد ٢٠١٥/٦/١٢.

[١٦٧] _ دیدارێکلەگەڵ عەزیزمحەمەد ٢٠١٥/٨/١٨.

# حیزبی شیوعیی عێراقی و
# بەیاننامەی ١١ی ئازاری ١٩٧٠:

کێشـــەی کورد لە عێراق، هەموو ڕژێمە ڕێچکە جودایەکانی بەخۆیەوە سەرقاڵ کردبوو. ئەو کێشەیەی لە شۆڕشی ئەیلولی ١٩٦١دا گەیشـــتە چڵەپۆپە و ، ســـەرباری ئەو قوربانییانەی هەردوولای حکوومەت و کورد دابوویان و خەرجیی هەناردنی ســـێیەکی ســـوپای عێراق بۆ ناوچە کوردییەکانی بێ ئەوەی ســـەرکەوتن بۆ هیچ لایەک دابین بکا و بێ ئەوەی گفتوگۆ ئامانجی راســـتەقینەی هیچ لایەنێکیان بێ، بووە دادۆشـــینێکی دارایی دەوڵەت. هەرلایەنە و ئامانجی خۆی پێ ڕاســـت بوو. لایەنی حکوومەت دەیویست دەسەڵاتی خۆی بەسەر هەموو عێراقدا بسەپێنێ، لە کاتێکدا لەناو کوردەکان خەڵکێک هەبوون هیوای ئۆتۆنۆمییەکیـان هەبوو بێ ئەوەی دەســـەڵاتێکی ڕاستەوخۆی حکوومەتیان بەسەرەوە بێ.[١٦٨]
بەعســـییەکان، هەوڵیان دەدا لەگەڵ هەموو هێزە جیاوازەکان گفتوگۆیان هەبێ و لەوانەش کورد، چونکە وەک پێشتریێ گوتم، بەعســـییەکان هێشـــتا پێیان لە زەوی نەچەقاندبوو و، ئەوان پێویســـتیـان بە کات بوو. لەبەر چەند دراو و بابەتێکی لە ئارادابوو دەبووایە بەعس زۆر بە وردی مامەڵە لەگەڵ کورد بکا، لەوانەش، کوردەکان، هێزی ئاســـمانیی لێ دەرچێ، دەنا

---

١٦٨ _ مكرم الطالباني، مراحل تطور الحركة القومية الكردية، جزأن، مؤســـســـة حمدي للطباعة والنشر، السليمانية، ٢٠٠٩، ج١، ص٢٩٦.

هێندەی حکوومەتیان چەک بەدەستەوە بوو. ئەوەیشی بخە سەر کە چەندین دەوڵەت دەستیان لە دۆسییەی کورد وەردەدا، لەوانەش ئێران و ئەمریکای تا ئارەزووەکانی خۆیان بەسەر حکوومەتی عێراقدا بسەپێنن و تا لە ڕێی کارتی کوردەوە، چ لە ڕێککەوتنە سیاسییەکان یان بازرگانییەکان، فشاری بخەنە سەر و پتریان سەر بۆ دانەوێنێ، پشتی کوردیان دەگرت. ئەو هێزانە، لە جوولاندنی دۆسییەی کێشەی کورد، ئەوەندەی مەبەستیان سەپاندنی پلانەکانی خۆیان بوو، ئەوەندە مەبەستیان نیشاندانی دۆستایەتی و خۆشەویستیی کورد نەبوو. سەرەتا، حیزبی بەعس ویستی لە ڕێی کەمەندکێشکردنی ئەو باڵەی لە پارتی جودا ببووەوە و بریتی بوو لە باڵی ئیبراهیم ئەحمەد – جەلال تاڵەبانی، دووبەرەکی بخاتە ناو ڕیزەکانی کوردەوە. بەڵام دوای ئەوەی لە بەدیهێنانی ئامانجەکەیان دەستەپاچە بوون، ئیدی ڕوویان لە بارزانی کرد، چونکە زانییان ئەو نوێنەری بزووتنەوەی چەکداری کوردە. بۆیە، هەر زوو پشتیان لە ئیبراهیم ئەحمەد و جەلال تاڵەبانی کرد. دوای نێوانگیریی سۆڤیەتی بۆ هەردوولایەنی کوردی و حکوومەتی و، سەرەتای دەرکەوتنی سەدام لە دیمەنی سیاسیی عێراقیی لە بارەگاکەی حاجی ئۆمەرانیدا چاوی بە بارزانی کەوت و، شاندی کوردیش لە بەغدا خەریکی دانوستان بوو و نەیدەزانی سەدام چاوی بە بارزانی کەوتووە – سەدام بەیاننامەی ١١ی ئازاری واژووکرد- . سەربارى ئەو دۆستایەتییە ڕواڵەتییەی سەدام و بارزانی بۆ یەکدییان دەردەخست، بارزانی متمانەی پێی نەبوو و هەمیشە ئاگاداریی

لەبارەوە دەدا. پاشــــتریش ســـەدام گوتبووی: هەندێ نەیار و ناڕازیی ڕێککەوتینی ١١ی ئازار ویستیان سواری ئەسپەکە ببن و من پێشــی ئەوان وەســەرپشــتی کەوتم. گوتبووشــی: ئەگەر ئەوان دەســـتیان پێ بکردایە نەیاندەزانی لەکوێ بوەســـتن. هەرچی منم دەزانم دەبێ لەگەڵ کوردەکان لەکوێ بوەســـتم، ڕێککەوتنی ١١ی ئـازاری ١٩٧٠ لەســـەر بنەمـای ئۆتۆنۆمی واژوو کرا. ڕاستییەکەی هەر ئەوەش دروشمی مەرکەزیی ئێمە بوو بۆ چارەسەری کێشەی کورد.[١٦٩]

لەلایەکی دیکەوە، بزووتنەوەی کوردی مکوڕ بوو کە دەبێ حیزبی شـــیوعییش لە دانوســـتانەکاندا بەشـــداربێ، کەچی حکوومەتی عێراقی بەشداریکردنی حیزبی شیوعیی ڕەتکردەوە و مەســـعود بارزانی ئـاماژە بەوەی دەکا "عەزیز محەمەدی ســـکرتێری حیزب نامەیەکی بۆ بارزانی هەنارد و تێیدا هاتبوو (نامانەوێ ئەو ڕەتکردنەوەیەی دەســەڵات بۆ بەشـداریکردنمان لە دانوســـتانەکاندا ببێتە هۆی بەرپابوونی کێشـــە لە نێوانتاندا، ئیدی مکوڕ مەبن و ئێمە دڵنیاین ئێوە قیروســـیا لە مافەکانی گەلی عێراق و گەلی کورد ناکەن و دەستی لێ بەرنادەن و ئێوە باشترین کەسن تا لەو گفتوگۆیانە نوێنەرایەتیمان بکا)"[١٧٠]

دوای مۆرکردنی ڕێککەوتنەکە، عەزیز شـــەریف تەوقەی لەگەڵ عامر عەبدوڵلا و ژمارەیەک ئەندامی لیژنەی مەرکەزیی حیزبی شیوعی کرد و پێیگوتن: "پیرۆزبایی سەرکەوتنی بەدەستهێنانی

---

[١٦٩] _ دیدارێکلەگەل عەزیز محەمەد ٢٠١٥/٨/١٨.

[١٧٠] _ مسعود البارزاني، المصدر السابق، ص ٢٣٦.

ئامانجەکانتان لێ دەکەم لە چارەسەری کێشەی کورد" ئەو مەبەستە لە ماڵی عامر عەبدوڵلا بوو.[171]

دەبێ ئاماژە بەوەش بکەین کە سەرکردایەتیی کورد لە کاتی دانوستانەکاندا ڕاوێژیان پێ دەکردین.[172] سەرەتا سەرکردایەتیی کورد پرسیاری ئەوەیان دەکرد داخوا چۆن دانوستان لەگەڵ بکوژانی سەلام عادلدا بکەن! بەڵام کە هەندێک نەوییان نواند ئەوانیش ئامێزیان بۆ دانوستانەکان کردەوە، ئەگەرچی بارزانی ترسی لە نییەتی بەعسییەکان هەر هەبوو . ئاخر ئەو بەدرێژایی ماوەی دانوستانەکان و دوای واژۆکردنی ڕێککەوتننامەکەش قەتی سەردانی بەغدا نەکرد، چونکە هەردەم زانیاریی ئەوەی دەگەیشتێ ڕژێم بە نیازە تیرۆری بکا.[173]

بەڵام، دوای نزیکبوونەوە لە کورد، سیاسەتی پشتکردنە شیوعییانی بەعس لەگەڵ پێشتریێ هیچ جیاوازییەکی نەبوو و، هەرواش دەرچوو. لە ئاهەنگەکانی ٢١ی ئازاری ١٩٧٠ی

---

١٧١ _ دیدارێک لەگەڵ عەزیز محەمەد ٢٠١٥/٨/١٨

١٧٢ _ موحسین دزەیی بەرپرسی پارتی دەڵێ داوای یەکەمی شاندەکەمان بۆ بەشداریکردنی لایەنەکانی دیکەش بوو لە گفتوگۆکاندا و بەتایبەت حیزبی شیوعیی عێراقی، کەچی لایەنی حکوومەت بەوەی ڕازی نەبوو و مکوڕبوو گفتوگۆ تەنیا لەنێوان هەردوو لایەنی کێشەکە بێ و لەبەر سووربوونیشیان شاندەکەی ئێمە بە داوایەکەیان ڕازیبوون، بەڵام دوای هەموو گەڕێکی دانوستان لەگەڵ شاندی حکوومەت کۆبوونەوەی لاوەکی لەنێوان ئێمە و نوێنەرانی حیزبی شیوعیدا دەکرا تا بزانن گفتوگۆیەکان چۆن بەڕێوەدەچن و گوێ لە بیرورایەکانیشیان بگرین. جا ژمارەیەک سەرکردەیان نوێنەرایەتیی حیزبی شیوعییان دەکرد و، لەوانەش عەزیز محەمەدی سکرتێری لیژنەی مەرکەزیی حیزب و موکەڕەم تاڵەبانی و عامر عەبدوڵلا و کەریم ئەحمەد و کەسانی دیکەش. بۆ زیاتر: محسن دزه ئي، أحداث عاصرتها ١٩٦١-١٩٧٥، جزأن، دار ئاراس ، اربيل، ٢٠٠٢، ج٢، ص١٩٤.

١٧٣ _ دیدارێک لەگەڵ عزیز محەمەد ٢٠١٥/٨/١٨.

شـــەقامی ڕەشـــید، بەبۆنەی جەژنی نەورۆزێ، کە ڕێپێوانێکی هێزی جیاوازی تێدابوو بەڕێکەوت و، لەوانەش حیزبی شیوعیی عێراقی، لایەنگرانی حیزبی بەعس هێرشیان کردە سەر کۆمەڵی شیوعییەکان. ئەوەش کارێک بوو لای خۆیشیان هیچ پاساوێکی نەبوو، ئەو کارەیان تەنیا بە هەڵســـوکەوتێکی تاکەکەســـیی خۆپیشاندەرە بەعسییەکان دانا.[174]

دەبێ ئـامــاژە بەو ڕاســـتییەیش بکەین کە ئێمە ڕۆڵێکی ڕاســـتەوخۆمان لە ڕێککەوتنەکەیدا نەبوو. ئاخر بەعس هەموو ناوبژیوانییەکی ئێمەی ڕەتدەکردەوە. ئێمەش لە ڕێی موکەڕەم تاڵەبانییەوە لە نزیکەوە چاومان لەســەر دانوسـتانەکەی بوو و، تێبینییەکـانی خۆمــان دەدایە ســـەرکردایەتیی کوردی و، زۆرجـاران بەدەم پرســـوڕایەکـانمـانەوە دەهـاتن کە دەڕژایە بەرژەوەندیی ئەوان.[175]

---

[174] _ مكرم الطالباني، مراحل تطور الحركة القومية الكردية، ٢٩٩ -٣٠٠.

[175] _ دیدارێک لەگەڵ عەزیز محەمەد ٢٠١٥/٨/١٨

# هەوڵە کودەتاییەکەی عەبدولغەنی ئەلڕاوی[1]

ئـاشـــکرایە کە عەبـدولغەنی ئەلڕاوی، جەمسـەریکە لە جەمسـەرەکانی تاقمی سـەربازە قەومییەکان، بەوەش ناسـراوە کە دژی حیزبی شـیوعیی عێراقی بووە. کە کودەتای شـوباتی ١٩٦٣ دەسـتی پێ کرد، عەبدولغەنی خانەنشـین کرابوو. بەڵام هەرکە گوێی لە کودەتا بوو ئیدی جلە سەربازییەکەی لەبەرکرد و چووە سـەربازگەی حەبانییە تا سـەرکردایەتیی ئەو لیوایەی بکا کە بۆ ڕووخاندنی قاسـم بەرەو بەغدا دەکشـا. ئەلڕاوی لە گفتوگۆ یەکی لەگەڵ غەسان شربلی ڕۆژنامەنووسی ڕۆژنامەی ئەلحەیات، دووپاتیدەکاتەوە، دوای ئەوەی عەبدولسـەلام عارف ڕێگە نـادا عەبـدولکەریم قـاسـم بچێتە تـاراوگە، ئەو، ئەو کە سەبووە فەرمانی لە سێدارەدانی عەبدولکەریم قاسم و تەها ئەلشـێخ و فـازڵ ئەلمەهـداویی داوە. ئەلڕاوی لە توندوتیژیی بەرانبەر شـیوعییاندا سـنووری تێپەڕاند. کە دوای شـکسـتی بزاوتەکەی حەسەن سریع لە ڕۆژی سێیەمی تەمموزی ١٩٦٣ بڕیاردرا شـیوعییەکان لەسـێدارە بدرێن، ئەلڕاوی داوای کرد هەموویـان لە سـێدارە بدرێن کە لە٥٠٠ کەس پتربوون، کە ناڕەزاییش لەسـەر ژمارەکە دەربڕدرا و ژمارەکە کرایە ٣٠ کەسـی شـیوعیی سـەربازبوون، ئەلڕاوی ناڕەزایی دەربڕی و پێیوابوو ژمارەکە هەر زۆر کەمە.[176]

---

[176] _ علي كريم سعيد، العراق البيرية المسلحة(حركة حسن سريع وقطار الموت ١٩٦٣، دار البراق، لندن، ص ٢٤٥.

بەڵام، دیارە ئەو پەندە باو و زانراوەی دەڵێ شۆڕش ڕۆڵەکانی خۆی دەخوا، بەسەر کودەتاچییەکانیشدا دەچەسپێ. ئیدی، لەبەر کوتلەکاری و دژایەتیی نێوانیان، کودەتاچییەکان دەستیان بە خواردنی یەکدی کرد. پێش ١٧ی تەمموز، عەبدولغەنی ئەلڕاوی جێگری سەرۆک کۆمار بوو. بەڵام دوای ئەوەی عەبدولڕەحمان وازی لە دەسەڵات هێنا، ئەلڕاوی پێیوابوو وەک پێشتری بەختی یار دەبێ. دوای چەندجار هەوڵی گرتنی رایکردە ئێران و ئەوجارەیان شا، دوای ئەوەی کارتی کوردی دۆڕاندبوو، وەک کارتی فشاری سەر حیزبی بەعس بەکاریهێنا. لەبەرانبەر ئەوەشدا، وەک کاردانەوەیەک بەعس رووی لە کۆکردنەوەی نەیارە ئیرانییەکانی حوکمی شا کرد و، لەوانەش تەیموور بەختیاریی سەرۆکی پێشتریی ساڤاک. ئیدی هەریەکە و خەریکی ئەوەی بوو کەرەستەی ڕووخاندنی ڕژێمەکەی ئەویدیی ئامادە دەکرد.[١٧٧]

ئیدی، عەبدولغەنی ئەلڕاوی خەریکبوو پەیوەندیی بە هەندێ ئەفسەری دژە بەعسەوە دەکرد و، پەیوەندیی بە سەرکردایەتیی کوردیشەوە کرد کە بارزانی بوو و، ئەویش ڕەتیکردەوە هاوکارییان بکا. لە ڕێی پەیوەندییەکانییەوە، سۆڤیەتییەکان هەواڵی هەوڵەکەی ئەلڕاوییان وەرگرت کە بە نیازبوو بەسەر کۆشکی کۆماریدا بدا و، لای خۆیانەوە هەواڵی هەوڵەکەیان پێگوتین، ئێمەش لە ڕێی موکەرەم تاڵەبانییەوە، وردەکارییەکانی

---

[١٧٧] ـ سالم الاطرقجي، من مشوار الصمت مذكرات واحداث ١٩٥٨-١٩٩٠(العراق-تركيا-ايران)، بساتين المعرفة، بغداد، ٢٠١٣، ص٥٢-٥٣.

پلانەکەمان دایە بەعس، کە خۆی دایە دەســت نەلبەکر. ئەو هەواڵە زۆری دڵخۆش کرد.[١٧٨]

پێـدەچێ ســـۆڤیەتییەکــان، کە بەلای ئێمەدا دزەیــان بە وردەکــارییەکــانی هەوڵی کودەتــایەکە کرد، مەبەســـتیــان خۆشــکردنەوەی کەشــی نێوان ئێمە و بەعســییەکان بووبێ و، ئێمە نیازپاکیی خۆمـانیـان بۆ دەربڕین. لە هەمـان کـاتیشـــدا ئەلراوی، دوور و نزیک، پەیوەندیی پێوە نەکردین. خۆ ئەگەر ئەلڕاوی بیرۆکەکەیشی بخستبا بەردەستمان ئەوا هەر ڕەتمان دەکردەوە، چونکە دەمانزانی چەندە دژی ئێمەیە.[١٧٩]

---

١٧٨ _ دیدارێک لەگەڵ موکەڕەم تاڵەبانی ٢٠١١/٥/١٤.

١٧٩ _ دیدارێک لەگەڵ عەزیز محەمەد ٢٠١٥/٨/١٨.

# دیداریك لەگەڵ ئەلبەكر-سەدام پێش كۆنگرەی دووی حیزبی شیوعی:

باسی ئەوەم كرد لەگەڵ ڕژێمی بەعس دیداری بەردەوامامان هەبوو و، ئەو دیدارانەش لە ڕێی موكەڕەم تاڵەبانی و عامر عەبدوڵڵاوە دەكران، ئەگەرچی خۆیشمان وەك شیوعی بەهاسانی لە گۆڕەپانەكەدا دەهاتین و دەچووین بەڵام، موكەڕەم چونكە پۆستی هەبوو پتری پەیوەندی بە بەعسەوە هەبوو و، ئاسانتریش پەیوەندیی پێوە دەكردن. جا ئێمە وەك دوو لایەن لە ڕێی موكەڕەمییەوە پەیوەندیمان بە یەكدییەوە دەكرد و، وەها ڕای خۆمان دەردەبڕی وەك دوو لایەنی خۆیان بۆ هاوپەیمانییەك ئامادە بكەن كە خەریكبوون هەوڵیان بۆ دەدا.[180]

من، پێش كۆنگرەی دووی حیزبی شیوعیی عێراقی، لە ئابی ١٩٧٠، واتە پێش بەستانی كۆنگرە، هیچ پەیوەندییەكی ڕاستەوخۆم نە لەگەڵ ئەلبەكر و نە هیچ كام لە بەرپرسەكانی بەعس نەبوو و، بابەتی دیدارەكەش گفتوگۆ بوو لەسەر پێویستیی هاوپەیمانیی هەردوولا و ویستیان ڕای حیزب بزانن، پێناوی دیدارەكەش هەریەك لە "عەلی حوسێن ئەلرەشید و

---

[180] _ مكرم الطالباني، الحياة لا تجري دوما حفيفة ناعمة، مذكرات مخطوطة غير منشورة بحوزة الباحث.

فارس عەبدولڕەشید و مونزیر موتڵەگ" بوون[181] کە دیدارەکەی بۆ ڕیکخستین و دووپاتیکردەوە کە سەلامەت دەبم و گوتی داخوا لاریم لەوەی نییە ئەگەر سەدام حوسێنیش لەگەل ئەلبەکر ئامادەی کۆبوونەوەکە بێ یان کۆبوونەوەکە هەر ئەو دووەمان بین، گوتم مافی خۆیەتی هەرکەسێک لەگەڵ خۆی بهێنێ و لاریم لە کارەکەدا نەبوو و، هەر لەو کاتیدا زۆربەی سەرکردەکانی حیزبی شیوعی لە ناوچەی کوردستان بوون و ئامادەکارییان بۆ کۆنگرەی دوو دەکرد.[182]

دیدارەکە لەماڵێکی نزیک کۆشکی کۆماریدا کرا و، ماڵی مونزیر ئەلموتڵەگ بوو و، ئەلبەکر بە یاوەریی سەدام هاتبوو و،

---

[181] _ سابت حەبیب ئەلعانییش لە بیرەوەرییەکانی ئاماژە بە چۆنیەتیی ئەو دیدارەی نێوان ئەلبەکر- سەدام دەکا و دەڵێ "لە ماڵی خەزوورم دەژیام و ئەوێ جێی نهێنیی مانەوەم بوو و، لە برایەکەم بترازێ کەسی دی نەیدەزانی من لەوێمە، برایەکەم هات و پێیگوتم هەندێ کەس دەیانەوێ بتبینن، ئیدی چوومە ماڵی برایەکەم و دیتم عەلی حوسێن ئەلڕەشید و فارس عەبدولڕەشید و مونزیر ئەلموتڵەگ و ڕەئوف محەمەد سەعیدی خەڵکی سلێمانی لەوێن، بەخێرم هێنان. گوتیان ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر ئێمەی ڕەوانە کردووە. فارس عەبدولڕەشید و عەلی حوسێن ئەلڕەشید خزمی ئەلبەکر بوون و لە هاوڕێیانی ئێمەبوون...... سەعاتێک دوو سەعات دوای ڕۆیشتنی ئەوان چوومە لای عەزیز محەمەد و ماجەرایەکەم بۆ گێڕایەوە، گوتی تۆ ڕات چییە؟ گوتم من ڕام وایە بچی و بیبینی، ئێمە لیستێک گیراومان هەیە و لە بەرایی داواکارییەکانمانە، لانیکەم، ئەگەر بکرێ، هاوڕێیەکانمان ڕزگار دەکەین. ئەوجا بابەتی تیرۆر و ڕاوەدوونانم هێنا گۆڕێ، گوتی ئەوە زۆر باشە و ڕات چییە پرسێک بە ئەبو عامل بکەین، پێمان گوت و ئەویش هاوڕامان بوو. جا ڕۆژی دواتری عەزیز محەمەد هاتە ماڵی برایەکەم و هەمان پێناوەکانی دیدارەکەی ئەلبەکریش هاتن و، دیدارەکە هەر بەخێرهێنان بوو و دیدارێکی دی ڕۆژی دواتری بە ئامادەبوونی سەدام حوسین کرا. بۆ زیاتر: ثابت حبیب العاني، المصدر السابق، ص٤٢٤-٤٢٥.

[182] _ دیدارێک لەگەڵ عەزیزمحەمەد ٢٠١٥/٦/٢١.

ئەلبەکر بەخێرهاتنی کردین و دواتریش گوتی ئارەزووی ئەوەی دەکا ببینە هاوپەیمان، منیش سەرسوڕمانی خۆم بۆ دەربڕی چونکە ڕۆژانە کۆمەڵێ شیوعی دەگیران یان سەرکردەیەکی حیزبی شیوعی بە شێوەیەکی سەیر تیرۆر دەکرا، ئەوسا سەدام هاتە ناو قسان و گوتی ئەو برایانە، مەبەستی "شیوعییەکان" بوو، عێراقیان وەک ئەوەی پێشانی دنیاداوە گوایە بەندیخانەیە.[183]

گفتوگۆی نێوان عەزیز محەمەد و سەدام حوسێن کاتێک دەستی پێ کرد کە عەزیز محەمەد گەیشتەجێ و ئەلبەکر مەرەخەسیی خواست بڕوا، چونکە وادەیەکی لەگەڵ نێردراوی تەنزانیا هەبوو، ئیدی ڕۆیشت و منی وەک نوێنەری حیزبی شیوعی پێشکەش کرد و ڕووی دەمیشی لە سەدام حوسێن کرد و گوتی، تۆش نوێنەری حیزبی بەعسی و دەتوانن ڕێککەون و هەموو زانیارییەکتان لایە و ئیدی پێناوەکانیش بەجێیانهێشتین.[184]

دوای ئەوەی گوتی، ئێمە عێراقمان وەک گرتووخانەیەک نیشانداوە، منیش ڕای خۆمم پێگوت و گوتم، ئێستا ناوی دوو کەست دەدەمێ لە کادیرەکانی حیزبی شیوعیی عێراقین و ماوەیەکە گیراون و چارەنووسیان نازانین، گوتی کێن؟ گوتم کازم ئەلجاسم و عەزیز حەمیدن. لەو کاتیدا سەدام پەیوەندیی

[183] ـ مکرم الطالباني، الحياة لا تجري دوما حفيفة ناعمة، مذكرات مخطوطة غير منشورة بحوزة الباحث.

[184] ـ دیدارێک لەگەڵ عەزیز محەمەد۱۲/۶/۲۰۱۵.

به کەســـێکەوە کرد ناوی ئەبو حەرب بوو و پرســـیاری ۱۹۹۰ دووەی لێ کرد و، دوای تۆزێ بێدەنگی گوتی، ناوی کەســـانی دیکەم بدەرێ. ئیدی لەوەیەوە زانیم کوژراون و دیدارەکەیش دووســـەعاتی خایاند و تەواوبوو و لە قســـەکردنەکانی ســـەدام حوســـێنی ڕا زانیم دوای ئەلبەکر ئەو کەســـی دووەمە و، مـــاجەرای کۆبوونەوەکەم بردەوە بۆ کۆنگرەی دوو و رای هەمووان لەسەر ئەوەی بوو دەبێ چاوەڕێ بکەین و لەوکاتەیدا پەلەمـان لە هیچ هـاوپەیمـانییەک نەبێ کە لەبەرژەوەنـدیمـان نییە.[185]

[185] _ مكرم الطالباني، الحياة لا تجري دوما حفيفة ناعمة، مذكرات مخطوطة غير منشورة بحوزة الباحث.

# هەوڵی تیرۆرکردنی بارزانی:

حیزبی بەعس، دوای واژووکردنی بەیاننامەی ئازاری ۱۹۷۰ تەواو لەوەی دڵنیابوو کە مەلامستەفای بارزانی کەسایەتیی کاریگەری ناوەندە کوردییەکەیە و، بابەتی ڕازیکردنی بۆ نزیکبوونەوە لە بەعس بەو ئاسانییە نەبوو کە بەعسییەکان پێشبینییان کردبوو، بۆیە، دوای واژووکردنی بەیاننامەی ئازار، هەوڵیان دا بەهەر شێوەیەک بێ بارزانی لەکۆڵ خۆیان بکەنەوە چونکە کۆسپی سەرڕێی پلانەکانیان بوو.
شتێکی لە زەینی عەزیز محەمەدی مابێ و وەسفی مەلا مستەفا بارزانیی پێ بکا، ئەوەیە کە زۆری بەلاوە گرنگ بوو شتێک لە ئاواتە نەتەوەییە ڕەواکانی گەلی کورد دەستەبەر ببێ و، لەو ڕێیەشدا هەوڵێکی زۆری دا و خەباتەکانی بەرایی و ئەو کارانەی دژی دەسەڵات پێشڕەویی کردن ڕواڵەتێکی ناوچەییان هەبوو، بەڵام لەناوەرۆکی نەتەوەیی خاڵی نەبوو کە دواتریش بەڕوونی بەرجەستە بوو، بەتایبەت دوای بەشداریکردنی لە ڕاگەیاندنی کۆماری کوردستانی ئێران لە تەک سەرکردە شەهیدەکەی کۆمار، قازی محەمەد، کە شێوازێکی ئۆتۆنۆمیی هەبوو و بە کۆماری مەهاباد ناسراوە. ئەوجا و لەسەر داوای دامەزرێنەرەکانی بووە سەرۆکی پارتی دیموکراتیی کوردستانی عێراقی دامەزراندنی لە ١٦ی ئابی ١٩٤٦ ڕاگەیەندرا، کە نزیکەی هەمووشیان لە گەنجانی نەتەوەیی پێشکەوتنخوازی کورد بوون.

بە بڕوای من، ئەو ماوەیەکی زۆری هێزە نێودەوڵەتییەکان سەنگ و مەن کرد، یەکێتیی سۆڤیەت و ئۆردووی سوشیالیستی لە بەرێک و ویلایەتە یەکگرتووەکان و ئۆردووی خۆرئاوا لەبەرەکەی دی و، ڕەنگە لەکۆتاییدا هەستی بەوەی کردبێ یەکێتیی سۆڤیەت، سەرباری ئەوەی هاوسۆزی کێشەی کورد و مافە نەتەوەییە ڕەوایەکانی گەلی کورد بوو و، سەرباری ئەوەی پشتیوانییەکی دڵسۆزانەشی لە خەباتەکەی دەکرد، بەلام ئەو بنچینە و توانا پێویستانەی نەبوو وا بکا بزووتنەوەی کورد سەرکەوێ. یەکێتیی سۆڤیەت پشتیوانییەکی مەعنەویی گەورەی پێشکەشی کێشەی کورد دەکرد و، بەتایبەت بۆ سەرکردایەتیی بارزانی و، پشتیوانییەکی مادییشی لێ دەکرد. بەڵام ئەو پشتیوانییە مادییە لەگەڵ فراوانیی ئەو سنوورە هاوبەشەی نەدەگونجا کە لەنێوان کوردستانی عێراق و ئێران هەیە و دەروازەی چەک و هاریکارییەکان بوو.

دوای ئەوەی جێبەجێکردنێکی پاک و بێگەردی بەیاننامەی ١١ی ئازار لەلایەن بەعسەوە تەگەرەی خرایە پێش، کە یەکەم بەیاننامەی فەرمی بوو دانی بەوەیدا دەنا کوردەکان لە عێراق مافی نەتەوەییان هەیە و، دانی بە ئۆتۆنۆمیشدا دەنا، ئیدی بە هەوڵێکی تیرۆری سەدام حوسێن و نازم گزاری بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی لە ٢٩ی ئەیلولی ١٩٧١ ڕێکیانخستبوو، بەعس ویستی بارزانی لەکۆڵ خۆی بکاتەوە و شاندێکی ئایینییان بە سەرۆکایەتیی عەبدولجەبار ئەعزەمی هەنارده لای و، هەندێ ئامێری پڕ مادەی تەقینەوەیان دانێ کە دەکرا بە ڕیمۆت کۆنترۆڵ لە دوورەوەڕا بتەقیندرێنەوە و وایان

تێگەیاندبوون کە ئامێری تۆمارکردنن و، هەر بەڕاستیش ئامێرەکان تەقینەوە و هەموو ئەوانەی لە ژوورەکەی پێشوازیبوون کوژران و بارزانی بە پەرجوو دەربازبوو و بەڕێکەوتێکی سادە، چونکە ئەو ساتی، پێشخزمەتەکەی لەنێوان ئەو و ئامێری تەقینەوەکە بوو کە چایەی بۆ شاندەکە هێنابوو. هەموو خەڵکەکە کەلوکرۆم بوون. دوای هەموو ئەو شتانەش پێموایە پیلانێک لە ئارادابوو و چەندین لایەن تێیدا بەشداربوون تا بارزانی ناچارکەن بژاردەکانی یەکلاکاتەوە. جا بە مووچکردن و بەڵێنە درۆیەکانی کیسنجەری لە ڕێی شای ئێرانەوە دەهاتن و دەیانگوت شتێک بۆ گەلی کورد دەکەین و بەسای ئەو هەستەی کە پێیوابوو ئەمریکییەکان دەسەڵاتێکی بێ ڕکابەریان لە ئێران و تورکیا هەیە، بارزانی بژاردەکانی خۆی یەکلاکردەوە. جا یەکلاکردنەوەکەش لە بەرژەوەندیی پەیوەندی بە ئەمریکاوە بوو و بەشێوەیەکی سەرەکی پشتی بە ئەمریکا بەستا.[١٨٦]

---

[١٨٦] _ دیداریک لەگەل عەزیز محەمەد ٢٠١٥/٦/١٢.

# نزیکبوونەوەی سۆڤیەتی - عێراقی و دانوستانەکانی نەوت:

لەبەر هەندێ هۆی، ڕەنگە بابەتییش بووبن، حیزبی بەعس لەوەی دەگەڕا لە یەکێتیی سۆڤیەت نزیک ببێتەوە، ئاخر خۆرئاوا، بە سیاسەتە پشتیوانیکەرەکانی ئیسرائیلی، نەخاسمە دوای شەڕی پێنجی حوزێرانی ١٩٦٧، کاردانەوەیەکی نەرێنیی توندی لە شەقامی عارەبیدا دروستکرد و ، تووڕەیییەکی بەرانبەر وڵاتە خۆرئاواییەکان وروورژاند، چونکە پشتیوانیی ئیسرائیلیان کردبوو. کێشەی فەلەستین لە بەرایی ئەو کارانەی ڕژێمی بەعسی عێراق بوو کە ئاڵایەکەی هەڵکردبوو. سەرباری ئەوەی بەعس بە تاقیکردنەوەکەی پێشتریی، کە لەبیرناکرێ و، لە کودەتای شوباتی ١٩٦٣ هاوپەیمانیی لەگەڵ خۆرئاوا کرد و ، وەک ئەو قسەیەی دەدرێتە پاڵ عەلی سالحی سەرکردە لە بەعس کە ئەوان بە شەمەندەفەرێکی ئەمریکی هاتوونەتە سەر دەسەڵات، بەڵام لەو ماوەیەی باسکرا زۆر ئەستەم بوو هیچ هاوپەیمانییەک لەگەڵ خۆرئاوادا بکرێ.

سەبارەت بە پەیوەندیی نێوان بەعس و یەکێتیی سۆڤیەت، یەڤگینی بریماکۆڤی سیاسەتوان و وەزیری دەرەوەی دواتریی ڕووسیا، هەوڵ دەدا وێنەیەکی هاتنە سەر دەسەڵاتی بەعسمان بداتێ و دەڵێ: "مۆسکۆ، لە هەڵوێستی بەرانبەر ئەو کودەتایەی بەعسییەکان لە ١٧ی تەمموزی ١٩٦٨ پێشڕەوییان کردبوو ، هەستی ڕاگرتبوو، ئاخر هێشتا کودەتایە خوێناوییەکەی یەکەمی بەعسییان لە زەینان مابوو و، فیلیکس فیدۆتۆڤی

راوێژکاری، باڵیۆزخانەی بەغدای بەڕێوەدەبرد و  بارودۆخە تازەکەی ژێر سایەی کودەتای بە سەرکردایەتیی سۆڤیەتی ڕادەگەیاند".[187]

ئیدی بەعس، لە ڕێی هەڵشەقاندنی سۆشیالیزم و نزیکبوونەوە لەگەڵ دامەزاوەی سۆشیالیستی و لە گۆڕنانی سیاسەتی پێشتریێ، نەخاسمە پەیوەندییەکانی لەگەڵ هێزە نیشتمانییەکان و لەوانەش حیزبی شیوعیی عێراقی. خەریکبوو ختووکەی هەستی سۆڤیەتی دەدا. ڕێ بۆ ئەو جۆرە نزیکبوونەوانە خۆش ببوو. بەڵام داخوا ئامانجی بەعس لە نزیکبوونەوەی لە سۆڤیەت لە پێناوی دانەخۆرەکردنی خۆرئاوا  نەبوو تا پەیوەندییەکی لەگەڵدا دامەزرێنن، یان هەر بەڕاستی بەرژەوەندیی بەعس پێویستی بەو لە سۆڤیەت نزیکبوونەوەیە هەبوو، چونکە سۆڤیەت، دوای ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، یەک لە دوو جەمسەرە سەرەکییەکانی دنیا بوو؟[188]. بەهەرحاڵ، ئەو نزیکبوونەوەیەی نێوان عێراق و سۆڤیەتمان بەرز نرخاند و، لە بەیاننامەیەکماندا گوتمان ئەوە هەنگاوێکە بەرەو ئاراستە دروستەکە و، ئەوە ئاواتی ئێمەش بووە. ئاخر سۆڤیەتییەکان هەمیشە هەڵوێستی ئەرێنییان بەرانبەر کێشە نیشتمانی و نەتەوەییەکانمان هەبوو و، لە سەرووی هەمووشیانەوە هەڵوێستی پشتگیریکردنیان لە کێشەی فەلەستین و ئەو ملەیەی

---

[187] ـ يفغني بريماكوف، الشرق الاوسط(المعلوم والمخفي)، ترجمة عبدالسلام شهباز، دار اسكندرون، دمشق، ص٣١٧-٣١٨.

[188] ـ حنا بطاطو، المصدر السابق، ج٣، ص٤١٦.

لەکاتی هێرشی سێ قۆڵیی ساڵی ١٩٥٦ی کرایە سەر مسر لەگەڵ وڵاتانی خۆرئاوادا کردیان.[189]
هۆیەکی دیکەیش بۆ ئەو هاوپەیمانییە لە گۆڕێ بوو، ئاخر ڕژێمی بەعس لای خۆیەوە بەدوای هاوپەیمانێکی بەهێزدا دەگەڕا تا لە دەستپێکردنی دانوستانی نەوت و خۆماڵیکردنیدا پشتی بگرێ. خۆماڵیکردنی نەوت بووە کارە هەرە لەپێشەکانی و هەر لەگەڵ گەیشتنە دەسەڵاتیشی ئەوەی ڕاگەیاند. ڕاستییەکەی، نەوت وەک ئەو تفەنگەی لێهاتبوو لە دەستی کەسی تەقەکەردا بێ. بەڵام لە هەمان کاتیشدا بۆ عێراقییەکان ببووە بەڵا و بەتایبەتیش بۆ گەلی کورد. ئاخر، هەر لەبەر نەوت بوو، وڵاتەکانی خۆرئاوا بە توندی دەستیان لە عێراق وەردا و پاڵپشتیی بزووتنەوەی نەتەوەیی کوردیان کرد و پارە و چەکیان دایە، تا فشار بخەنە سەر حکوومەت و وای لێ بکەن مل بۆ وڵاتانی خۆرئاوا بدا و ئامانجەکانیان بەدی بێنن و پاشانیش پشت لەپشتیوانیی کورد بکەن.[190]
لووتکەی ئەو نزیکبوونەوەیەی بەغدا و مۆسکۆش، ڕێککەوتنێکی پازدە ساڵی بوو کە لە نۆی نیسانی ١٩٧٢ مۆرکرا و، زمانی بەناوبانگی سۆڤیەتی وەهای وەسف دەکا کە "دۆستایەتییەکی هەمیشەیی ئەوتۆیە جیابوونەوەی نییە"[191]، یەڤگینی بریماکۆڤیش ئاماژە بەوەی دەدا کە دوای پەیماننامەی

---

[189] _ دیدارێک لەگەڵ عەزیز محەمەد ٢٠١٥/٦/١٢.
[190] _ دیدارێک لەگەڵ عەزیز محەمەد ٢٠١٥/٥/٢٢.
[191] _ حازم صاغیة، المصدر السابق، ص٨٣.

دۆستایەتی لەگەڵ مۆسکۆ پەیوەندییەکانی نێوان سۆڤیەت و عێراق لە بواری ئابووری و سەربازی و تەکنیکیدا پتەو بوون.[192]

ئەگەرچی لە گەلێ کاروباری دیکەدا لەگەڵ حکوومەت ڕێک نەبووین، بەڵام دوای ڕاگەیاندنی خۆماڵیکردنی نەوت لەگەڵ بڕیارەکەی حکوومەتدا بووین. سەرەڕای ئەوەی بەعس، دواترێ داهاتەکانی نەوتی کردە ئەوزارێک تا پێگەی میللیی خۆی پێ بەهێز بکا و پەرە بە مەکینە سەربازی و ئاسایشییەکەی بدا و پاشانیش دژی نەیارەکانی بەکاریان بهێنێ، لەوانەش گەلی کوردی شەڕێکی نابەرابەری لەدژ بەرپا کرد و هەردوولا لە زیانی گیانی و ماددی بترازێ شتێکی دیکەیان لێ نەچنییەوە، کەچی سەرەتا پێمانوابوو ئەو بڕیارە دەڕژێتە ناو بەرژەوەندیی هەموو گەلی عێراق.[193]

---

[192] ـ يفغيني بريماكوف، المصدر السابق، ص٣٢٢.

[193] ـ دیدارێک لەگەل عەزیز محەمەد ٢٠١٥/٦/١٢.

## بەشداریی حیزبی شیوعی لە وەزارەت

لە سـایەی لێک نزیکبوونەوەی هەردوو لایەنی شـیوعی و بەعسی، چەندین دەستپێشخەریی هاوپەیمانی خرانە روو. بەلام بەرەوڕووی چەندین ئاستەنگ دەبوونەوە. ترسی نییەتی بەعس و جێی بـاوەڕبوونی بەرانبەر هـاوپەیمـانی لەگەڵ حیزبی شـیوعیی عێراقی لە بەرایی هەموو کۆسـپ و تەگەرەکان بوو. ئاخر بەعس لە هەر گفتوگۆیەکی لەگەڵ هەر لایەنێکی کردبێ، هەر خێرا پشتی لە لایەنەکەی دیکە دەکرد و، ئەوەش وایدەکرد مامەڵە لەگەڵ کردنی ئەسـتەم بێ. ئەو کارەشـی خەریکبوو دوای واژووکردنی بەیـاننـامەی ١١ی ئـازاری ١٩٧٠ دەبووە پەتەی سەرئاوێ، چونکە ناکۆکییەکانی نێوان هەردوو لا، کورد و حکوومەت، خەریکبوو بە ئاشکرا دەردەکەوتن.

لەکۆتـایی سـالی ١٩٧١، بەعس یەکلایەنە ڕەشـنووسـی پەیمـاننـامەی کـاری نیشـتمـانیی خسـتەڕوو، بەڵام ئێمە ناڕەزاییمان بەرانبەر گەلێ بڕگەی ڕەشـنووسـی پەیماننامەکە هەبوو، چونکە ڕەشـنووسـەکە دووپاتی دەکردەوە کە حیزبی بەعس ڕۆڵی لە بەڕیوەبردنی دەوڵەتـدا ڕۆڵێکی سـەرەکییە. بەوەش هەوڵەکانی لێکنزیککردنەوە سوودێکیان نەدەدایەوە.[194] بۆیە، پێمان باشـبوو چاودێریی هەنگاوەکانی بەعس بکەین و بزانین لە بانگەشـەکانیدا چەندە ڕشـتە. وەک گوتم، دوای واژووکردنی بەیاننامەی ئازار لەگەڵ سـەرکردایەتیی کورد،

---

[194] _ "جريدة الثورة"، ١٥ تشرين الثاني ١٩٧١.

هەر ماوەیەک دوای خۆماڵیکردنی نەوت پەیماننامەی دۆستایەتیی لەگەڵ یەکێتیی سۆڤیەتدا مۆرکرد. بەعس بە هەموو ڕێیەک هەوڵی دا تا لە وەزارەت بەشداربین. بەڵام ئێمە ئەو بنەمایەمان ڕەتکردەوە، چونکە بەشداری لە وەزارەت ئەگەر لەگەڵ شتی گرنگتر پێکی بگرین ئەوا هیچ بەهایەکی نابێ و، تەنیا هاوپەیمانییەکی ئاوکووف سەربەخۆیی سیاسی و فیکریمان بۆ دابین دەکا. جا لە هەوڵێکی ئەو ڕێگایەییشیان عەزیز شەریفیان کردە وەزیری داد[195]، ئێمەش، لە سایەی ڕێوشوێنی ئەو لەسێدارەدانانەی نەیارانی بەعسی بە بیانگەی سیخوڕی بەڕێوەدەچوون گەلێ نیشتمان پەروەری بە پاکی سیاسی و فیکری ناسرابوو تێیدا بوونە قوربانی، ئەو وەزارەتەمان ڕەتکردەوە. داواشمان لە عەزیز شەریف کرد ئەو وەزیرییە ڕەتکاتەوە، بەڵام گوێی لە ئامۆژگارییەکەمان نەگرت. جا بەیاننامەیەکمان دەرکرد تا خۆمان لەو قبووڵکردنی وەزیرییەی عەزیز شەریف دوورخەینەوە و، ئەگەرچی عەزیز شەریف ئەندامی حیزبی شیوعییش بوو، ڕامانگەیاند کە ئەو نوێنەرایەتیی حیزبی شیوعی ناکا و ئەو سەربەخۆیە.[196]

بەڵام، لەبەر ڕۆشنایی ئەو گۆڕانکاری و هەنگاوانەی دواتریێ گرتنییەبەر، ئیدی لە ڕێی درککردنی بەعس بە قورسایی سیاسیی ئێمە، هەنگاوی نزیکبوونەوە نزیکتر ببووەوە. بەعس

[195] _ حنا بطاطو، المصدر السابق، ص ٤١٦.

[196] _ دیدارێک لەگەڵ عەزیز .محەمەد ٢٠١٥/٦/١٠.

داوای لێ کردین دوو کەس لە حیزبەکەمان دەستنیشان بکەین تــا ببنە نوێنەری ئێمە لە حکوومەت. وەک پێـدەچوو ئەوان تاقیکردنەوەکەی ســـوریایان وەرگرتبوو کاتێ لەوێش حیزبی شـــیوعیی ســـوورییان لە وەزارەت بەشـــدار کردبوو. بەعس پێشـــنیاری ئەوەی کرد وەزیرێکیان ببێتە وەزیری دەوڵەت و ئەوەی دیکەیان وەزارەتێک وەرگرێ. بە پێشنیارەکە ڕازیبووین، جا لە مەکتەبی ســیاســی و لیژنەی مەرکەزی بژاردەکە کەوتە ســـەر عــامر عەبـدوڵلا و موکەڕەم تــاڵەبـانی چونکە دوو کەســـایەتیی ناســـراوی لای هەمووان بوون و، لای بەعس بە پلەی یەک. ئەو دووە لەو ماوەیەدا لە دانوســتانی لەگەڵ بەعس کرا بەشــدار بوون و، موکەڕەم فەرمانبەری حکوومەت بوو و، عامر عەبدوڵلاش لێوەشـــاوەیی شـــارەزاییەکی زۆری هەبوو ئیدی، بژاردەکە بە کۆی ڕای سەرکردایەتیی حیزب کەوتە سەر ئەو دووە. جا لە نیســـانی ١٩٧٢ کرانە وەزیر، موکەڕەم کرایە وەزیری ئــاودێری و عــامر عەبــدوڵلاش کرایە وەزیری دەوڵەت.[١٩٧]

---

[١٩٧] غادة فائق محمد علي ، المصدر السابق، ص١٩٦.

# سۆڤیەت و لەیەك نزیككردنەوەی شیوعی و بەعس:

گەلێ نووســـەر و قســـەکەر، هەوڵیاندا ئاماژە بۆ کاریگەریی سۆڤیەت و ســەپاندنی ویستی خۆیان بەسـەر ئێمەدا بکەن. بە زۆر هەڵوێســـتی هەمانبووە، دەکرێ ئەو قســـەیە ڕەتکەینەوە. ئێمە بایی ئەوەنـدەمـان ڕای ســـۆڤیەتییەکـان دەخوێندەوە و شیماندەکردەوە کە پەیوەندیی بە سیاسەتەکانی ئێمەوە هەبوو، بەڵام لە بڕیاری ســیاســیماندا ئاماژەمان لەوان وەرنەدەگرت. دەشمەوێ دووپاتیکەمەوە ئێمە لەژێر کاریگەریی ئەو ئیحایانەدا نەبووین، چونکە خۆمان، لە ســایەی ئەو بارودۆخە گشتییەی حیزبی ئێمەی تێدا دەژیا، هەڵوێســـمـان وەردەگرت نەک ســـۆڤیەت. بەڵێ ئێمە بەرچاوروونیمان لە تیۆر و بابەتەکانیان وەردەگرت، چونکە خاوەن تاقیکردنەوەیەکی دوورودرێژبوون و، هەر بۆ زانینیش هەمیشـــە دووپاتیان دەکردەوە دەبێ وەها نزیکبینەوە کە خزمەتی حیزبەکەمـانی تێدابێ. نکۆڵی لەوەش ناکەم بەرژەوەندیی هاوبەشـــیان لەگەڵ دەســـەڵاتی عێراق چ ڕۆڵێکی هەبوو و کاریگەریی لەســـەر لێکحاڵیبوونی ئێمە و ڕژێم هەبوو.[198]

لەکـاتێکـدا یەڤگینی بریمـاکۆڤ ڕەهەنـدێکی دیکە دەداتە دەستتێوەردانی ڕاستەوخۆی سـۆڤیەتییەکان و، ئاماژە بەوەی دەکا بڕیاری چوونە ناو بەرەی شـــیوعییەکان وەها بووە کە

---

[198] _ دیدارێک لەگەڵ عەزیز محەمەد ٢٠١٥/٦/١٢.

"ســـەرکردایەتیی عەزیز محەمەد هەڵویســـتی پێکهاتن"هاته، بەرانبەر دەســـەڵاتی نوێ هەبووە و، حیزبی شـــیوعیی ســـۆڤیەتییش ڕۆڵێکی گەورەی لە هـــاریکـــاریکردنی حیزبی شـــیوعیی عێراقیدا هەبووە تا باوەڕە چەپڕەوییە زێدەڕۆیەکە لەخۆی دامـاڵێ و، ئەوەش واژووکردنی بەرەی نیشـــتمـانیی لێکەوتەوە"[199]

ڕاستیی کارێ ئەوەبوو کە سۆڤیەتییەکان، هەوڵێکی زۆریان دا تا دۆســـییە گیرخواردووەکانی عێراق چارەســـەر بکەن و، لەوانەش دۆســـییەی کێشـــەی کورد. یەڤگینی بریمـاکۆڤی نێردراوی لیژنەی مەرکەزیی حیزبی شیوعیی سۆڤیەتی بەدوای پێشـــڤەچوونەکانی دانوســـتانی نێوان حکوومەت و کورددا دەچوو و، بەڕێوەچوونی دانوســـتـانەکـانی لەگەڵ موکەڕەم تاڵەبانی تاوتوێ دەکرد و، توانییان شـــێوازێکی گفتوگۆ کردنی نێوان هەردوولایـان بـدۆزنەوە. ئەوەیشـــی بخەســـەرێ کە سۆڤیەتییەکان ویستیان لە ناوخۆ دەستبار لەگەڵ عێراق بگرن، نەخاســـمە لەکاتی دانوســـتان لەگەڵ کۆمپانیا مۆنۆپۆلەکانی جارێک نرخی نەوتیان دەهێنا خوارێ و جارێک هەڕەشـــەیان دەکرد. جا سۆڤیەتییەکان ڕۆڵێکی پشتبەندیی چاکیان بۆ عێراق گێڕا، ســـەربـاری ئەوەش لەدەرەوە بەرگرییـان لە عێراق دەکرد.[200]

---

١٩٩ _ يفغيني بريماكوف، المصدر السابق، ص٣٢٠.

٢٠٠ _ دیدارێک لەگەڵ عەزیز محەمەد ٢٠١٥/٦/١٢.

## هەوڵی تیرۆرکردنی سەرۆك ئەلبەکر:

لە ٣٠ی حوزێرانی ١٩٧٣ و لەلایەن نازم گزاری بەڕێوەبەری ئاسایش، هەوڵێکی تیرۆرکردنی سەرۆک ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر درا و، گومان لە سەدام حوسێنیش دەکرا. ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر، لەسەردانێکی دەرەوەی وڵات بوو و بڕیاربوو بگەڕێتەوە بەغدا. لە ڕێی گەڕانەوەیدا لە بولگارستان ڕاوەستا. جا پێدەچێ سەرۆک ژیڤکۆڤ داوای لێکردبێ چەند سەعاتێک لە فڕۆکەخانە یان لە نزیک فڕۆکەخانە بمێنێتەوە. ژمارەیەک بەرپرسی حیزبی و حکوومی بۆ پێشوازیکردنی چوونە فڕۆکەخانە. جا کە دواکەوت، ئەوانەی خۆیان بۆ تیرۆرکردنی ئامادەکردبوو ترسان دەستەکەیان ئاشکرابووبێ. ئیدی بەرەو بەرەو سنووری ئێرانی لای پارێزگای کووت ڕایانکرد و حەمادی شهابی وەزیری بەرگری و سەعدون غێدانی وەزیری ناوخۆیشیان، کە لە نیوەڕۆی ئەو ڕۆژێرا دەستگیریان کردبوون، وەک بارمتە لەگەڵ خۆیان برد. حەمادی شهاب بەدەستی وان کوژرا و سەعدون غێدانیش بریندار بوو.

جا کارەکەش هەر ڕێکەوتێک بوو و بەس، کەسیش نەیزانیبوو پلانێک هەیە، بەڵام ترسی ئەو کەسانەی ڕێکیانخستبوو بەرەو ئەو لایەی بردن. سەدام ئەو سەربردەی بۆ گێڕاینەوە و گوتی هەرکە بە ڕووداوەکەی زانی پێیگوتن دەبێ بزانن نازم گزار لەکوێیە. جا هێلیکۆپتەرەکان بزووتن و کارکردەکانیان گرت و کوژران و هیچ زانیارییەک ڕانەگەیەندرا. پاشان سەدام چووە فڕۆکەخانە و پێشوازیی لە ئەلبەکر کرد و، ئیدی پرسیارێکی

زۆر سەبارەت بە ڕۆڵی ئەو هاتنەگۆڕێ، بەتایبەتیش لەبەر ئەو مکوڕییەی خێرا کوشتنی ئەو کەسانەی لە پیلانەکەدا بەشدار ببوون. لەو ڕووداوەیدا کارەکان وا ڕێکەوتن سەعدون شاکری برادەری نازم گزاری لە ئەشـــکەنجەدانێ لە قەســـری نیهائی بەشــــداریی لەگەڵ دەکرد، ئەوجـارەیـان نـازمی بکەوێتە بن دەســـتی. نزار بردرایە قەســـری نیهـائیی لەوێ گیراو لە جەللادەکەی دەپاڕایەوە تا بیکوژێ و لەو ئازار و ئەشکەنجەیە دەربازبێ. دوای ڕووداوەکە ئەلبەکرمان دیت و، گوتی: "نازانم چۆن گەلی عێراق بەرگەی ئەو جۆرە کەسانە دەگرێ" مەبەستی نازم گزار و تاقمەکەی بوو. ئەلبەکر گوتیشـــی:"گزار تا لێواری گیاندانێ ئەشـــکەنجەی گیراوی دەدا و ئەودەمی داوای جێیەک کەبابی دەکرد و، لەکـاتێکـدا بەهەردوو پێیـان بەســـەر ئەو بەنـدییەی دەکەوت کە خەریکبوو گیـانی دەدا، کەبـابەکەی دەخوارد". بەکر بە ســـەرســـوڕمانەوە باســـی ئەو زیندان و دەزگایانەی دەکرد کە جەللادەکانی دەزگا ئاســـایشـــییەکان پەیـدایـان کردبوون. لەو قۆنـاغی، کیســـەی پڕ لاشـــەی لەتوکوتکراویان دەهێنانە دەرێ. ئەلبەکر گوتیشـــی هەر یەک لە تـاقمەکەی گزار بە یەک تەوقەکردن و بەهۆی ئـامێرێکی کارەبالێدانێکی دروستدەکرد، دەیتوانی مرۆڤ بکوژێ.[٢٠١]

[٢٠١] _ طارق مجيد تقي العقيلي، فصـــول من تاريخ العراق المعاصـــر، مؤســـســـة ثائر العصامي، بغداد، ٢٠١٤، ص١١١.

## بەرەی نیشتمانی و نەتەوەیی پێشکەوتنخواز:

دوای دانوســــتـانێکی دوورودرێژ ، ئیـدی دەبووایە دوا مشــــتومـاڵەکـانی پەیمـاننـامەی بەرە بکرێ، نەخـاســــمە کە پەیوەندییەکان لەگەڵ ســــەرکردایەتیی کوردی گەیشــــتبووە ئاســــتێکی ئەوتۆی دوورکەوتنەوە و گرژیی هیی ئەوەی نەبوو ئێرەیی پێ ببردرێ. گەیشــتنە دارشــتنی کۆتایی بەرەش، ڕۆڵی ســەرکردەیی حیزبی بەعسی لە دەوڵەتدا تێدا دووپاتکرابووەوە و دووپاتیان کردەوە کە دەبێ دارشتنی "سەرکردایەتیی بەعس بۆ بەرە"ی تێدا قبوول بکرێ. شــــیوعییەکان لەســــەر بابەتی یەکێتیی عەرەبی لە گەڵ بەعســــییەکان ناکۆک بوون، ئاخر لە تێڕوانینی شــیوعییەکانەوە ئەوەی گەلانی عارەبی یەکدەخســت تەنیا خەسڵەتە نەتەوەییە هاوبەشـەکانیان نەبوو، بەڵکو خەباتی هاوبەشی دژە ئیستیعماریشیان کۆی دەکردنەوە. بۆیە، بەرە لە تێڕوانینی ئەوانەوە دەبووایە یەکێتیی عەرەبی بە یەک کردار و یەک جار نەکرێ، وەک ئەوەی بەعسییەکان تێیدەڕوانن.[٢٠٢]

وەک عەزیز محەمەد ئـامـاژەی پێـدەکـا، ئەوەی لەکـاتی دانوســــتانەکان زۆری لەســــەر چڕبووینەوە ئەوەبوو کە نابێ هاوپەیمانییەکە هەر لەســــەر دوو لایەنی شــــیوعی و بەعســــی ببڕێتەوە، بەڵکو پێویســــتە پارتییش بێتە ناو بەرە، چونکە ئەوە پێگەی بەرە بەهێزتر دەکا و وادەکا بەعس دەســــت بەســــەر بەرەدا نەگرێ و، ئەوەش پێگەی ئێمە و پێگەی پارتییش بەهێز

---

[٢٠٢] ـ طارق مجيد تقي العقيلي، فصــول من تاريخ العراق المعاصــر، مؤســســة ثائر العصامي، بغداد، ٢٠١٤، ص١١١.

دەکا. لەبەر ئەو خاڵە ناوکۆییانەی لەنێوانماندا هەبوون، ئێمە بزووتنەوەی کوردمان بە کۆڵەگەی سەرەکیی هێزی خومان دادەنا. بەڵام، ئەو گرژییانەی کەوتبوونە نێوان بەعس و پارتی، لێنەگەڕان ئەو کارە سەربگرێ. سەرەڕای ئەوەی چەندین نامەمان لە سەرکردایەتیی کوردەوە بۆ هات نەکا هاوپەیمانییەکەی بەرە لەگەڵ بەعس واژوو کەین، کەچی هەر واژوومان کرد. بەڵام ئێمە پێمانوابوو ئەوە بڕیارێکە و پەیوەندیی بە حیزبی شیوعییەوە هەیە، وەکچۆن واژووکردنی ڕێککەوتنی ئازاریش پەیوەندیی بە کوردەوە هەبوو و پارتیی هیچ پێداگرییەکی بۆ بەشداریکردنێکی فەرمیی ئێمە نەکرد لە دانوستانەکاندا.[203]

یەک لە سەرکردەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان، کە لە سەرەتای لێک نزیکبوونەوەیان لەگەڵ بەعس قسەی بۆ سەرکردەکانی بەعس دەکرد پێیگوتن: ئێمە لە باکوور درێژکراوەی ئێوەین و ئێوەش لە باشوور درێژکراوەی ئێمەن. کاتی خۆی ئەو بابەتەم لەگەڵ برایانی پارتی ورووژاند و پێمگوتن.... ئەدی ئێمە وەک حیزب!! کە لێکحاڵیبوون و هاوبەشی و هاوپەیمانییەکی زۆرمان لەنێواندایە.[204]

شەوکەت خەزنەداری سەرکردە لە حیزبی شیوعی، ئەوەی دووپاتدەکاتەوە و دەڵێ: کە سامی عەبدولڕەحمانی ئەندامی مەکتەبی سیاسیی پارتی دیموکراتی کوردستان سەردانی بارەگای حیزبی شیوعیی کرد و چاوی بە عەزیز محەمەد

---

[203] _ دیدارێک لەگەڵ عەزیز محەمەد ٢٠١٥/٦/١٢.

[204] _ دیدارێک لەگەڵ عەزیز محەمەد ٢٠١٥/٥/٢٢.

کەوت، ڕێک ئاوای پێگوت: "ئێمە بەناوی بارزانییەوە پێشنیارتان بۆ دەکەین و داواتان لێدەکەین، بە تەواوییش ئامادەین چۆنتان دەوێ ئاوا لەگەڵتان ڕێککەوین، بەڵام تاکە مەرجمان ئەوەیە لەگەڵ بەعسی دەسەڵاتدار نەچنە ناو هیچ بەرەیەکەوە"[205] لەکاتێکدا وەک دەردەکەوێ مکوڕیی شیوعییەکان لەسەر بەشداریی "پ د ک"، وەک مەحمود عوسمانی سەرکردە لە پارتی دەڵێ، بۆ ئەوە بووە پێگەی خۆیانی پێ بەهێز بکەن.[206] سووربوونمان لەسەر بەشداریی پارتی لە بەرە، بۆ ئەوەبوو بەرانبەر سیاسەتی هەڵگەڕانەوەی لەناکاوی بەعس پارێزبەندییەکی بدەینە بەرە. بەعس، دوای شلبوونەوەی هاوپەیمانییەکەیان لەگەڵ کورد، بۆ پتەوکردنی بەرەی ناوخۆ، سووربوو لەسەر ئەوەی بەهەر نرخێک بێ بەرە پێکبێنێ. ئێمەش بە چاوێک گومان و چاوێک دڵنیاییەوە و بە نیاز پاکییەوە چووینە ناو بەرە و، ئەوەش موحسین دزەیی سەرکردە لە پارتی دیموکراتی کوردستان دووپاتیکردەوە.[207] دوای لێکحاڵیبوون لەگەڵ بەعس، کارەکە هاتەسەر لێکحاڵیبوونی ناو حیزبی شیوعیی عێراقی و، ئێستا دەبووایە مەکتەبی سیاسی و لیژنەی مەرکەزی قبوولی بکەن بچینە ناو بەرە. کە دەنگدانیش لەوبارەیەوە دەستی پێ کرد و بابەتی چوونە پاڵ بەرەی بەعسم خستەڕوو، لیژنەی مەرکەزی سەبارەت بە گرێدانی هاوپەیمانی لەنێوان ڕای پشتگیری و

---

[205] _ نقلاً عن شوكت خزندار، المصدر السابق، ص٢٣٠.

[206] _ دیدارێک لەگەڵ مەحمود عەسمان ٢٠١٢، هەولێر.

[207] _ محسن دزه ئي، المصدر السابق، ج٢، ص ٧٦.

ناڕازیدا بەســەر دوولادا دابەش ببوو. خەڵکێکی زور لە ڕووە، بنەماوە بەو بیرۆکەیەی ناڕازیبوون و، داوایان کرد ئەو بابەتە لە چەندوچوون ببردرێتە دەرەوە[208]. کە داوای دەنگدانیشـــم لەســەر بابەتەکەکرد حەوت ئەندامی لیژنەی مەرکەزی دەنگیان بە ڕەزامەندی بۆ دا و هەشتیش ناڕازیبوون. کە پێشنیارەکەیش ڕەتکرایەوە ، قســـەم بۆ ئەنـدامـانی لیژنەی مەرکەزی کرد و پێمگوتن چوونە نــاو ئەو بەرەیە بۆ حیـزبمــان بووەتە پێویستییەکی زۆر پێویست و، وەک دەرخستنی نیازپاکییەکیشە بەرانـبەر بەعـس کە ئێمە پشـــتیوانیی ســـیاســـەتە پێشـــکەوتنخوازەکــانیــان دەکەین. نــابێ ئەوەش بە نهێنی بمێنێتەوە، چونکە لایەنگرانی حیزب هیچ بەرهەمێکیــان لێ نەدەچنییەوە. کە دەنگدانیشمان دووبارەکردەوە، دەنگی ئەحمەد بانیخێڵانی لە ڕیزی ناڕازییانەوە هاتە ڕیزی ڕازییان تا بەرە دروســتکرێ. ســەرباری هەموو شـتێکیش دەنگەدەنگێک لەناو لیژنەی مەرکەزی دروســتبوو، لەســەرووی هەمووشــیانەوە بەهادین نوریی پێیوابوو چوونە ناو بەرە وەک ئەوەیە حیزبی شیوعی خۆی بکوژێ.[209]

---

[208] _ لە کۆبوونەوەی لیژنەی مەرکەزی چەندوچوون لەســەر هاوپەیمانیی بەعس کرا، لیژنەی مەرکەزی بەسەر دوو بەرەدا دابەش ببوو، هەندێک لەگەڵ هاوپەیمانییەکە بوون هەنـدێکیش دژی بوون. کە ســـکرتێری حیزب بـابەتی چوونە نـاو هـاوپەیمـانییەکەی خســـتەڕوو تەنیا حەوت دەنگی ئامادەبووانی لەگەڵدابوو و هەشـــت دەنگیش لە دژی هاوپەیمانییەکەبوون، جا کە دیســـان خرایەوە دەنگدان ئەحمەد بانیخێڵانیی ئەندامی لیژنەی مەرکەزی لە بەرەی ناڕازییەوە چووە بەرەی ڕازییان و ئیدی تای تەرازووەکەی بەلای ڕەزامەندیدا شکایەوە.بۆ زیاتر: شوکت خزندار، المصدر السابق، ص222.

[209] _ دیدارێک لەگەڵ عەزیز محەمەد ٢٠١٥/٥/٢٢.

دوای واژووکردنی پەیماننامەی بەرە، عەزیز محەمەد لە ڕێی لاپەرەکانی "الفكر الجديد" وەها وەســـفی ئەو هاوپەیمانییەی بەعس دەکا کە"ئامرازێکی دروســـتی کۆکردنەوەی هەموو وزە نیشـــتمانییەکانە تا ئەرکەکانی قۆناغی ڕزگاریی نیشـــتمانی و شۆڕشی نیشتمانیی دیموکراتیی پێ جێبەجێ بکرێ".[٢١٠]
هەندێ سەرکردەی بەعس و لەوانەش مێشێل عەفلەقی لە چەند دیدارێکدا ناســـیم، پێشـــوازییان لەو هاوپەیمانییە کرد لەگەڵ ئێمەیـان کردووە. جـا جـارێکیـان ســـەردانیمـان کرد و لە قســـەکردنێ لەســـەر دوو خاڵ چڕبووینەوە : پەیوەندیی بەرەیی و پاراســـتنی و ، پەیوەندی لەگەڵ یەکێتیی ســـۆڤیەت. ئەگەر مەبەســـتی ئەوە بووبێ کە گوتی، ئەوا پێدەچوو هاوکارمان بێ، ئاخر گوتی : "من ئەو بابەتە بە ئەرکی خۆم دەزانم". دەبێ لەو بارەیەشەوە بڵێین کە سەرکردە بەعسییەکانی عێراقی نەبوون، لە مێوانێـک بترازێ هیچی دی نەبوون. مـاوەیەک لەمـاوەکـان دەماندیت لە هەندێ ئاهەنگ عەفلەق بەپێش دەکەوت و ئەوجا شبل ئەلعیسەمیی ئەمینداری گشتیی حیزبی عەفلەقی بەدوایەوە و، دوایەش ئەلبەکر و ســـەدام دەهاتن. بە بڕوای من کارەکە هەر شـــانۆگەرییەک بوو. ســـەدامیش وریای ئەوەی بوو لە ئـاهەنگە حیزبییەکـان هەمیشـــە دوای عەفلەق بێتە ژوورەوە. بەڵام ئەوە مانای ئەوەی نەبوو کە عەفلەق کاریگەرییەکی بێ چەندوچوونی هەیە. ئەوان وەک رووکارێکی پێویســتیان پێیبوو مامەڵەیان لەگەڵ عەفلەق دەکرد، وەک دیکۆرێک و، هەوڵیان

---

[٢١٠] _ طارق مجيد تقي البلداوي، المصدر السابق، ص 126-127.

دەدا لە ململانێیان لەگەڵ ســـوریا ســـوودی لی ببینن و ...
ئەوەتا "سەرکردایەتییە مێژووییەکە" لەگەڵ ئەوانە!
کۆبوونەوەی ڕێکوپێکی بەرە دەکرا و، لەو کەســانەی ئامادەی دەبوون تــاریق عەزیز بوو و جــا لەگەڵ هــاوڕێیەکی ئێمە خەریکی ئـامــادەکردنی بەیـاننــامە دەبوون. ئەو وتــارەکـانی سەرکردە دیارەکانی وەک ئەلبەکر و سەدامیشی دەنووسی. کە کەسـێکیش لێی بپرسـیبا ئەرێ بۆ ماوەیەکە دیارنی و ناتبینین، دەیگوت:خۆم بۆ وتـاری فلانەکەس تەرخـان کردووە. ئەو لەو تــاقمەبوو کە بەزۆر و بە خوایشـــــت لە دەوری ســـــەدام کۆببوونەوە. چونکە هیچ مەترسـییەکیشـی بۆ سـەدام نەبوو و هێزی خۆیشـــی لە ســـەدامیڕا وەردەگرت، دواترێ توانیی بە پلەکاندا سەرکەوێ و ، کەسانی دیکەی وەک عیزەت دووریش دەرکەوتن کە کاریگەرییان لەســـەر بەرە هەبوو، بەڵام خۆیان هیچ نەبوون. ناکرێ جێگرەکەی ئێسـتا و ئەوەی رابردوو، واتە ســـەدام، پێکەوە بەراورد بکەی، ئەوەی ئێســـتا جێبەجێکارێکی گوێڕایەڵە و بەس. ڕۆژێکیــان کۆبوونەوەیەکی ئەنجوومەنی ســـەرکردایەتیی شـــۆڕش و ســـەرکردایەتیی قوتریی حیزبی بەعس کرا و ، بابەتی "دیموکراتی"و فرە حیزبی"ی تێدا خرایە روو. ئەوەش دوای شـــەڕی عێراق و ئێران بوو. جا ســـەدام دەرگاکەی کردەوە تا ئامادەبووان ڕای خۆیان دەربڕن. عیزەت ئیبراهیم گوتی، ئێمە ملیۆن و نیوێک بەعســـیمان هەیە و ئەگەر خـــانەوادەی هەر یەکێکیشـــیـــان شـــەش کەس بن ئەوا هەمووعێراقییەکان بەعســـین. ئەرێ دەتانەوێ حیزبێکی دیکەی غەیری حیزبەکەیان لە بەعسییەکان دروستکەین؟ جا ســـەدام

هاته ناو قسان و قسەیەكی جودا لەو قسەیەی كرد. بەڵام تەنیا سـەركردە بۆی هەیە ئەو جۆرە قسـانە بكـا، ئەوجـا بۆ مەبەسـتێكی خۆی خەملاندبووی گفتوگۆیەكـانی ئەو ڕۆژە دزەیان پێ كرا ، تا بڵێن سەدام بەلای گۆڕاندایە بەڵام ئەندامانی سـەركردایەتی ناڕازین، سـەدام ئەو جۆرە كۆبوونەوانەی بۆ ئەوە بەكاردێنا تـا نیـازی خەڵكەكەی پێ تـاقیكـاتەوە و وێنەی خۆیشـی لەسـەر حیسـابی ئەوانیدی پێ جوان بكا. لە قۆناغێكی شـەڕی ئێراندا، سـەدام كۆبوونەوەیەكی كرد و، مەرجی ئێرانی بۆ ڕاگرتنی شەڕ خستەڕوو كە لاچوونی ئەوبوو لە دەسەڵات، جا ڕای ئامادەبووانی پرسی. وەزیری تەندروستی گوتی باشە ئەگەر هەر بەرواڵەتیش بێ بۆ ئەو كـارە نەكەین، سـەرۆكی فەرماندە دەسـت لە دەسـەڵات بەردا و كەسـێكی دی بێ. جا كە شەڕ ڕاوەستا ئیدی سەرۆكی فەرماندە بێتەوە و سەركردایەتی وەرگرێتەوە؟ ئەنجامەكەیشی لە سێدارەدانی وەزیرەكە و چەند كەسی دی بوو كە پێیانوابوو وەک ئەو بیردەكەنەوە.[٢١١]

---

٢١١ _ مقابلة مع عزيز محمد؛ حوار غسان شربل مع عزيز محمد، مجلة الوسط، لندن، 1997.

## کاره سەربازییەکانی حکوومەت
## لە باکووری عێراق:

دوای واژووکردنی بەیاننامەی ١١ی ئازاری ١٩٧٠، چونکە هەرلایەک دەیویست خواستەکانی خۆی بەسەر ئەویدیدا بسەپێنێ و هیچ لایەکیشیان نیەتێکی ڕاستەقینەی نەبوو تا بەرەو ئەو ڕێیەی بچن ئەوەی لەسەری ڕێککەوتوون دەستەبەری بکەن، ئیدی پەیوەندیی نێوان بەعس و پارتی گەیشتە ڕێیەکی ئەوسەری دەرنەدەچوو. ئەوەش وایکرد هەوڵەکانی بەعس لە تیرۆرکردنی مستەفا بارزانی و هەوڵی تیرۆرکردنی هەندێ سەرکردەی کورد و کەمەندکێشکردنی کوڕانی بارزانی بەلای حکوومەتدا قووڵ ببێتەوە. هەموو ئەوانەش بوونە کۆسپی لێک تێگەیشتنی هەردوولا.[٢١٢]

لەلایەکی دیکەوە، حکوومەت، دوای بەرزبوونەوەی نرخی نەوت و بەردەستبوونی توانای ئابووریی گەورەی عێراق، دەستی بە بەفیڕۆدانی داهاتەکانی نەوت کرد تا دامەزراوەی سەربازی و ئاسایشی پێ بنیات بنێ. سەرکردایەتیی کوردیش لای خۆیەوە لەدەرەوە دەستی بە گەڕان کرد تا پشتیوانیی سەربازیی دەستکەوێ، کە ئەوەش هەلێکی دایە ئێرانییەکان و ئەمریکییەکان تا، بۆ فشار خستنە سەر حکوومەت، دەست لە دۆسییەی کوردی وەردەن. ئیدی بەرەڕووبوونەوەی حکوومەت

---

٢١٢ _ شكيب عقراوي، المصدر السابق، ص355-356.

و بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد بووە کـارێکی حەتمیی هەر دەبووایە ڕوو بدا.
لە سـایەی قەیرانی ئەو بارودۆخە و ئەو حاڵەگشـتییە، سـێزدە قوتـابیی شـــیوعیی لە مۆســـکۆ و لە خوێنـدنی حیزبی گەڕابوونەوە، کە ســـەربـاری ئەوەی پـارتی ڕێی گەڕانەوەی دابوون، کەچی عیســــاســــوار کوشـــتنی، بۆ ئێمە کـارێکی هەوتکەر[٢١٣] و لەهیکڕابوو. ئەوەش هـاوکـاتی ئەو تەنـگ پێ هەڵچنینـانەبوون کە دژی بـارەگـاکـانی شـــیوعی و خەڵکە شیوعییەکەی کوردستان دەکران.[٢١٤] ئیدی، بەو ئەنجەتەی ئێمە لە هـاوپەیمـانیی نەیـارەکەیـانین، واتە دۆســـتی حکوومەتین، تەقە یان لە بارەگاکان دەکرد و خەڵکی ناو ڕیزەکانی حیزبی شـــیوعییان تیرۆر دەکرد و مەبەســـتیشـــیان چۆڵکردنی ئەو بارەگایانە بوو. ســـەرەتا ناڕەزایی خۆمان بەرانبەر بەو کارانە دەربڕی و پەیوەنـدیمـان بە ســـەرکردە کوردەکـانەوە کرد. داوامان لە بارزانی کرد ئەو تەنگەتاوکردنانەی بارەگاکانمان ڕاگرێ. وەڵامی ئەو ئەوەبوو چیتان بۆ بکەین....، ئەو کارە وەک نـاڕەزایی دەربڕینی چینە، لەوەی بۆ ئەمریکـا هەیە!! ئیـدی قەیرانی نێوان ئێمە و پارتی گەورەتربوو و، لەگەڵیشیدا ، دوای دەرکردنی یاســـای ئۆتۆنۆمیی ١١ی ئازاری ١٩٧٤، کرداری ســـەربازیی حکوومەت لە ناوچەکانی کوردســـتان ســـەریان

---

٢١٣ _ هەوتبوون: شۆکبوون

٢١٤ _ سيف عدنان ارحيم القيسي، الحزب الشيوعي العراقي في عهد البكر، ص415.

هه‌ڵدا.[215] جا سه‌رکردایه‌تیی کورد پێیوابوو یاسایه‌که ...
داڕێژراوه بێ ئه‌وه‌ی لایه‌نی پارتی هیچ ڕایه‌کی تیدا هه‌بێ،
پارتی له داڕشتنی یاسایه‌که‌ش ناڕازیبوو چونکه ده‌سه‌ڵاتی
حکوومه‌تی پته‌وده‌کرد و سیاسه‌تی به‌عه‌ره‌بکردنی ناوچه
کوردییه‌کانی جێبه‌جێ ده‌کرد و، ئه‌وه‌ش ترسی بزووتنه‌وه‌ی
کوردی ورووژاندبوو.[216]

دوای هه‌ڵگیرسانی ڕووبه‌ڕووبوونه‌وه‌ی سه‌ربازی، ئیمه،
له‌نێوان لایه‌نگریی کرده سه‌ربازییه‌کان و ڕه‌تکردنه‌وه‌ی ئه‌و
کردانه‌دا، هه‌ڵوێستمان زۆر ناخۆش ببوو. سه‌رباری
ناوبژیوانییه‌کی له‌گه‌ڵ سه‌رکردایه‌تیی کورددا کردمان، به‌ڵام
سوودێکی نه‌بوو. دوای ئه‌و بارگاوی کردنه‌وه‌ی له‌ده‌ره‌وه‌ڕا
بۆ خۆشکردنی ئاگری شه‌ڕ کرا ، بارودۆخه‌که زۆر شلۆق بوو.
به‌پێی ئه‌و ڕێککه‌وتنه به‌ره‌یییه‌ی له‌گه‌ڵ به‌عسمان هه‌بوو، پشتی
شه‌ڕی حکوومه‌تمان گرت دژی سه‌رکردایه‌تیی کورد و[217]،

---

[215] _ موحسین دزه‌یی سه‌رکرده له پارتی دیموکراتی کوردستان ده‌ڵێ، لیژنه‌یه‌ک هه‌بوو بۆ به‌دواداچوونی جێبه‌جێ کردنی بەندەکانی ١١ی ئازاری ١٩٧٠ لایه‌نی کوردیش نوێنه‌ره‌کانی هه‌ریه‌ک له حه‌بیب محه‌مه‌د که‌ریم و سامی عه‌بدولڕه‌حمان و ساڵح یوسفی و من و دارا توفیق بووین. هه‌رچی لایه‌نی حکوومه‌ت بوو سه‌دام حوسین سه‌رۆکی لیژنه‌که بوو و ئه‌وانیدی هه‌ریه‌ک له غانم عه‌بدولجه‌لیل و عه‌دنان حه‌مه‌دانی بوون و نوێنه‌ری حیزبی شیوعییش هه‌ریه‌ک له که‌ریم ئه‌حمه‌د ئه‌لداود و موکه‌ڕه‌م تاڵه‌بانی بوون. بۆ زیاتر : محسن دزه ئي، المصدر السابق، ص236.

[216] _ دیدارێک له‌گه‌ڵ عه‌زیز محه‌مه‌د ٢٠١٥/٦/١٢.

[217] _ موکه‌ڕه‌م تاڵه‌بانیی سه‌رکرده‌ی شیوعی باسی ئه‌وه‌ی ده‌کا که چه‌کهه‌ڵگرتنی شیوعییه‌کان له‌به‌ر ئه‌وه‌ی بوو مه‌رجێکیان بۆ لایه‌نگریی بزووتنه‌وه نه‌ته‌وه‌یییه کوردییه‌کان دانابوو به‌وه‌ی ده‌بێ دوژمنی ئیستیعمار بن، بۆیه دروشمی ئیستیعمار و پیلانه‌کانی له‌سه‌ر به‌ردی یه‌کێتیی عاره‌بی – کوردی تێکوپێک ده‌شکێ ئه‌وه‌ش له‌ته‌... ئه‌وه‌یدابوو که کورد خۆی ده‌توانێ بڕیاری چاره‌نووسی خۆی بدا و له‌وانه‌ش، ...

هۆی ئەوەش قەبارەی ئەو دەستتێوەردانەی بێگانە بوو کە هەوڵی دەدا دۆسییەی بزووتنەوەی کورد بقۆزێتەوە. شیوعییەکان چەکیان لەگەڵ هێزەکانی حکوومەت هەڵگرت، بەڵام بەو شێوەیەی نا کە باسی لێوە دەکرا. ئاخر ئێمە توانای چەک هەڵگرتنمان سنووردار بوو و، هەڵوێستی بەعسیش لەلایەکی دیکەوە مکوڕبوو کە دەبێ بەپێی ئەو هاوپەیمانییەی لەنێوانمانە ئێمەش لەگەڵیان بوەستین.[٢١٨]

لەگەڵ بەردەوامیی کردە سەربازییەکان، ڕوون و ئاشکرا دیاربوو کەس لەو بەرەوڕووبوونەوەیەی نایباتەوە. ئەوەش وایکرد ڕژێمی بەعس بە ناوبژیوانیی جەزائیر ڕازیبێ و، ئیدی ڕێککەوتننامەی جەزائیر لە ١٩٧٥دا کرا. بەپێی ئەو ڕێککەوتنەش، عێراق، بەرانبەر بەوەی شا چیدی پشتیوانیی بزووتنەوەی کورد نەکا، دەستی لە مافە هەرێمییەکانی خۆی لە شەتولعەرەب بەردا. هەر واش دەرچوو و بێ ئەوەی لایەنی ئێرانی هیچ ئاگادارییەک بداتە سەرکردایەتیی کورد،

---

پێیوابوو لە بەرژەوەندییدایە، مافی جیابوونەوە و دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆی خۆی بدا. حیزبی شیوعیی عیراقییش درکی بەوەی دەکرد ئەو ولاتانەی دەست لە کاروباری کوردستان وەردەدەن ڕەتیدەکەنەوە دان بەوەیدا بنێن کوردستان هەیە و ڕەتیدەکەنەوە نەتەوەی کوردیش هەبێ، جا شیوعییەکان لە ١٩٦١ - ١٩٧٥ کاتێ ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا و حکوومەتی شای ئێرانیش دەستیان لەکارەکەی وەردا تا ئەو دەسەلاتە ئیئتیلافییەی پاشەل بکەن کە پارتی دیموکراتی کوردستان خۆیشی تێیدا بەشدار بوو و دانی بە ئۆتۆنۆمیی کورداندا نابوو، ئەودەمی حیزبی شیوعیی عێراق ئامۆژگاریی سەرکردەکانی بزووتنەوەی کوردییان کرد خۆ نەدەنە دەست. بۆ زیاتر: مکرم الطالباني، مراحل تطور الحركة القومية، ص ٧٩٧-٣٩٩.

[٢١٨] _ دیدارێک لەگەڵ عەزیز محەمەد ٢٠١٥/١٠/٢.

بزووتنەوەی کورد لە هیکرا و بە خێرایی هەرەسـی هێنا و ئێران ئەو کارەی بە کارێکی ناوخۆ لە قەڵەم دا. بەوەش، عێراقییەکان لێکحاڵیبوونی ناوخۆیان لەدەستچوو، کورد شەڕی دۆڕاند، عێراقیش ناوچەی دەسەڵاتی لە شەتولعەرەب لەدەستدا.[219]

[219] _ شكيب عقراوي، المصدر السابق، ص٣٨٣-٣٨٤.

# سەرکردنی ڕێکخراوە دیموکراتییەکان:

دوای ڕێککەوتنی جەزائیر، حکوومەت توانیی بزووتنەوەی چەکداریی کورد کۆتایی پێ بهێنێ کە باری سەرشانی قورس کردبوو. ئیدی، دوای ئەوەی گۆڕەپانەکە هیچ نەیارییەکی بەڕاستیی تێدا نەما، ڕێ بۆ بەعس خۆشبوو تا دەسەڵاتی خۆی بەسەر زەویدا بسەپێنێ. کوردەکان بەرەو خاکی ئێران کشانەوە و خاکی خۆیان بەجێهێشت و، سوپای عێراق توانیی بچێتە هەموو ناوچە کوردییەکان.

بەوەش، لە ئێمەی هاوپەیمانی بەرەیی بترازێ، هیچ هێزێکی کارکردەی نەیار نەما. جا لە بەراییڕا، بە بیانووی کۆتاییهاتنی کردە سەربازییەکان، دەستیان بە سەندنەوەی چەکەکانی ئەو جەنگاوەرە شیوعییانە کرد کە شان بەشانی سوپای حکوومەت لە ناوچە کوردییەکان جەنگابوون. ئێمە، ئەوڕۆ نا سبەی، پێشبینیی ئەو هەڵگەڕانەوە سیاسییەی بەعسمان دەکرد، نەخاسمە دوای کۆتاییهاتنی بزووتنەوەی چەکداریی کورد. ئیدی کارمان بۆ شاردنەوەی هەندێ چەک کرد تا دواترێ ئەگەر ناچاری چەک هەڵگرتنێ بووین بەکاریان بهێنین.[٢٢٠]

بەعس خەریکبوو لە هەندێ کەرەستەی داهێنراوی بیرکردنەوەی خۆی دەگەڕا تا بەهۆیەوە کۆتایی بەکاری بەرەیی بهێنێ، جا نموونەیەک لەوبارەیەوە دەگێڕمەوە، ئەودەمەی لەسەرەتای پەیوەندیی بەرەییدابووین کەسێک هات

---

٢٢٠ _ دیدارێک لەگەڵ عەزیز محەمەد ٢٠١٥/٦/١٢.

و گوتی دەیەوێ بمـانبینی. چیی دەوێ؟ گوتی تـاقمێکی سەربازیی گەورە هەن هەموو ئامادەکارییەکیان بۆ رووخاندنی ڕژێم تەواوکردووە، بەڵام نایانەوێ بەبێ حیزبی شـیوعی ئەو کارەی بکەن و ئامادەیە هەموو وەزارەتە بنچینەییەکان بداتە حیزب. بەو هاوڕێیەم گوت کە پرسـیاری ئەوەی دەکرد داخوا ئەو هەموو بەخشـندەییە لە کوێڕا هاتووە، ئەرێ تۆ لەو کەسـە دڵنیای؟ گوتی من دڵنیام. لەمەکتەبی سـیاسـی کۆبووینەوە و ئەو کـارەمـان بە تەڵەیەک دانـا کە دەیـانەوێ حیزبی تێکەوێ. کابرا ناوی ئەحمەد ئەلڕاوی بوو و، ئەگەر لەبیرم بێ پلەکەیشی عەقید بوو. جا سـیناریۆیەکی تەواویشـی هێنابوو و گوتی لێرە تـانکمـان هەن و، لێرە ئـاسـتەنگمـان هەیە، بەڵام دەتوانین بەسەریدا زاڵبین. مەبەست ئەوەبوو باوەڕ بکەین تێبکەوین. جا ئەو هاوڕێیە پێشـنیاری کرد لانیکەم با کەسـەکە ببینین و زانیـارییەکـان بزانین. پێمگوت تۆبڵێی ئەگەر ببیینین ئەو زانیارییانەی هەیشـمانە لامان بمێنێ؟ تووشـی لەناوچوون دەبین. لە دیدارێکدا لەگەڵ ئەلبەکر ناوی ئەفسـەرەکەم لەسـەر کاغەزێک نووسـی و بە ئەلبەکرم گوت:"ئەبو هەیسـەم ئێمە داوادەکەین ئەو کابرایە لێمان دوورکەوێتەوە". بەکر سەرسامیی نەنواند و هەر ئەوەندە گوتی:"چ ئەوەی گەیاندووەتە لای ئێوە؟". لە هەمـان کـاتـدا کەسـێکی دیکەیـان ڕەوانەی لای پـارتی دیموکراتی کوردسـتان کردبوو و، بەسـای ئەوەش خەڵکێک لە سـێدارە درابوون. ئێمە جارجار گلەییمان دەبردە لای بەکر و دەیگوت: "بەرەمان بۆ پێکهێنان و کارەکەشـمان داوەتە دەسـت سەدام". ڕواڵەتەکانی هەڵگەڕانەوەی بەعس لەوەیدا دەردەکەوت

کە داوایان دەکرد ڕێکخراو و سەندیکا شیوعییەکان لەگەڵ ڕێکخراو و سەندیکاکانی حیزبی بەعس تێکەڵ بکرێن. دوای دەمەتەقێی ناو حیزبی شیوعیی عێراقی، دیتمان بەرژەوەند وایە ڕێکخراوە جەماوەرییەکانمان سڕ بکەین و، لەسەر بنەمای ئەو هاوپەیمانییەی لەنێوانماندا بوو، بەهێزەوە بچینە ناو ڕیزەکانی ڕێکخراوە حکوومییەکان. ڕاستییەکەی ئامانجی سڕکردنەکە ئەوەبوو لەجیاتیی بەرەوڕووبوونەوەی بەعس ئێمە کادیرەکانی حیزب بپارێزین.[221]

حیزبی شیوعیی عێراقی لە تشرینی دووەمی ١٩٧٥، وەک ڕێوشوێنێکی ناچاریی کاتی، بڕیاری سڕکردنی چالاکیی ڕێکخراوەکانی دا، چونکە بەعس سڕکردنی ڕێکخراوە شیوعییەکانی وەک مەرجێکی مانەوەی هاوپەیمانیی بەرەیی دانابوو و، ئیدی مانای نەمانی شیوعییەکان بوو لە ڕێکخراوە جەماوەرییەکان و لە سەرکردایەتییەکانیان و لە کۆتایی کارێش لادانی نماینەدەیی ڕێکخراوە شیوعییەکان لە ڕێکخراوە دیموکراتییەکان تاخۆیان جێیان بگرنەوە.[222]

بەڵام، واپێدەچوو بەعس لەسەر ئەوەی سووربێ هاوپەیمانی لەگەڵ شیوعییەکان کۆتایی پێ بێنێ و، ئەوەش لەبەر ئەو جەماوەرە زۆرە و ئەو هێزەی بوو کە ڕێکخراوە شیوعییەکان و کادیرەکانیان و ڕۆژنامەوانییەکەیان هەیبوو و ، فرۆشی ڕۆژنامەی "طریق الشعب"گەیشتبووە چەندین هێندەی ڕۆژنامەی "الثورة"ی

---

[221] _ دیدارێک لەگەڵ عەزیز محەمەد ٢٠١٥/٦/١٢.

[222] _ دیدارێک لەگەڵ عەزیز محەمەد ٢٠١٥/٦/١٢.

ئەوان.[223] ئەوەش بەعسی تووڕەکرد و، ئیدی ڕەخنەیان ئارا[illegible]
حیزبمان دەکرد گوایە ئێمە نەیاری ڕێچکەی ئەوانین و، لە [illegible]
ڕەخنە گرتنمان لە سیاسەتی گشتییان لە ڕۆژنامەکانماندا، کار [illegible]
لەگەڕخستنی ڕەوڕەوەی پێشکەوتنی ئابووری دەکەین.[224]
لە سایەی ئەو سیاسەتی پاشەکشەیەی، بەعس لای خۆیەوە دەستی بە بەعسیکردنی کۆمەڵگەی عێراقی کرد. ئەوەش ترسی لای ئێمە دروستکرد. چاوم بە سەدام حوسێن کەوت و دارمانی پەیوەندییەکانی هەردوولام بۆ ڕوونکردەوە، ئاماژەی بەوەی دا کە شیوعییەکان نایانەوێ بەرە بکەنە کەرەستەی هاوپەیمانی، بەڵکو دەیانەوێ بیکەنە کەرەستەی گەیشتنە دەسەڵات. لێم پرسی چۆن؟ ئیدی خەریکبوو هەندێ بابەتی دەورووژاند کە هیچ ڕاستییەکیان تێدا نەبوو. کە بۆشم ڕوونکردەوە عێراق هێشتا بێ یاسایەکی ژیانی دیموکراتییە و هێشتا دەستوورێکی هەمیشەیی و هەندێ شتی دیکەی نییە. ئیدی سەدام وەڕەسی خۆی لەوەی دەربڕی و سەبارەت بەسیاسەتی ئەو قۆناغەی ئێستایان دەستی بە قسان کرد، گوایە پێویستی بە پێشکەوتنی پتر هەیە. وەهایشی قسە دەکرد وەک ئەوەی کەسی یەکەمی حکوومەت بێ. لەکاتی گفتوگۆکردنم لەگەڵیدا هەندێ دەربڕینی سەیری دەکرد و ئاماژەی بەوەی دا: "من دەسەڵاتی سەرۆککۆمارم هەیە و، سەرۆککۆمار دەسەڵاتی منی نییە". ئەودەمی گەیشتینە ئەو بڕوایەی هاوپەیمانی گەیشتووەتە ڕێیەکی ئەوسەری دەرناچێ.[225]

---

[223] _ ذكرى عادل عبدالقادر ، رابطة المرأة العراقية ودورها في الحركة النسوية في العراق ١٩٥٢-١٩٧٥(دراسة تاريخية)، دار الرواد المزدهرة، بغداد، ٢٠١٥، ص٢٠٢-٢٠٣.

[224]

[225] _ دیدارێک لەگەڵ عەزیز محەمەد ٢/١٠/٢٠١٥.

# لەداردانی ئەفسەر و سەربازە شیوعییەکان و کۆتاییهاتنی بەرە:

ئەو سیاسەتی پاشەکشەیەی حیزبی بەعس گرتبوویە بەر، دوو پاتیکردەوە ئەو حیزبە دەیویست بەرە تەنیا ڕووکاری ڕژێمەکەی بێ و، شیوعییەکان لەگەڵ هەموو بڕیارەکانیاندا بن و دژی نەبن. لەکۆبوونەوەیەکی هاوبەشی بەرە و بە ئامادەبوونی سەدام حوسێن، وەڕەسیی خۆم لەو کارە دەربڕی و پێمگوت: "گفتوگۆی ناو بەرە دەبێ پشت بە بنەمای کۆڕایی ببەستێ نەک بنەمای تاکەکەسی." پێیشم گوت : "ئێمە ناتوانین ڕووکاری جوانکاریی ڕژێمەکەتان بین"[226]

حیزبی بەعس، لە ڕێی سەدام حوسێنی جێگری سەرۆکی ئەنجوومەنی سەرکردایەتیی شۆڕشی، دوای بەرتەسکردنەوەی دەسەڵاتەکانی سەرۆک ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر، دەریخست پێوەیە هەڵوێستێکی توندتری بەرانبەر هێزە سیاسییەکان هەبێ و، لەوانەش شیوعییەکانی تا دوای قەوارەبەند کردنی چالاکییە جەماوەرییەکانیان بۆیان دەرخا شیوعییەکانیش "دەکەونە هەڵەیەکی دیارەوە، چونکە هەر هاوڕێیەکیان پێیوایە سەربەخۆییە ئایدیۆلۆژییەکەی وای لێدەکا پێیوابێ تەنیا ئەوە ڕاستییە تەواو و ڕەهایەکەی لە جێبەجێکردندا لەلایە، ئەوجا پێداگری لەو بۆچوونەی دەکا و داوا لەوانیدی دەکا بێنە ژێر سایەی باڵی ئەو و، ئیدی هەموو هەڵسوکەوتەکانی دواترێی

[226] _ عزيز سباهي، المصدر السابق، ج٢، ص ٥٥.

دەکەویتە ژێر کـاریگەریی ئەو بۆچوونەی. جـا ئەگەر ئەو تێگەیشـتنە هەڵەیەی سـەربەخۆبوونەکەی بەردەوام بی، ئەوا بەرە ناگاتە ئاسـۆ سـتراتیژییەکانی"، کە ٢٢ سـەرکردەی حیزبەکەی خۆی لەسێدارەدا، یەک لەو تۆمەتانەی ئاڕاستەیان کرابوو گوایە بە چەند جاران پارەوپوولێکیان لە سـوریا وەرگرتووە، لەبیرمە بڕی هەرەپتری هەژدە هەزار دینار بوو! ئەری ئەقـڵ دەیبڕێ سـەرکردەیەکی عێراقیی ئەو هەموو پارەوپوولەی لەبەردەسـتی بێ پێویسـتی بەو جۆرە یارمەتییە ببێ؟ شـتێکی بەرزان تکریتیی زڕبرای سـەرۆکی عێراق و نوێنەری عێراقی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکـانی ژنێفم خوێندەوە، دەڵێ سـەدام، ئەگەر بەس دەمانچەکەیشـی مابێ، دەسەڵات بەجێ ناهێڵێ. بێگومان بەرزان خووی سەدام دەزانێ، ئەوی کە سـەرەتا نەناسـراو و پاشـکۆیەکی سـەدام بوو و دواتریش بەڕێوەبەریەتیی ئاسایشی گرتە دەست، ئیدی لە گەلێ شـت لەگەڵیدا هاوبەشـە. خەڵکێکیش هەن دەڵێن ئێسـتا بەرزان لەدەرەوەی عێراق سـەروسـامانی سـەدام و تۆڕێکی دارایی و هەواڵگرییش بەڕێوەدەبا.[227]

ئەو بڕیارانەی بەرەی دەردەچوون حیزبی ئێمە واژووی لەسەر نەکردبوون، بەڵکو ئـاژانسـی هەواڵەکـانی عێراق واژووی دەکردن، بەوەش ئێمە لە هەر بڕیارێک دووربووین کە لەگەڵ سیاسەتی ئێمە نەگونجابا. کە لە سـاڵی ١٩٧٧یش ڕووداوەکانی "خان النص" ڕوویاندا، بەعس هەر خێرا ڕێچکەی بەرانبەرمان

---

[227] _ دیدارێک لەگەڵ عەزیز محەمەد. غسـان شـربل حوار مع عزیز محمد، مجلة الوسط، ١٩٩٧.

گۆڕا و وەک حیزبێکی هاوپەیمان دەستی هانای بۆ هێناین!! نەک وەک حیزبێکی، بەعس کاری بۆ بچووککردنەوە و قەوارەبەند کردنی دەکرد.
لە سایەی ئەو پاشەکشەیە، لیژنەی مەرکەزی، لە ئازاری ١٩٧٨، کۆبوونەوەیەکی کرد و ڕاپۆرتێکی دەرکرد و تێیدا بە سووربوونەوە داوای لە بەعس کرد دەبێ ئەو هەڵمەتی گرتنانە ڕاگرێ و، دەست بە بنیاتنانی کۆڵەگەکانی سیستەمی دیموکراتی بکا، لەوانەش داوای کۆتاهاتنی ماوەی ڕاگواستنی دەسەڵات و هەڵبژاردنی کۆمەڵەی دامەزراوەیی"جمعیة تاسیسیة" تا دەستوورێکی هەمیشەیی بۆ وڵات دابنێن. ڕاستییەکەی، ڕاپۆرتەکە ڕەخنەیەکی توندی ئاڕاستەی بەعس کردبوو. ئەوەشمان لەو وەڵامدانەوانە بۆ دەرکەوت کە لە ڕۆژنامەی "الراصد" بڵاودەکرایەوە کە خەریکبوو هێرشی دەکردە سەر حیزبمان. بەعس داوای لێ کردین دەبێ لە ڕاپۆرتەکەی کۆبوونەوەی ئازاری١٩٧٨ پەژیوان ببینەوە و دەست لە بیروباوەڕەکانی بەردەین. ئەوەشمان بە توندی ڕەتکردەوە.[٢٢٨]
ئەو هەڵمەت و گورزانەی ئاڕاستەی ڕێکخستنەکانی حیزبی شیوعیی عێراقی کران مەودایەکی فراوانتریان وەرگرت. ڕژێم، لە ڕێی ئەو گورزانەی ئاڕاستەی ڕێکخستنەکانی حیزبی کردن، مەودای هەڵمەتەکەی خۆی فراوانتر کرد. لە ١٩٧٨/١١/١٢ هێرشێکی لەناکاوی کردە سەر ژمارەیەک شیوعی و

---
[٢٢٨] _ دیدارێک لەگەڵ عەزیز محەمەد ٢٠١٥/٦/١٢.

ئەفسەرانی پێشتری، بۆماوەیەک لە ڕیزی ونبووانیان دانا، و لە هەموو قوتابخانە و کۆلێژ و کارگە و یانەکانیش لیکولینەوەش، ئاسایش کرانەوە.[٢٢٩]

وەک لە ئێمەوە دیاربوو، حیزبی بەعس، بۆ ڕازیکردنی سعودییە و خۆ نزیکخستنەوە لە ویلایەتە یەکگرتووەکان و خۆرئاوا، دەیویست بەهەر شێوەیەک بووە کۆتایی بە هاوپەیمانییەکە بێنێ. ئیدی بابەتی ئەوەی دروستکرد کە گوایە شیوعییەکان ڕێکخستنیان لەناو هێزە چەکدارەکان دروستکردووە. سەدام حوسێن، بە بیانگەی ئەوەی خۆیان بو هەوڵێکی کودەتایی ئامادەکردووە، ٣١ کەسی لە سەرباز و شیوعییە مەدەنییەکان لەسێدارە دا. ئێمە ئەگەر بچینەوە سەر پلەی سەربازیی ئەو شەهیدانە دەبینین سەربازی خزمەتی ئالایان تێدایە، یان وەرزشوانێکی تیپی پۆلیسی پەنجا فلسی بۆ حیزب بەخشیوە بێ ئەوەی ئێمە هیچ ڕێکخستنێکمان لە ناو سوپادا هەبووبێ. ئەوەش ڕاستییەکە کە نامەوێ زوڵمی پێ لە واقیع بکەم. ئێمە هیچ ڕێکخستنێکمان لەناو هێزە چەکدارەکان نەبوو و، ئەوانیش ئەوەیان دەزانی. ئەوەی سەیرە ئەوەیە، ئەوان، وەک بەڵگەی ئالنگارییەک و سووک سەیرکردنێک، تابووتەکانی شەهیدەکانیان بە بەردەمی بارەگای حیزبی شیوعیدا برد، لەکۆتاییدا لە جودابوونەوە و دابڕان بترازێ بژاردەیەکی دی نەمابوو. چۆن دەکرێ ڕازیببین تەرمی

[٢٢٩] ـ فيصل الفؤادي، المصدر السابق، ص١١٤.

شـــیوعییەکـان بە بەردەمی بـارەگـایەکـانی حیزبـدا ببەن و خۆیشیان وا نیشان بدەن پەیوەندییەکیان لەگەڵ سەرکردەکانی ئەو حیزبە هەیە؟ چ بە خەڵکەکە بڵێین؟ ئەرێ پێیان بڵێین ئێمە ڕێککەوتنێکمـان لەگەڵ ســـەرکردایەتیی بەعس هەیە؟ هەندێ هاوڕێ وەســـیەتیان کردبوو تەرمەکانیان بەبەردەمی بارەگای حیزبدا ببردرێ و کەسوکارەکانیان وەسیەتەکەیان بۆ جێبەجێ کردن، هیچ ئەوزارێکمان بەدەســتەوە نەمابوو لە هانابردنە بەر لایەنان تا ئەو لەبەریەک هەڵوەشانە لەگەڵ بەعسدا ڕاگرن. داوا لە وڵاتانی دۆســـت و هەندێ حیزبی شـــیوعییەوە دەهاتن کە حیزبی بەعس بە دەســـت تێوەردانی ناوخۆی وڵاتی دادەنان و، لەداردانەکانی خێراتر کرد.[٢٣٠]

ســـەرباری ئەوەی هەوڵماندا کۆبوونەوەیەکی بەرە بکرێ و، گفتوگۆ لەســـەر بابەتی ئەو شـــەپۆلە لەداردانانە بکەین، کەچی ئەوان ئەوەیان ڕەتکردەوە. عامر عەبدوڵلا هەولیدا پەیوەندی بە ئەلبەکرەوە بکا، تا لەو بڕیاری لە سـێدارەدانانە کەلی بن، بەڵام ئەلبەکر هیچ بڕیـارێکی ڕاگرتنی ئەو لەداردانـانەی بەدەســـت نەبوو و، بگرە، دوای ئەوەی بە دەســـــت بەســـــەرداگرتنی دەســـەڵات لە لایەن ســـەدامەوە ڕۆڵی ئەو قەوارەبەند کرابوو، پەنجەمۆر و واژوویشـــــی لەســـــەر جێبەجێکردنی حوکمەکان نەکردبوو.[٢٣١]

گوناهی گەورەی ئێمە، لەوەیدا نەبوو کە ســـــەرمان بۆ بەعس دانەواند و داوایەکانیمان قبوول کرد، بەڵکو لەوەیدابوو کە ئێمە

---

[٢٣٠] _ دیدارێک لەگەڵ عەزیز محەمەد ٢٠١٥/٦/١٢.

[٢٣١] _ غادة فائق محمد علي، المصدر السابق، ص١٣١.

هاوپەیمانی حیزبێک بووین  نکۆڵیی لە دیموکراتی دەکرا، و ڕەوشـێکی فاشـییانەی لەناخیدابوو و، بە کاریگەریی کۆمەڵی هۆکار توند ببوو و، بەتایبەت لە سـایەی داهاتە مەزنەکانی نەوت و، ئەوانەش بەعسـیان کردە حیزبێکی فاشـی. هەموو خەمی ئەو حیزبە ئەوەبوو بەهەر ئەوزار و ڕێگایەک بێ پاریزگاری لە دەسەڵاتی خۆی بکا. سەرکردەکانیان، لەدیداران هەر بە زار بۆیان دووپات دەکردینەوە کە دەبێ بەرەی نێوانمان پەرەی پێ بدرێ. ئێمەش، خەیاڵپلاوێکمان سەبارەت بەو پەرەپێدانەی بەرە هەبوو، لەهەمان کاتیشدا گومانمان لە سیاسەتەکانیان هەبوو. ئاخر ڕۆژنامەی "الراصد"ی حکوومی بە ڕاشکاوی ناخ و ڕیچکەی دوژمنکارانەی بەعسیان بەرانبەر ئێمە خستەڕوو.[232]

232 _ دیدارێک لەگەڵ عەزیز محەمەد ٢٠١٥/٦/١٢.

# گەیشتنە دەسەڵاتی سەدام:

سـەردەمی دووەمی بەعسـی، چۆنی دەسـت بە پاکتاوی ئەو بازنانە کرد کە دەسـەڵاتی خۆی لەسـەر بنیات دەنان، بەهەمان گەرموگوڕییەوە دەسـتی بە پاکتاوی ئەو بازنانەش کرد کە دەکەوتنە دەرەوەی خۆی و گومانێکی دژبەرییان دەورووژاند. ئەوەش بە تیۆری "پیلان" ناسـراوە و هەر بەو تیۆرییەش ئەستێرەی سـەدام حوسـێنی جێگری سـەرۆکی ئەنجوومەنی سـەرکردایەتی سـەرکەوت و، ئیـدی، لەو کردەیەی بە کۆبوونەوەی هۆڵی خولدی مانگی تەمووزی ١٩٧٩ دەناسرێ، لە نەوە کۆنەکەی بەعس، دەسـتی بە لەنـاوبردنی کـادیرانی بەرایی حیزب و دژبەرانی خۆی کرد، وەک سـاڵح مەهـدی عەماش و حەردان عەبدولغەفار تکریتی و، پاشـانیش ئەو کادیرانەی ڕازی نەبوون ئەو بێتە سەردەسەڵات.[٢٣٣]

بەشـی شـیوعییەکانیش لە هیی کادیرە بەعسـییەکان کەمتر نەبوو، کە لە پاکتاوکردنی کادیرەکانیاندا بەرجەسـتە ببوو. ئەو ، پێش ئەوەی بگاتە دەسـەڵاتیش، بە شـیوعییەکان دەسـتی پێ کرد. لە کۆبوونەوەیەکی لیژنەی بـاڵای بەرەی نیشـتمانی و نەتەوەیی پێشـکەوتنخوازی لە ٢١ی ئابی ١٩٧٦ کرا، سـەدام هەڵویستی بەعسییەکانی بەرانبەر شیوعییەکان ئاشکرا کرد "کە هەموو کارە ئەرێنییە سـەرەکییەکەی حیزبی شـیوعی تەنیا پشتگیریی ئێمە بێ لەو ڕێوشوێنە شۆڕشگێڕییانەی دەیانگرینە

---

٢٣٣ _ حازم صـاغية، بعث العراق (سـلطة صـدام قياماً وحطاماً)، دار السـاقي، بيروت، ٢٠٠٣، ص٦٧.

بەر، لە کاتیکدا هەموو گەل پشـــتگیرییەکی ڕەهامان دەدا، وە
خۆماڵیکردنی نەوت و ئەو هەنگاوە مەزنانەی لەســــەر ڕیبازە
سـۆشـیالیزمی دەیانێین، ئیدی بەرەمان بۆ چییە؟ ئەری حیزبی
شـیوعی ئەگەر لەدەرەوەی بەرەش بێ دەتوانێ لەو هەڵویسـتە
زیاتری هەبێ؟ ئەرێ هەر پشـــــتگیریکردن لەوجۆرە بابەتانە
بەسە بۆ ئەوەی حیزبی شیوعی لە ڕێی ئەوەوە بەرچاوروونیی
ئەوەی بدا کە کارلێکی لەگەڵ شــۆڕشــدا هەیە و لەکاتێکیشــدا
هەڵەیەک ڕوودەدا ئەو لە دژمان دەوەستێتەوە؟ کە لە دژیشمان
دەوەســــتێتەوە لەوەشـــــدا مەبەســــتمان ئەوە نییە کە هەندێ
دروشـــــم بەرز دەکـاتەوە کە بەردەســـــــت نین، بەڵکو بە
ڕۆشـــنبیرکردن و بە کاری ڕۆژانە دژمان دەوەســـتێتەوە، لە
ڕێی ئەو شـــێوازەشـــەوە حیزبی شـــیوعی هەوڵدەدا لەســـەر
حیسـابی لایەنە نیشـتمانییەکانی دیکە دەسـتکەوت بەدەسـتبێنێ
و، لە بەرایی هەمووانیشـــــەوە حیزبی بەعســــی عەرەبیی
ئیشتیراکی". [٢٣٤]

ئەگەر بەدوای سـەرەداوی گەیشـتنە دەسـەڵاتی سـەدامدا بچین،
دەبینین دەگەڕێتەوە سـاڵی ١٩٦٨، ئەو کاتەی سـەدام خۆی بە
جێگری سەرۆک دادەنا، بەڵام ئەو سیفەتەی بە فەرمی لە ١٩٦٩
ڕاگەیـانـد. دەبێ ئـاوڕێـک لەوەی بـدەینەوە کە ســــەدام هەر
لەســــەرەتارا مکوڕ بوو دوو دەزگای بەدەســــتەوە بێ، واتە
نووســــینگەی ئاســــایش و نووســــینگەی ڕاگەیاندن. ئێســــتا
ڕســــتەیەکم لەبیرە ڕۆژێکیان پێیگوتم: "من دەتوانم بێمە جێی

---

٢٣٤ _ صدام حسين، المصدر السابق، ص ١٢-١٣.

ســــەرۆک، بەڵام ئەو نـاتوانێ بێتە جێی من".جـا ئەگەر لێکدانەوەیەکی ســـادەی ئەو ڕســـتەیەت بوێ، دەکرێ بڵێی لە دەقی دەســـتووردا هـاتووە جێگری ســـەرۆک، لەکـاتی ئامـادەنەبوونیدا، دەتوانێ جێی ســـەرۆک بگرێتەوە، بەڵام لە دەقی دەستووردا نەهاتووە کێ دەتوانێ جێی جێگری سـەرۆک بگرێتەوە. بەڵام مەبەســتی ڕاســتەقینەی ئەو ڕســتەیە ئەوەیە بڵێی سـەدام حوسێن بڕبڕەی پشتی ڕژێمە و، ڕژێم بە دەوری ئەودا خول دەخواتەوە. من پێموانییە دەربڕینی "پیاوی دووەم" هەر لە سـەرەتاوە بۆ سـەدام وەسـفێکی ورد بووبێ. ئەو، بۆیە بەو سـیفەتە ڕازی ببوو و ڕەنگە بازاڕیشـی بۆ گەرم کردبێ، چونکە وەک ڕووکار و پەردەپۆشـێک پێویسـتی بە ئەلبەکر بوو.[۲۳۵]

عامر عەبدوڵڵای نوێنەری حیزبی شـیوعی لە حکوومەتەکەی بەعسدا، لەگەڵ تێکچوونی پەیوەندییەکانی هەردوولا، نامەیەکی لە ۱۹۷۸ لە سەرۆک ئەحمەد حەسەن ئەلبەکرەوە دەگاتێ و، بۆ بەرەوڕووبوونەوەی مەترسـیی سـەدام حوسـێن داوای هـاریکـاریی حیزبی شـیوعی دەکـا و، لای خۆیەوە نـامەکە دەگەیەنێتە سـەرکردایەتیی حیزبی شـیوعیی عێراقی، کەچی لە سـەرکردایەتیدا ناڕەزاییەکی زۆری لەسـەر بوو و، لەوانەش زەکی خەیریی ئەندامی مەکتەبی سـیاسـی گوتی، ئەلبەکر "کەسـێکی فێڵباز و بە دەهۆیە"، بەڵام عەزیز محەمەد نەچووە ناو بابەتەکە، چونکە ئاگای لەوەی بوو سەدام حوسێن دەستی

---

[۲۳۵] _ دیدارێک لەگەڵ عەزیز محەمەد ۲۰۱۵/٦/۱.

بەســـەر هەمووشـــتێکدا گرتووە و  هاوکاری کردنیان ١٩٩١،
ئەلبەکر کارتێکی دۆڕاوە.[٢٣٦]

دوا وێســـتگەی داکشـــانی ســـەدام، ئەو دەمی بوو کە لە ١٠ى،
تەمموزی ١٩٧٩ دەستی بەسەر سەرۆکایەتیی کۆماردا گر،
دەکرێ بگوترێ ئەو لە ١٩٧٨ڕا ســـەرۆکی بەڕاســـتی بووە و،
پێموایە ئەلبەکریش باوەڕێکی ڕەگاژۆی بەو بابەتە هەبووە و،
دەکرێ ســەدامیش بۆلادانی ئەو، هەموو کارێک بکا. ئەو کاتەی
ئەلبەکر دەســـت لەکارکێشـــانەوەی خۆی ڕاگەیاند و ســـەدامی
وەک ســـەرۆکی دوای خۆی پێشـکەش کرد[٢٣٧]، دەیزانی سـەدام
دەتوانێ بەڕێگای دیکە پێگەکەی لێ بستێنێ. پێش ئەو ڕێکەوتە
محەمەدی کوڕی ئەحمەد حەســـەن ئەلبەکر  بە ڕووداوی
هاتوچۆ کوژرا و، زۆرجار باســـــی ئەوەی دەکرا ڕووداوەکە
دروســـتکراو و  بەدەســـتی ئەنقەســـت بووە و، پتریش بەلای
ئەوەیدا بووە نامەیەک بووبێ بۆ باوکی. لە دوا قۆناغدا، سەدام
دەســـــتی لە دامەزراندنی پاســـــەوان و کارمەندانی کۆشـــکی
کۆماری وەردا. هەربۆیەش کە گۆڕانکارییەکە کرا، وەک شتێکی
ئاسایی هاتە بەرچاو.[٢٣٨]

خەڵکێک، هەستیان بەوەی کرد ئەگەر ســەدام دەســت بەســەر
هەموو پرۆژەکەدا بگرێ چ مەترســـــییەک دروســـــتدەبێ و،
دەســـــتەیەکیش لەوانە گومـــانیـــان لەوەیـدا نەبوو کە نیمچە

---

[٢٣٦] _ غادة فائق محمد علي، عامر عبدالله ودوره السياسي والفكري في العراق ١٩٢٤
٢٠٠٠، رسالة ماجستير غير منشورة، كلية الاداب ، جامعة بغداد، ٢٠١٤ ، ص ١٢١

[٢٣٧] _ دیدارێک لەگەڵ عەزیزمحەمەد ٢٠١٥/٦/٢٢.

[٢٣٨] _ حازم صاغية، المصدر السابق، ص١٦٤.

ناکۆکییەکیان لەگەڵ سەدامدا هەیە. سێیانیان لە بەڕێوەبەرانی نووسینگەکەی و رازگرەکانی نهێنییەکانی بوون و پەیوەندییەکی تایبەتیان پێیەوە هەبوو، وەک عەدنان حوسێن ئەلحەمەدانی و غانم عەبدولجەلیل و موحێ عەبدولموحسین، ئەوانەش کۆتاییەکی دیاریان هەبوو. وەک پێشدەستییەکی سەرۆکایەتی، سەدام چاودێریی بۆچوونە جیاوازەکانی سەرکردەکانی دەکرد و، هەستی بەوەی کرد بۆڵەبۆڵێک لەناو سەرکردایەتیدا هەیە. دەستی بە دیاریکردنی ئەو حاڵەتە کرد، جا لێرەدا قسەی لەگەڵ تاریق عەزیز و عیزەت ئەلدوری کرد و گوتی: "من هەندێ خاڵی ڕەش لەناو چاوی هەندێ هاوڕێدا دەبینم و خەریکە گەورە دەبن". سەدام ئەوەیشی ئاشکراکرد کە تاریق عەزیزی ڕاسپاردووە تا بچێتە بنج و بناوانی بابەتەکە و، تاریق چووەتەوە لای و پێیگوتووە:"ڕایەکەت دروستە و ئەوان کلکان بادەدەن"[239]

جا لەکاتی رادەستکردنی دەسەڵات و دوای ئەوەی ئەلبەکر ئەو بیرۆکەیەی خستە ڕوو کە سەدام دەسەڵات بەدەستەوە بگرێ، سەدام گوتی گوایە : " هەستی بەوەی کردووە محەمەد عایش و کەسانی دی نامەی دەگۆڕنەوە و یەک لەو نامانەش کەوتووەتە دەست تاریق عەزیز یان عیزەت ئەلدوری و خوێندوویەتییەوە و دیتوویەتی ئاماژەیەکی بۆ دەنگدان تێدایە، ئیدی بە پیلانەکەمان زانی". ئەوانە دەیانویست ئەلبەکر بمێنێتەوە.[240]

---

[239] _ دیدارێک لەگەڵ عەزیز محەمەد ٢٠١٥/٦/٢٢.

[240] _ دیدارێک لەگەڵ عەزیز محەمەد ٢٠١٥/٦/١٢.

ســـــەدام، کۆبوونەوەیەکی لە هۆڵی "خولد" کرد و، بابە[illegible] خستەڕوو. سـەدام سـەرۆکایەتیی کۆبوونەوەکەی کرد و، بەو ئەنجەتەی گوایە هەندێ کەس خیانەتیان لێکردووە و هەســـتی بە جەخارێک کردووە، دەگریا، بەتایبەت موحێ عەبدولموحسن ئەلمەشـــهەدانیی دوا بەڕێوەبەری نووسـینگەکەی و، جا هەرکە نـاوێـک بخوێنـدرابووایەوە خۆی لە کـابرای تووڕەدەکرد و دەیگوت هەسـتەوە و ڕسـتێک جنێوی مزری پێدەدا و فەرمانی پێ دەکرد لە هۆڵەکە بچێتە دەرەوە. جا بە هەمووانی گوت:"ئێوە پێش شۆڕش چ بوون؟ هیچ. هەمووتان ئۆتۆمۆبیل و ئیمتازتان وەرگرت و بوونە بنیادەم". یەک لەوانە کوێرێک بوو و جێگری سـەرنووسـەری ڕۆژنامەی "الثورة" بوو، هەسـتایەوە و گوتی: "گەورەم، هەتا ئەو عەبدولخالق سـامەراییە خائینە زیندووبێ و لە ژیاندابێ، ئیدی هەر پیلان لە سـایەیدا دەگێڕدرێ". ســـەدام گوتی : "ســـــەری وی لەو ســــمێلانەی من وەرگرە" و ئەوجا دەســـتی لەســـەر سـمێلی دانا. ئیدی عەبدولخالق ســـامەڕایی لەسیدارە درا.[241]

لە ســـەیر و ســـەمەرەکانی ئەو کۆبوونەوەیەی ئەوەبوو، ناوی محەمەد دەبدوبی لە ســـەر زاری یەک لە تاوانبارەکان هات و، سەدام پێیگوت هەستە و برۆ دەرەوە. ئەویش چووە دەرەوە و پاســـەوانەکان دایانپەلۆســـی. جا یەک لە تۆمەتبارەکان گوتی ناوی محەمەد دەبدووبیش هات، بەڵام بڕیاردرا پەیوەندیی پێوە نەکرێ چونکە لەگەڵ ســـەدامییە. ئەودەمی محەمەد دەبدوب

[241] _ دیدارێک لەگەڵعەزیز محەمەد ٢٠١٥/٥/٢٢.

هێنرایەوە ناو هۆڵەکە و سەدام، لەجیاتیی ئەوەی داوای لێبووردنی لێ بکا، پێیگوت:"بەهەر حاڵ با ئەوە وانەیەک بێ بۆت، ئاخر هەر ئەوەندەی بنیادەم ناوی هات دەبێ ئاگای لێبێ داخوا بۆ ناوی هاتووە"[242]

ئەو کۆمەڵە کەسە لە حەوشەکەی کۆشکی کۆماری کوژران و، سەدام لەو کردارەدا نوێنەرانی ڕێکخراوەکان و وەزیرەکانی بەشداری پێ کرد. ئەوجا چووە سەر باڵکۆنی کۆشک و پێشوازیی لە پیرۆزباییکەران کرد. بێگومان، ئەوەی لەسێدارە دەدرا کارەسات بەسەر خانەوادەکەیدا دەهێندرا، وەک ماڵڕووخاندن و کوشتن و دەبەدەرکردن. لەگەڵ دەست بەسەر دەسەڵاتدا گرتنی، سەدام ڕۆڵی حیزبی بەتەواوی وەلانا و بڕیاردانی پتر و پتر لە تاقمەکەی تکریتدا بەرتەسک کردەوە کە هەندێ لقی ئەویش لەناوبردران، ئەوجا ئاڵقەکە لە خانەوادەدا جوغزگیر کرا و پاشانیش لە خانەوادەدا تەسکترکرایەوە، واتە سەدام و عودەی و قوسەی.[243]

---

[242] _ دیدارێک لەگەڵ عەزیز محەمەد ٢٠١٥/٦/١٢.

[243] _ حازم صاغیة، المصدر السابق، ص٢٢٨-٢٢٩.

## ڕووخاندنی دیکتاتۆرییەت:

هەندێ هەوڵ هەبوون، تا بەرە دیسـان بهێندرێتەوە بوون. ئەوزاری پەیوەندی ئەوجارەیان موکەڕەم تاڵەبانی بوو.[٢٤٤] جا موکەڕەم چەندین نـامەی بۆ هێنـاین کە تێڕوانینی ئەوانی تێدابوو. ئەودەمی، من بەبۆنەی بەسـتانی کۆنگرەی حیزبی شـیوعیی یۆنانی، لەدەرەوەی عێراق لە یۆنان بووم. ئاماژە و سـووسـەیەکم لە سـەرکردایەتیی حیزبەوە بۆ هـات کە نەگەڕێمەوە عێراق، چونکە ڕێی پەیوەندیی نێوان هەردوو لا گیراوە.[٢٤٥]

هەریەک لە باقر ئیبراهیم و عەبدولڕەزاق ئەلسـافی و جاسـم ئەلحەلوائی و عائیدە یاسـین و موکەڕەم تاڵەبانی، لە بەغدا حیزبیـان بەڕێوەدەبرد. ئـامـانجمـان ئەوەبوو بەرە بمێنێ و، ڕۆژنـامەکەمـان چەنـدی لە توانـادایە دەربکرێ و، ئەوەش بۆ پاراسـتنی گیانی کادیرە حیزبییەکان بوو نەکا دەسـتی ئەو گرتنـانەیـان بگـاتێ کە لە سـایەی ڕێچکەی حیزب و ئەو سـیاسـەتی کشـانەوە ڕێکە دەسـتی پێ کردبوو و، زۆربەی کـادیرەکـانی حیزبیش چوونە دەرەوەی وڵات. هەریەک لە موکەڕەم تـاڵەبـانی و عـامر عەبـدوڵڵاش ، بێ ئەوەی هیچ نیمنیگایەک لە بەعسـەوە بۆ گەڕانەوە بۆ بەرە هەبێ، دەسـت لەکار کێشانەوەی خۆیان پێشکەشی ئەلبەکر کرد.[٢٤٦]

---

٢٤٤ _ دیدارێک لەگەڵ موکەڕەم تاڵەبانی ٢٠١٢/٦/١١. سلێمانی.

٢٤٥ _ دیدارێک لەگەڵ عەزیز محەمەد ٢٠١٥/١٠/٣.

٢٤٦ _ دیدارێک لەگەڵ عەزیز محەمەد ٢٠١٥/٨/١٨.

ڕاستییەکەی، هەندێ مەترسی هەبوون و بەعسییەکانیان وروژاندبوو، ئەویش، ئەو کودەتایەبوو کە پارتی گەلی دیموکراتیی ئەفغانی لە ئەفغانستان کردبووی و، ئەو پشتیوانییەی یەکێتیی سۆڤیەت پێشکەشی ئەو کودەتایەی کردبوو. بەعس ترسی ئەوەی لێ نیشتبوو کارەکە لە عێراقیش دووبارەبێتەوە، سەرباری ئەو شۆڕشە میللییەی لە ساڵی ١٩٧٩ لە ئێران بەرپا ببوو و، کە ئێمە لە لایەنگرانی بووین، ئەوەش وایکرد کۆتایی هاوپەیمانیی نێوان هەردوولا زووتر دابێ.[٢٤٧]

دوای کۆبوونەوەی کادیرانی حیزب لەدەرەوەی وڵات، بۆ شەن و کەو کردنی ڕووداوە نوێیەکانی بارودۆخی عێراق، لە تەمووزی ١٩٧٩ لە شاری پراگ کۆبوونەوەیەک کرا. کۆبوونەوەکەش دەریخست دوای دوا کۆبوونەوەی لیژنەی مەرکەزی لە ١٠ی ئازاری ١٩٧٨، هەڵگەڕانەوەیەکی مەترسیدار لە سیاسەتی دەسەڵاتی عێراقدا هەبووە و، ئەو هەڵگەرانەوەیەش لەکۆمەڵێ ڕێوجێ و هەنگاودا بەرجەستە ببوو کە بۆ تێکدانی بەرەی نیشتمانی و نەتەوەیی پێشکەوتنخواز و پاکتاوی حیزبی شیوعیی عێراقی گیرابوونەبەر. ئیدی، ئەو دروشمەی هەڵبژارد "لەپێناو بەرەیەکی نیشتمانیی دیموکراتی بۆ کۆتاییهێنانی دەسەڵاتی دیکتاتۆری و دامەزراندنی سیستەمێکی دیموکراتی لە عێراق". سەرباری ئەوەش، خاوەن دەسەڵاتانی سەرکردایەتیی بەعس، ئەو ئاڕاستە نەتەوەیی و شۆڤێنییانەیان

---

[٢٤٧] _ دیدارێک لەگەڵ عەزیز محەمەد ٢/١٠/٢٠١٥.

قوولکردەوە کە دژی حیزبی شیوعیی عێراقی و هێزە پێشە[illegible] پەروەرەکانی دیکە بوون و، بگرە دژی هەندێ ئەندامانی [illegible]او بەعسیش و، ئەوەش، بۆنی ئەوەی لێدێ کە بەعس تەنانەت باوەڕی بە بنکە جەماوەرییەکەی خۆیشی نەبوو و، متمانەی بەوەش نەبوو کە بێ تۆقاندن و سێدارە بتوانێ لە دەسەلاتدا بمێنێتەوە.[248]

حیزبی شیوعی، لەبەیاننامەیەک و لەسەر زاری عەزیز محەمەدی سکرتێری حیزب، دەریخست لەبەرچی گرێیەکانی بەرەی هەڵوەشاونەتەوە و دەریشیخست "بابەتی پەیوەندیی نێوان ئەو حیزب و ڕێکخراوانەی ناو بەرە، کە ئەوە بابەتێکی بێ چەندوچوونە، بەردەوامی و ئەو پێگەیەی بەرەی یەکگرتوو لە ڕیزەکانی گەلدا هەیەتی و، توانای کاری سیاسیی کاریگەریشی، پشت بە ئاستی یەکسانیی نێوان حیزب و ڕێکخراوەکان و ئاستی دیموکراتیی پەیوەندیی نێوانیان دەبەستێ. حیزبی شیوعی، هەر لە سەرەتای دامەزراندنییەوە لە سییەکانی سەدەی بیست، بە دامەزراوییەوە کاری لە پێناو یەکێتیی کاری هێزە نیشتمانییە پێشکەوتنخوازەکان کردووە. شیوعییە عێراقییەکان، هەمیشە دووپاتیان دەکردەوە پێویستە ڕێز لە سەربەخۆیی سیاسی و ڕێکخراوەیی و ئایدیۆلۆژیی هەموو لایەنەکانی بەرەیی بگیرێ و، ئازادیی ڕەخنەی هاوڕێیانەی بنیاتنەر لەناو بەرە دەستەبەر بکرێ و، لایەنە

---

[248] _ "طريق الشعب" السرية، العدد ١ تموز ١٩٧٩.

بەشـــــدارەکـان ئـازادیی ئەوەیشـــیـان هەبێ بیروبـاوەڕ و ئـامـانجەکـانیـان بڵاوبکەنەوە بەو مەرجەی پێچەوانەی پەیوەسـتییەکانی بەرانبەر یەکدی نەبن " پاسـاوی شـکسـتی بەرەیشـــی بردەوە ســـەر بەعســـییەکـان، چونکە وەک لە بەیاننامەکەی شـــیوعیدا هاتبوو، دەگەڕایەوە بۆ "چالاکییەکانی حیزبی بەعسی لەگەڵ هەموواندا دژبەر بوو"[249]

حیزب، لە ناوچە کوردییەکاندا، دەستی بەوەی کرد کادیرەکانی وەک جەنگـاوەر ڕێکبخـا و، ئەوەش، لە کۆبوونەوەی لیژنەی مەرکەزیی حیزبی شیوعیی عێراقیی لە کۆتاییەکانی حوزەیرانی ١٩٨٠ کـرا، خـرایە بەر گفتوگۆ و لەوێ عەزیـز مـحەمەدی سـکرتێری حیزبی شـــیوعیی عیراقی داوای لە جەنگـاوەرە شیوعییەکان کرد "سەر بە هەر نەتەوە و حیزب و ئاڕاستەیەکی سیاسین، جەماوەری گەلەکەمان چاوی لە ئێوەیە و هیوایەکی گەورەی لەسەر خەباتی ئێوە هەڵچنیوە و، پێیوایە ئێوە هێزێکی کاریگەری خەباتی ڕێگای ڕووخاندنی دەســـەڵاتی دیکتاتۆریی خوێنڕێژن. خەبـاتی ئێوە چۆمێکی بنچینەیی نـاو چۆمەکـانی خەباتی میللییە لەپێناوی بنیاتنانی عێراقێکی نوێی ســەربەخۆی دیموکراتیی گەشـــاوە...... هەر فیشـــەکێکی دەیگرنە ســـنگی نەیارەکەتان دەبێتە خشتێکی نوێی بنیاتی کۆشکێکی نوێ"[250]

---

[249] _ "مجلة الثقافة الجديدة"السنة ٢٧، تشرين الاول ١٩٨٠، العدد ١٠، ص٦٨.

[250] _ من وثائق الاجتماع الاعتيادي الكامل للجنة المركزية للحزب الشيوعي العراقي اواخر حزيران ١٩٨٠.

سەرکردەیەکی حیزبی شیوعیی عێراقی و هێزەکانی پشتیوانی
ناوچەی کوردستان، باسی ئەوەی دەکا عەزیز محەمەد،
سکرتێری حیزبی شیوعی خەریکبوو ئێزگەیەکی بۆ هێزە
کوردییەکان دابین دەکرد و، عەزیز محەمەد لە ١٩٨٠/١٢/٢٢
گەیشتە ناوچەی ناوزەنگی کوردستانی بارەگای سەرکردایەتیی
هێزەکانی پشتیوانی لەوێبوو، تا لەنزیکەوە بارودۆخی
هێزەکانی پشتیوانی بزانێ و ئاگاداری هەموولایەنێکی ژیانمان
بێ و بزانێ داخوا پێداویستییەکانمان چین، یانیش سیاسەتی
پێشتری و ئێستای حیزبمان بۆ بەراورد بکا و، ئیدی دڵشاد و
خۆشحاڵ بووین و متمانەیەکی پترمان بە سەرکردایەتیی
حیزب پەیداکرد و، زانیمان چەندە شێلگیرانە و بە ڕشتی
گرنگی بە بزووتنەوەی هێزی پشتیوانی و ڕێکخراوەکانی شارە
کوردییەکان دەدەن.[٢٥١]

[٢٥١] ـ احمد باني خيلاني، المصدر السابق، ص٣١٠.

# شەڕی عێراق و ئێران:

لە پای هەڵگیرسانی شەڕی عێراق و ئێران لە ٢٢ی ئەیلولی ١٩٨٠، کە هەشت ساڵ بەردەوام بوو ، حیزبی شیوعی بەیاننامەیەکی لەژێر ناوی "با ئەو شەڕە وێرانکەرەی نێوان عێراق و ئێران بوەستێ" دەرکرد و، تێیدا هاتبوو "کاتێ ئەو تاقمە ستەمکارەی بەزۆر دەستیان بەسەر دەسەڵاتی عێراقی خۆشەویستماندا گرتووە، بەهێزی ئاگر و ئاسن دژی ئێرانی دراوسێ دەست بە شەڕێکی گشتگیر دەکەن و، جەنگێکی بەرفراوان هەڵدەگیرسێنن و، هێزە چەکدارەکانی هەردوو وڵاتی دراوسێ لە شەڕێکدا بەرانگژی یەکدی دەبن کە هەموو جۆرە چەکێکی تێدا بەکاردێ و، دامەزراوە ئابووری و سەربازی شوێنە نیشتەجێیەکانی تێدا وێران دەبێ و سامانێکی گەورە و بێ وێنەی، کە لە ژیانی هەردوو گەلدا پێشتری وێنەی نەبووە، تێیدا بە فیڕۆ دەدرێ، هەموو ئەوانە درێژکراوەیەکی سروشتیی ئەو هاوپەیمانییەیە کە لەگەڵ ڕژێمی شادا کرابوو و، ئەو کرداری ورووژاندن و دوژمنکارییەی ئەو تاقمە ستەمکارە خوێنڕێژە لەمێژە دژی شۆڕشی گەلی ئێران دەیکا ....، ئەوا حیزبی شیوعیی عێراقیمان ئەو شەڕە وێرانکەرە مەحکووم دەکا و دووبارە دووپاتی دەکاتەوە کە هیچ بابەتێکی ئەوتۆ نییە لەسەری ناکۆکبن و بەڕێگای ئاشتییانە و لە بەرژەوەندیی هەردوو گەلی دراوسێ و دۆستی عێراق و ئێران چارەسەر نەکرێ. حیزبمان چاوی لەوەیە و داوادەکا ڕۆلەکانی گەل و هێزە نیشتمان پەروەرەکان و هەموو دڵسۆزان و ئەوانەی

نیشـــتمانیان خۆشـــدەوێ و، ڕۆڵەکانی ســـوپا جەربەزەکەمان دەســـتی ئەو تاقمە ســـتەمکارە دیکتاتۆرە دەســـتەپاچە بکەن و، لێ نەگەڕێن بەو تاوانە قێزەونەدا شۆڕببنەوە".[252]

ئێمە، لە هەڵوێستی بەرانبەر شـەڕی عێراق و ئێراندا، هیچ هەڵە و گوناهێکمان نەبووە. هەندێ خەڵک و لایەن ، کە پێویست ناکا ناویان بهێنم، هەوڵیان داوە ڕاسـتیی هەڵوێسـتی ئێمە بشـێوێنن و بە پێچەوانەی ڕاســتییەکەی نیشــانی بدەن. ئێمە، هێ لەوەی داخوا کێ دەسەڵاتداری وڵاتە، ڕازی نابین دەستدرێژی بکرێتە ســەر وڵاتەکەمان. هاوڕێیانی ئێمە دروشـمی "کۆتاییهاتنی شـەڕ بە ڕووخـــانـــی ڕژێـــمەوە"یـــان بەرز کـــردبـــووەوە. لە کۆبوونەوەکانمان دژی شەڕ وەستاین و گوتیشمان ئێمە پێشی شــەڕ دژی ڕژێمین و لە کاتی شــەڕیش دژی دەبین و لە پاش شەڕیش هەر دژی دەبین و، ڕێوشوێن بۆ جەنگاوەرەکانیشمان دەرکرابوو بەهیچ شـــێوەیەک مـــامەڵە و هـــاوکـــاری لەگەڵ هێزەکانی ئێران نەکەن. لە سەردەمی شەڕدا بۆ چوونە سوریا بە تـاراندا تێپەڕیم. دەســـــەڵاتـدارانی ئێران زانییـان لەوێمە و هەوڵێکی یەکجار زۆریان دا تا لەگەڵ ســـــەرکردایەتیی ئێران کۆببمەوە. پێیان گوتم ئەگەر ئەو دیدارە نەکەم ناتوانم ســـەفەر بـکەم. بەڵام بـنەبـڕ ڕەتـمـکـردەوە. ئـێـمە لەولایەنەوە زۆر هەســـــتەوەر بووین. هەمیشـــــە ڕەتمـان دەکردەوە خـاکمـان ببەزێندرێ یان بستێکی داگیر بکرێ.[253]

---

[252] _ الحزب الشـيوعي العراقي ، فلتتوقف الحرب المدمرة بين العراق وايران، ٢٤ ايلول ١٩٨٠، نقلاً:"مجلة الثقافة الجديدة"السنة ٢٧، ايلول ١٩٨٠، العدد ٩، ص٣-٥.

[253] _ دیدارێک لەگەڵ عەزیز محەمەد ٢٠١٥/١٠/٢.

ئێمە گرەوی ئاواتەخوازیی لاوازبوونی ڕژێممان، لەسەر بەردەوامبوونی شەڕ و خوێن لەبەر ڕۆیشتنی بەردەوامی گەلی عێراق، نەکردبوو. ئێمە نەماندەویست قەیرانی کۆمەڵگە قووڵتر ببێ و ژمارەی ئەو خێزانانە پتربن کە یەک یان دوو و بگرە چوار ئازیزیشیان لە ئەنجامی شەڕ لەدەستدابوو. ئێمە بە باوەڕەوە دژی ئەو شەڕە بووین و ئەوەشمان لە کۆنگرەی چواری حیزبدا لە ١٩٨٤دووپاتکردەوە.[٢٥٤]

هاوڕێیەک گوتی، لینین ئاماژە بەوەی دەکا کە ئاشتیی ڕاستەقینە واتە گۆڕینی سیستەمی دەسەڵات. گوتم من لەگەڵ ئەو ڕایەدا نیم. ڕۆژێکیان ئەو هاوڕێیە گوتی هەتا ئەو ڕژێمە مابێ ئێمە نیشتمانمان نییە. گوتم ئێمە بەرقافڵەی سوپای ئێرانی نەبووین و، نەبووینە چاوساغیان و ناشبینە چاوساغیان.[٢٥٥]

کە هێزەکانی پشتیوانیمان لە "نۆکان" کۆببوونەوە، هێزەکانی ئێران لە ڕەبایەکانمان نزیکبوونەوە، ئەوەش ناچاری کردین جێیەکانمان بەجێبێڵین و بچینە پشتئاشان. بەڵام، لەبیرمە ئەگەر ڕژێم هێرشی بکردایەتە سەر هێزەکانمان ئەوا لەگەڵ ڕژێم

---

[٢٥٤] _ کۆنگرەی چواری حیزبی شیوعیی عێراقی لەژێر دروشمی "لەپێناو بەرپاکردنی شۆڕشی نیشتمانیی دیموکراتی و بەرەو سۆشیالیزم چوون" بەسترا و، حیزب هەڵویستی خۆی بەرانبەر بەو شەڕە دەرخست کە "حیزبمان بۆ کۆتاییهاتنی یەکڕاستی شەڕ تێکۆشاوە و تێشدەکۆشێ و، لە حاڵەتی بەردەوامبوونی شەڕیش تا دوای ڕووخانی ڕژێمی دیکتاتۆریی ئێستاش، ئەوا ئەرکی کۆتاییهێنانی شەڕ بە ئاشتەوایییەکی دیموکراتیی دادپەروەرانە دەبێتە ئەرکی هەرە لەپێشی حکوومەتێکی ئیئتیلافیی نیشتمانی. بۆ زیاتر: وثائق المؤتمر الرابع للحزب الشيوعي العراقي ١٠-١٥ تشرين الثاني ١٩٨٥، ص٣٢.

[٢٥٥] _ دیدارێک لەگەڵ عەزیزمحەمەد ٢٠١٥/١٠/٢ .

دەجەنگاین، جا ئەگەر بە چەکیش نەبووایە ئەوا بە قسە لەگەڵ، دەجەنگاین. بەڵام هەڵویسـتمان بەرانبەر بە داگیرکردنی هەر پارچەیەکی عێراق ڕوون بوو، لەبیرمە کە هاوڕێ زەکی خەیری گوتی دەبێ دژی ئێران لەگەڵ سـوپای عێراقدا بین.گوتم ئەوە چۆن دەبێ و، گلەییم لەو هەڵوێستەی کرد. ئەویش گوتی دەبێ ئاوهابین. پێمگوت ئێمە لە سـەردەمی شـۆڕشـی ئۆکتۆبەر نیین تا بتوانین دەنگمان بگەیەنینە ئەو سـەربازەی دژمانە یان ئەو لایەنەی دژمانە، ئێسـتا تۆپ و فڕۆکە قسـەدەکەن. ئیدی چۆن زمانێکی هاوبەشمان لەگەڵ سوپای عێراقدا دەبێ؟.[٢٥٦]

---

٢٥٦ _ دیدارێک لەگەڵ عەزیز محەمەد ٢٠١٥/١٠/٣.

## چالاکییەکانی حیزب دژی ڕژێم لەکاتی جەنگدا:

حیزبی شـــیوعی، دوای ئەوەی ژمارەیەکی زۆری کادیرەکانی چوونە دەرەوە و ، کاری بۆ ئەوەی دەکرد تا جارێکی دی کارتی بەرە لەگەڵ هێزە نەیارەکانی بەعس بەکاربێنێتەوە، لەوانەش کوردەکان و هەندێ کوتلەی قەومی، ئیدی حیزبی شـیوعی کاری بۆ ئەوەی کرد تا لە تشـرینی دووەمی ١٩٨٠ بەرەی نەتەوەیی نیشـتمانی دیموکراتی "جوقد –الجبهة الوطنية القومية الديمقراطية" ببەسترێ کە هەریەک لەیەکێتیی نیشتمانی و حیزبی سـۆشـیالیسـتی کوردسـتانی و ، بزووتنەوەی سۆشتالیستیی عەرەبی و حیزبی سۆشیالیست و بەعسییە چەپڕەوەکان و ڕێکخراوی سـوپای ڕزگاریی میللییی عێراقیی تێدابوو.[257]

لەبەر نـاکۆکیی هەردوو جەمسـەری بزووتنەوەی کوردی، "پارتی دیموکراتیی کوردسـتـان و یەکێتیی نیشـتمـانیی کوردسـتان"، حیزبی شـیوعیی عێراقی ڕێککەوتنێکی لەگەڵ پارتی دیموکراتی کوردستان کرد، ڕێککەوتنێکی سێ لایەنییش لەنێوان حیزبی شیوعیی عێراقی و پارتی دیموکراتی کوردستان و حیزبی سـۆشـیالیسـتی کوردسـتانی یەکگرتوو لە گوندێکی

---

٢٥٧ _ جليلي جليل واخرون، الحركة الكردية في العصـــر الحديث، ئاراس، اربيل ، ٢٠١٣ ، ص٤٨٢.

ســەرســنووری ئێراندا ، واتە گوندی "کەوبەر"لە ١٩٨٠/١١/٢٧، واژووکرا و، دواتر بە بەرەی "جود ناسرا.[٢٥٨]
حیزب، دەستی بە پێکهێنانی دەستەی پشتیوانی کرد و ، داوای لە شــیوعییەکانی دەرەوە کرد بگەڕێنەوە گۆڕەپانی شــەڕ. سەرکردایەتیی حیزب لە کۆبوونەوەی تشرینی دووەمی ١٩٨١ گفتوگۆی لەو بابەتە کرد و ، عەزیز محەمەد ســەردانی چەند دەوڵەتێکی خاوەن بیروباوەڕی ســۆشــیالیســتیی کرد کە شــیوعییە عێراقییەکانیان لە هامێز گرتبوو و داوای لێ کردن خۆیان بگەیەننەوە هێزەکانی پشتیوانیی باکووری عێراق.[٢٥٩]
سەرباری ئەوەش، حیزب لە ڕێی ڕۆشنبیرکردنەوە دەستی بە کاری پشتیوانی کرد و، ئەو شیوعییانەی لەدەرەوەڕا گەڕانەوە، بە ســەرپەرشــتیی ڕێکخراوە فەلەســتینییەکان، خولی ڕاهێنانیان دیتبوو، بەتایبەت بەرەی دیموکراتیی ڕزگاریخوازی فەلەســتین و بەرەی میللی و بزووتنەوەی فەتح و، خولی ڕاهێنانیان لە یەمەنی دیموکراتییش دیتبوو و، کــارەکەش هەر بە ڕاهێنــان نەوەستابوو، بگرە گەیشتە ئەو هاریکارییە چەک بەخشینانەی ئەو ڕێکخراوانە لە ڕێی ســوریا لە قامیشــلوو ڕا بەناوچە کوردییەکاندا پێشکەشیان کرد.[٢٦٠]

---

٢٥٨ _ احمد باني خيلاني، المصدر السابق، ص٣٠٩.

٢٥٩ _ عدنان عباس، المصدر السابق، ص٢١٨-٢١٩.

٢٦٠ _ فيصل الفؤادي، المصدر السابق، ص١٣٠-١٣١.

لە١٩٨٢ و لە ناوچەی پشتئاشان، کۆنفرانسێکی سەربازی کرا و عەزیز محەمەدی سکرتێری حیزب و ئەندامانی مەکتەبی سیاسی و لیژنەی مەرکەزی ئامادەی بوون و، بڕیاری پێکهێنانی ئەو ناوچانە درا:

١ــ ناوچەی بادینان: بە سەرکردایەتیی تۆما تۆماس.
٢ ــ ناوچەی هەولێر: بە سەرکردایەتیی سابت حەبیب ئەلعانی.
٣ ــ ناوچەی سلێمانی: بە سەرکردایەتیی بەهادین نوری.[٢٦١]

هەندێ لایەنی لەناو بەرەی نیشتمانی و نەتەوەیی پێشکەوتنخوازدابوون، داوایان دەکرد لە ڕێی ڕووخاندنی ڕژێمەوە کۆتایی بە شەڕ بهێندرێ.

گوتمان، ئێمە باوەڕمان بەوەی نییە بۆ بەدەستهێنانی ئەو ئارەزووە شەڕ درێژ بکرێتەوە. سەرباری ئەوەش ئێمە لەکاتی شەڕدا چالاکییەکانی دژە ڕژێمی خۆمان سڕ نەکرد. پێیشموانەبوو ئەو هەڵوێستە لە خشتەی لێکۆڵینەوەدا بخرێتە ڕوو. ئاخر ئەوە حکوومەت بوو کە هێرشی دەکردە سەرمان. چونکە سەرباری ئەوەی جێیەکانمان لە جێی هێزە حکوومییەکان و بەرەکانی شەڕیش دووربوو تا لەکاتی هێرشکردنە سەرمان خۆمان لە بەرەوڕووبوونەوەیان بپارێزین، کەچی هێزەکانی حکوومەت هێرشیان دەکردە سەر پێگەکانی ئێمە.

لە بیرمە، کە هەڵوێستەکە هاوشێوەی هەڵوێستی بارزانیی کاتی شەڕی عەرەبی ئیسرائیلی بوو. من خۆم گوێم لە بارزانی بوو

٢٦١ _ یوسف حنا یوسف (ابو حکمت)، مذکرات، مطبعة الثقافة، اربیل، ٢٠١١، ص ١٠٢-١٠٣.

گوایە داوای لێکرابوو گورز لە سـوپای عێراق بوەشـێنێ، تا کۆسپ بخاتە بەردەمی چوونە بەرەکانی جەنگی دژی ئیسرائیل. بەڵام هەڵویسـتی بارزانی رەتکردنەوەی ئەو جۆرە داوایە بوو. ئێمەش هەڵویستمان هەر رەتکردنەوە بوو.[٢٦٢]

ئەوەی دەبێ باسیشی بکەین ئەوەیە، کە ئەو هێزانەی ئێمەی بە ناوچەکانی کوردستاندا بڵاوببوونەوە، هێزێکی ئەوەندە کاریگەر نەبوون تا بتوانێ لە شـەڕی نێوان دوو هێزی عێراق و ئێران بەشدار بێ.

---

[٢٦٢] _ دکتۆر مەحمودی سـەرکردە لەپارتی دیموکراتی کوردسـتان دووپاتی دەکاتەوە کوردەکـان لە نـاو ئـاڵقەیەکی پەیوەنـدیـدا بوون کە بریتیبوون لەهەریەک لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ئیسـرائیل و ئێران و خاڵی پەیوەندییش شـای ئێران بوو کە داوای کرد چالاکیی سـەربازیمان لە دژی هێزەکانی عێراق هەبێ، کە ئەوەشـمان ڕەتکردەوە. دیدارێک لەگەڵ مەحمود عوسمان، ٢٠١٢/٣/٢٩.

# دانوستان لەگەڵ حکوومەتی بەعس:

دوای کۆتاییهاتنی بەرەی نیشـــتمانی و هەڵگرتنی دروشـــمی "ڕووخاندنی دیکتاتۆری" و شەڕی عێراق و ئێران و، بارودۆخی لێکنزیکبوونەوەی میسر و ئیسرائیلی ســەرەتای هەشـتایەکان، ڕژێمی بەعس لە بەرەی ناوخۆ لاواز ببوو و ترسی لە بەرەی شـــەڕی باکوور هەبوو، نەوەکا بارودۆخەکە بقۆزرێتەوە و هێرش بکرێتە ســــەر هێزەکانی عێراق. ئیدی ڕژێم هەوڵی دا لاپەڕەیەکی نوێی پەیوەندی و گفتوگۆ لەگەڵ هێزە سیاسییەکان بکـاتەوە و، لەوانەش حیزبی شـــیوعیی عێراقی و حیزبە کوردییەکـان، پێنـاوی ئەوجـارەیـان دکتۆر عەبـدولڕەحمـان قاسـملووی ئەمینداری گشتیی حیزبی دیموکراتی کوردسـتانی ئێران بوو و، لە شـوباتی ١٩٨٢ نامەیەکی لە ڕژێمی بەعســەوە هێنابوو و، نامەکەی دایە عەزیز محەمەد لە بارەگای خۆی لە نۆکـان و بە ئـامـادەبوونی جەلال تـاڵەبـانی و ئەنـدامـانی حیزبەکەی کۆبوونەیەک لە تووژەڵەی بارەگای حیزبی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانی سەر سنووری عێراقی و تورکی کرا و، ناوەرۆکی نامەکەی قاسملوو هێنابووی ئەوەبوو کە حکوومەتی عێراقی ئـامـادەیە دانوســــتـانتـان لەگەڵدا بکـا و بزانێ داخوا داواکاریتان چییە تا چارەســەری ســیاســی بدۆزرێتەوە. وەک جەلال تــاڵەبــانی دوای کۆبوونەوەکە گوتی، عەزیز محەمەد لایەنگری دانوســتان بوو، لەکاتێکدا دوای ئەوەی لەگەڵ لیژنەی مەرکەزیی حیزبی شیوعی کۆبووەوە، دانوستانیان ڕەتکردەوە، چونکە ڕێی هیچ دانوســـتـانێـک لەگەڵ بەعس نییە، ئـاخر

هەڵگەڕانەوەی بەعس لە هاوپەیمانی و لەسێدارەدان و ئەو شەپۆلی ناڕەزاییەی لەبەر شکستی بەرە لەگەڵ بەعسدا لەناو ڕیزەکانی حیزبی شیوعی تەشەنەی کردبوو و، ئەو نوشوستییەی لە ڕیزەکانی حیزبی شیوعیدا دروستی کردبوو، بواری بۆ دانوستان نەهێشتبۆوە. عەزیز محەمەد ئاشکرایشی کرد کە پەیوەندی پێکردنەکان هەر حیزبی شیوعی و حیزبی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانی نەگرتەوە، بەڵکو پەیوەندیکردنێک بە حیزبی پارتیشەوە هەبوو و ، دوای ئەوەی حیزبی شیوعی هەر جۆرە گفتوگۆیەکیان ڕەتکردەوە، بە جەلال تاڵەبانیم گوت ڕیزەکانتان یەکخەن تا دانوستانەکان هاوبەش بێ و، ڕژێم نەتوانێ دانوستانە تەنێ تەنێیەکان بقۆزێتەوە و، بۆ دەستەبەرکردنی ئامانجی ڕێککەوتنی هاوبەشیش چەندجارم پەیوەندی بە مەسعود بارزانییەوە کرد و، هەر لەبەر ئەو سەنگەی لای حکوومەتی عێراقییان هەیە، پەیوەندی بە سۆڤیەتییەکانیشەوە کرا تا بەشداری لە دانوستانەکان بکەن و وەڵامێکی ئەرێنییشمان وەرگرتەوە.[٢٦٣]

جەلال تاڵەبانییش، هەر ئەوەی لە یادەوەرییەکانی دووپاتکردووەتەوە و دەڵێ، هەموو شتێکی دانوستانەکانی لەگەڵ بەعس بە حیزبی شیوعی ڕادەگەیاندووە و، کە وردەکاریی دیداری قسەکانی ئەو شاندەم پێگوت کە لە کوردستان لەگەڵیان دانیشتبووین، گوتی "ئەوە کارێکی زۆر باشە" منیش گوتم چیم بە شاندەکە گوتووە و هەڵویستم چ

---

[٢٦٣] _ دیدارێک لەگەڵ عەزیز محەمەد ٢/١٠/٢٠١٥.

بووه. جەلال تاڵەبانی دەریشــی دەخا لە دیداری بەغدای لەگەڵ سـەدام حوسـێن لە سـەرەتای ١٩٨٣ لەکاتی دانوسـتانەکان، داوای کردووە شــیوعییەکانیش بەشــدارییان پێ بکرێ و ســەرۆک ســەدام حوســێنیش نـاڕازی نەبـووە و گوتوویەتی:"حیزبی شــیوعی دەتوانێ بگەڕێتەوە جێیەکەی پێشــتریی ناو بەرەی نیشــتمانیی و، تا ئێســتاش جێیەکەی پارێزراوە و، سـەدامیش کە ناوی عەزیز محەمەدی بهێنابووایە بە هاوڕێ ناوی دەهێنا و سەناخوانیی دەکرد و ڕێزی لێ دەنا. بەڵام ئەو دانوسـتانانە، دوای باشـتربوونی پەیوەندییان لەگەڵ تورکیـا و گۆڕانی هەڵوێســتەکـانی نـاو حکوومەتی بەعس، شـکسـتیان هێنا و نەیتوانی ئامانجەکانی بەدەسـتبێنێ، چونکە تورکیـا هەڵوێســتێکی تونـدی بەرانبەر بزووتنەوەی کورد هەبوو.[٢٦٤]

٢٦٤ _ بۆ زیاتر: مذكرات جلال الطالباني، ص401-404.

# ڕووداوەکانی پشت ئاسانی ١٩٨٣:

گوندی پشتئاسان، دەکەوێتە سەر سنووری عێراق و ئێران و ، حیزبی شیوعیی عێراقییش، کە لەساڵی ١٩٨٢ سێ کەسی لە هاوڕێ تایبەتمەندەکانی بواری سەربازی لە نۆکانڕا ڕەوانەی پشتئاشان کردبوو تا لە پێگە سەربازییەکەی بکۆڵنەوە، بیری لەوەی کردبووەوە بیکاتە بنکەیەک بۆ چالاکییەکانی خۆی. سەرباری جیاوازیی بیروڕای ئەوەی داخوا بەکەڵکی ئەوەی دێ یان نا تا حیزب بیکاتە بارەگای هێزەکانی خۆی، کرایە بارەگای هێزەکان . ئەگەرچی لە نیسانی ١٩٨٣ لە پشتئاشان کشابوونەوە، کەچی دواتر هێزەکانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان هێرشیان کردە سەر ناوچەکە و، ژمارەی ئەو کەسانەی لەدەستچوون "٧٢" شیوعی بوون.[٢٦٥]

من، پێموایە پشتئاشان قەدەرێک نەبوو گەڕانەوەی نەبێ تا ئەو ژمارە زۆرەی هاوڕێیانی تێدا شەهید ببێ. ئەوەی روویدا کارێکی بە ئانقەست بوو. زۆر بەداخەوە من ئەودەمی لە کوردستان نەبووم، ئەودەمی لە شام بووم، جا کەسێک گوتی ئەگەر لەوێ بوای ئەو ڕووداوە دڵتەزینە ڕووی نەدەدا. بەڵام نامەوێ خۆم بەو ڕایەوە هەڵواسم و، دەشکرێ ئەو ڕایە ڕاستیش بێ.[٢٦٦]

من، پێموایە دەکرا ڕووداوەکانی پشتئاشان روونەدەن. بەڵام دەبێ ئەوەش بڵێین گوناهە مەزنەکە لە ئەستۆی یەکێتیی

---

[٢٦٥] _ قادر رشيد، بشتاشان بين الالام والصمت، ط2 ، 2008، ص26-36.

[٢٦٦] _ دیدارێک لەگەڵ عەزیز محەمەد ٢٠١٥/١٠/٢.

نیشــتمانیی کوردســـتاندایه. ئاخر، دوای ئەوەی هاوڕێیەکانمان ناوچەکەیشــیان بەجێهێشـــت، کەچی ئەوان لە کەشــوهەوایەکی زۆر ســـــەخت و کەڵەکەبوونی بەفر و ســـــەختیی ڕێگاکانیش دوایان کەوتن. ئەو کۆمەڵە پێشــمەرگەیەمان لەژێر فەرماندەیی کەریم ئەحمەد ئەلداود و عومەر عەلی ئەلشێخ دا بوون. دەبوایە بە هەر ڕێگــایەک بێ خۆلەڕووبەڕووبوونەوە ببوێرین. بەڵام من دووپاتی دەکەمەوە، گوناهە گەورەکە لە ئەســتۆی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستاندایە.[٢٦٧]

هۆی ڕاســـتەوخۆی ڕووداوەکانی پشـــتئاشـــان ئەوەبوو کە یەکێتیی نیشـــتمانیی کوردســـتان، هاوپەیمانیی ئێمە و پارتی دیموکراتیی کوردســتانی ڕەتدەکردەوە و، ســەرباری ئەوەی کە پارتی شــەڕی لەگەڵ یەکێتیی نیشــتمانیی کوردســـتان نەبوو، کەچی ئەوان، چوونە نــاو ئەو هــاوپەیمــانییەی ئێمەیــان قبووڵ نەبوو کە بە بەرەی "جود" ناســرابوو. یەکێتیی نیشــتمانی، لای خۆیەوە بــابەتەکەی وا لێکدابووەوە کە ئێمە لایەنگیری پــارتین و، ئەوانیش بە دوژمنی خۆیان دادەنان.

---

[٢٦٧] _ عەزیز محەمەد لە نووســینێکی لە ١٩٨٣ بەناونیشــانی "عێراق بەرەو کوێ هەنگاو دەنێ" کەلە"الثقافة الجدیدة" بڵاوکراوەتەوە، باســـی ئەوەی دەکا داخوا ئەو هێرشـــەی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان چیی لە پشت بووە، دەڵێ "سەرکردایەتیی ئەو حیزبە لە یەکەمین ڕۆژی ئایاری ١٩٨٣ و بە دەســت تێکەڵی لەگەڵ دەســەڵاتی فاشیستی، هات و ئەو تاوانە خوێناوییە گەورەیەی دژی شــیوعییەکان بەرپا کرد و هێرشــێکی چەکداریی کردە ســـــەریان و پیاوە پڕچەکەکانیان چەکی مرۆکوژی ئەوتۆیان پێبوو پێشـــتری نەیــانبووە ....ئــامــانجی ســـــەرەکیی ئەو هێرشـــــەش لەنــاوبردنی زۆرترین ژمــارەی ســـــەرکردەکانی حیزب وکــادیرەکانی بوو و ئەنجامی ئەو تــاوانە قێزەونەش لە ١٢٠ تێکۆشـــــەر تێپەڕی کرد. بۆ زیــاتر : مکرم طــالبــاني، مراحـل تطور الحركـة القومیـة، ص٤٣٤- ٤٣٥.

یەکێتیی نیشتمانی، ڕازی نەبوو پارتی بێتە ناو "جوقد". ئەوەمان
ناچاری کردین هاوپەیمانییەکی دوو لایەنە دروستکەین "جود"،
ئەو هاوپەیمانییەی لە بەرنامەدا هەر لەناوەرۆکی بەرنامەی
"جوقد" دەچوو. پەیوەندیی باشـــی ئێمە لەگەڵ هەموو لایەنە
سیاسییەکان بارتەقای ئەو هێزە مرۆیی و سەربازییەی نەبوو
کە ئێمە هەمانبوو. هێزی ئێمە لە بۆچوونە سیاسی و هەڵوێست
و ئەو پەیوەندییە هاوســـەنگەدا بوو کە لەگەڵ هەموو لایەنە
سیاسییەکانی دیکەدا هەمانبوو.
بەڵام ئێمە، لەگەڵ هەڵویستەکانی یەکێتیی بەرانبەر پارتی هاوڕا
نەبووین. کە "جوقد"مان لە شام پێکهێنا، خۆزگەمان دەخواست
پارتییش لەناو ئەو بەرەیەدا بێ. کەچی یەکێتیی نیشـــتمانیی
کوردســـتان ڕازی نەبوو پارتیی تێدابێ. بەڵام ئێمە هەڵوێســـتی
خۆمان تۆمار کرد.
ئێمە بۆ بەکەمزانینی ئەوانیدی نەبوو ڕوومـان لە "جود" کرد،
بەڵکو لە بـاوەڕی پێویســـتیی کۆکردنەوەی ڕیزەکـانی
ئۆپۆزسـیۆن بوو لەدژی دیکتاتۆرییەت. ئێمە، هێشـتا پارتیمان
بە هێزێکی نیشـــتمانی دادەنا و، ســـەنگێکی لە بزووتنەوەی
نیشـتمانیی دژی ڕژێمی سـتەمکاری بەغدا هەبوو. باشـە بە
بڕیارێکی یەکلایەنە چۆن ئەو هێزە وەلانێین و بیســـڕینەوە؟!
ئەودەمەی واژوومـان لەســـەر بەرەی "جـود" کـرد مـن لە
کوردسـتان نەبووم. بەڵام، پشـتگیریی بەسـتانی بەرەی "جود"م
کرد، چونکە ئێمە بە پەیوەنـدیمـان لەگەڵ پـارتی هیچ
دژبەرییەکمـان لەگەڵ ئـامـانجەکانی "جوقد" نەبوو. نـاکۆکیمـان
لەگەڵ یەکێتی بەهۆی هاوپەیمانیی پارتییەوە بوو، ئەو بابەتەی

یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان ڕەتی دەکردەوە و پێی رازی نەبوو. ئەوان، کە هێرشیان کردە سەرمان، ئاگایان لە بەرنامەی "جود" هەبوو. ئەگەر لەگەڵ بەندەکانی هاوپەیمانیی "جوقد"ڕێک نەهاتبایەوە دەکرا لۆمەمان بکەن.

لەبیرمە، کە لە نۆکان بووین، بەیاننامەیەکمان لەگەڵ پارتی دەرکرد و لەوێ گوتبوومان هەر هێندەی پارتی بێتە ناو "جوقد"[٢٦٨] ئیدی پێویست ناکا "جود" هەبێ. ئەوەش بەڵگەی پێکچوونی بەندەکانی هەردوو بەرەیە. بەڵام ناکۆکییان لەگەڵ پارتی ڕەنگدانەوەیەکی خراپی لەسەر پەیوەندیی ئێمە و یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان هەبوو.

سەرباری ئەوەی ئەو ڕووداوانە، برینێکی قووڵ و هەوتبوونێکی گەورەیان بۆئێمە هەبوو، لەسوریا، دوای ڕووداوەکانی پشتئاشان، چاوم بە مام جەلال تاڵەبانی کەوت. مام جەلال ئەو هاوپەیمانییەی پێ ناخۆش بوو کە لەگەڵ پارتی کرابوو.

---

[٢٦٨] _ ئەحمەد بانیخێلانی باسی ئەو بارودۆخەی دەکا کە "جوقد"ی تێدا بەسترا. دوای سەقامگیریی بارودۆخە سیاسییەکە و روونبوونەوەی روانینە دۆخەکە، سەرکردایەتیی حیزب پرۆژەی هاوپەیمانییەکی بۆ بەرەی نیشتمانی خستەڕوو و، بەسەر هەموو لایەنە پەیوەندیدارەکانیدا دابەش کرد و، سەبارەت بە پرۆژەکەش هەڵوێستی حیزبە کوردستانییەکان لەگەڵ بۆچوونی ئێمە لێک نزیک بوون، بەڵام سەرکردایەتیی قوتریی عێراقی هەواداری سوریا و بە سەرکردایەتیی عابدولجەبار کوبەیسی و، هەندێ هێزی قەومیی عەرەبیی دیکە، هەوڵیان دەدا ئاڕاستەی قەومیی عەرەبیی بەرتەسک باڵ بەسەر پرۆژەکەدا بکێشێ و، لەلایەکی دیکەشەوە سەرکردایەتیی حیزبی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان ڕازی نەبوو پارتی دیموکراتی کوردستان لەو بەرەیەدا بەشدار بێ و، حیزبی بەعس و بزووتنەوەی سۆشیالیستی عەرەبی لەو ئاراستەیەدا پشتیان دەگرت. بۆزیاتر : احمد باني خيلاني ، المصدر السابق، ص٣٠٨.

پێمگوت: "تۆدەبێ لە پەیوەندیت لەگەڵ ئێمە دلنیابی، بەلام ،و،
ئەوەی دەست بەسەر ڕای ئێمەدا بگری. دەبێ پەیوەندیی ئێمە
بەو جۆرەبێ. پێمگوت ڕای من داگیر مەکە، ئەگەر دەست
بەسەر بیروڕامدا بگری ئەوا ناتوانم هیچ شتێکت بۆ بکەم.
پێمگوت دەبێ تۆش هەمان هەڵوێستت بەرانبەر ئێمە هەبێ".
لە کۆبوونەوەیەکماندا، مام جەلال، نامەیەکی ئاڕاستە کردین و
تێیدا گوتی: "دەبێ هاوپەیمانییەکەتان بە ئاگاداریی یەکێتیی
نیشتمانیی کوردستان بێ". ئێمەش وەڵاممان نەدانەوە، چونکە
دەیانویست ببنە سەرپەرشتیاری چالاکی و پەیوەندییەکانمان.[٢٦٩]
کەچی ئەحمەد بانیخێڵانیی سەرکردە لە حیزبی شیوعی،
ڕەهەندێکی دیکە دەداتە هەڵوێستی یەکێتیی نیشتمانیی
کوردستان بەرانبەر بە حیزبی شیوعی و، دەڵێ ڕاستیی کارێ
بۆ ئەوەی دەگەڕێتەوە کە "لە ناوەڕاستەکانی ١٩٨٢ هەستمان
بە جۆرە پەیوەندییەکی نێوان یەکێتیی نیشتمانی و ڕژێمی
بەعس دەکرد و، ناوە ناوە زانیاریی سەردانی هەندێ کەسی
ئاشکرا نەبوو پەیوەندییان بە بەعسەوە هەیە، دەگەیشتنە
بارەگایەکانی یەکێتیی نیشتمانی. لە کۆبوونەوەی لیژنەی
مەرکەزیی لە ئەیلولی ١٩٨٢ کرا، مام جەلال نامەیەکی بۆ
هاوڕێ عەزیز محەمەد نارد و داوای لێ کردبوو ببینێ و
دەریخستبوو کە ڕژێمی عیراق ئامادەیە دانوستان لەگەڵ
شیوعییەکان بکا ، هاوڕێ عەزیز محەمەد پێیڕاگەیاندبوو کە
بابەتەکە دەخاتە بەردەستی سەرکردایەتیی حیزب و وەڵامی

---

[٢٦٩] _ دیدارێک لەگەڵ عەزیز محەمەد ٢٠١٥/٢/٢٥.

لێ دەگێڕێتەوە، جا دواتری مەکتەبی ســـیاســـی بە نامەیەکی کورت وەڵامی دایەوە و، تێیدا سوپاسی مام جەلالی کردبوو و گوتبووشی ئێمە و ڕژێم هیچ کۆلکەیەکی هاوبەشمان لە نێواندا نییە و هیچ زەمینەیەک نییە لەگەڵ ڕژێم کۆمانکاتەوە و داوای لێبووردن دەکەین"[270]

[270] _ ا حمد باني خيلاني ، المصدر السابق، ص٢٤٧.

# کۆنگرەی چوار و "بەکورد کردنی" حیزبی شیوعی[1]

لەوەتەی حیزب دووچاری ئەنجامەکانی کودەتای ١٩٦٣ و بەرەنجامەکانی دواتریی بووبوو ، ڕێژەی کوردەکان لەسەرکردایەتیی حیزب و پێگە گرنگەکانی، تەواو رووی لە زیادی کردبوو و ، لەپای ئەوەش خەریکبوو حیزب دەبووە پاشکۆی کێشەی کورد.[٢٧١]

دوای ئەوەی لە عێراق چووینەدەرەوە و، بەرەی نیشتمانی و نەتەوەیی پێشکەوتنخواز هەرەسی هێنا، زۆر پێویست بوو کۆنگرەیەکی حیزب بگیرێ. لەسەر ئەوەی ڕێککەوتین ژمارەی ئەندامانی لیژنەی مەرکەزی کەمکرێتەوە و بکرێتە پازدە ئەندام. ڕاستییەکەی ئەو ڕایە بە کۆی ڕا بوو. لە تەک ئەوەشدا، بڕیار درا لیژنەی مەرکەزی بە خەڵکێکی نوێ موتوربە بکرێ و، ئەو کەسە نوێیانەش وەک سەرکردایەتیی سێبەر بن و ژمارەشیان دە کەس بێ. من ڕاسپێردرام ئەو "دە"یە هەڵبژێرم.[٢٧٢] منیش

---

[٢٧١] _ خالد حسین سلطان، المصدر السابق، ص١١٧.

[٢٧٢] _ عەدنان عەباسی ئەندامی لیژنەی مەرکەزیی لە کۆنگرەدا لە کاندید کردنێ هەلاویردرابوو ، دەڵێ "ئەو شتانەی بۆ نەریتی حیزب و سەرکردایەتیی بە کۆمەڵ و پەیرەوی ناوخۆی و سووک سەیرکردنی ئیرادەی شیوعییەکان و لیژنەی مەرکەزییش نائاسایی بوون ، ئەوەبوو کە ڕەزامەندیی کۆنگرە لەسەرپێشنیارێک وەربگیرێ عەزیز محەمەدی بە تەنیا دەستکراوە کردبێ دە ئەندامی نوێ هەڵبژێرێ بێ ئەوەی کۆنگرە و لیژنەی مەرکەزی هیچیان لەبارەوە بزانێ. دواتریش، زۆربەی ئەندامانی کۆنگرە و ئەندامانی لیژنەی مەرکەزی ناڕەزایی و پێناخۆشبوونی خۆیان لەو ڕێوشوێنە دەربڕی، بەتایبەت دوای ئەوەی ناوی ئەو کەسانەیان زانی کە بۆ ئەندامیی لیژنەی مەرکەزی داندرابوون، ئەو کەسانەش بەردڵی کادیر و ڕێکخستنەکانی حیزب نەبوون. بۆ زیاتر: عدنان عباس، المصدر السابق، ص٢٩٢.

لای خۆمەوە لیستێکم دانا و ناوی ژمارەیەک هاوڕێم نووسی تا پێش بچوککردنەوەی پێشکەشی لیژنەی مەرکەزیی بکەم. داوام لە خەڵکە کۆبووەوەکە کرد بیانخەینە ناو پێکهاتەی سەرکردایەتیی سێبەر و نادیاری. ئەوان داوایان لی کردبووم من بە تەنیا هەڵیانبژێرم، بەڵام من خستمە بەردەستیان تا ئاگایان لە هەڵبژاردنەکە بێ.[٢٧٣]

ئەودەمای، دەمانویست دەستەی سەرکردایەتی نهێنی و نادیاربێ. ئەودەمی سرتە و خورتەیەک هەبوو گوایە هەوڵی ئەو بچووککردنەوەیە ئامانجی "بە کوردی کردن"ی حیزبە. ئاخر حیزبی نێونەتەوەیی لەکاتی هەڵبژاردنی ئەندامانی سەرکردایەتی سەیری ئایین و نەتەوەی هاوڕێیان ناکا. ئێمە هەرگیز بیرمان لەوبابەتە نەکردبووەوە.

ئەو کارەساتانەی عێراق بەسەری هات و نەخاسمە دوای کودەتای ٨ی شوباتی ١٩٦٣، روونیدەکاتەوە کە ئەو ستەمەی هەبوو ئەندامە عارەبەکانی کردبووە ئامانج، چونکە لەو ناوچانەدا کاریان دەکرد کە دەسەڵاتی ناوەندیان بەسەردا زاڵ بوو. لەکاتی کودەتادا، ئەوەندەی هاوڕێیانی عەرەب کرانە ئامانج هاوڕێ کوردەکان ئەوەندە نەکرانە ئامانج، چونکە کوردەکان لەبەر دەستی ئەو زەبروزەنگەی نەبوون، بگرە دووریش بوون. لە جەمال حەیدەری و نافیع یونس بترازێ هاوڕی کوردەکانی سەرکردایەتی کەسی دیکەیان نەکرانە

---

[٢٧٣] _ دیدارێک لەگەڵ عەزیز محەمەد ٢٠١٥/٦/١٢.

ئامانج، ئەوانیش، بۆیە گیران چونکە لە بەغدا بوون.[274] من لەکەرکووک بووم و هەرزوو و دوای هەشت ڕۆژ چوومە چیایەکانی کوردستان. هەر بۆ ئەوەی زیانەکانیش کەمکرینەوە، داوام لە هەموو سەرکردەکان کرد ڕوو لە ناوچە کوردییەکان بکەن. هەر بەڕاستیش ئەوەی ڕوویدا ئەوەبوو و، ژمارەیەکی زۆری هاوڕێیانی کورد و عارەب توانییان بکشێنەوە و نەکەونە بەر چەنگی ئاسایش، بەڵام ئەو هاوڕێیانەی، بەهۆی زمان لێدانی خەڵکێکی لەسەر شیوعییەکان حیساب بوون لەناوبردران، بەشی هەرەزۆریان عارەب بوون. بەڵام ئەو دەستە نەگەیشتە هەموو ناوچە کوردییەکان، چونکە تایبەتمەندیی سیاسی و جوگرافیی خۆی هەبوو. هیوادارم باوەڕ بەوەی بکەی زۆرجاران هاوڕێیانمان نە ئایین و نە نەتەوەی یەکدی نازانن، تەنیا مەگەر ناوی هاوڕێیان بتباتەوە سەر ئەوەی سەر بە کێ و بە کوێیە و، ئەوەش هەر لەبەر ئەوەیە کە بەرژەوەندیی نیشتمان و گەل و فیکرێک کۆیکردوونەتەوە کە گوێ بەو دابەشکردنانە نادا و، خاوەنی ئەو باوەڕانەش تەنیا خۆشەویستیی خەڵک و کارکردن بۆ چاکەی ئەوان و ئازادیی نیشتمان و بەختەوەریی گەل کۆیکردوونەتەوە. ئاخر ئەوان ئەو باوەڕە کۆیان دەکاتەوە.[275]

---

[274] _ جەمال حەیدەری، دوای دەستگیرکردنی سکرتێری حیزبی شیوعیی عێراقی پێشەوایی حیزبی کرد و، توانی سەرکردایەتیی حیزب و بەرگریی چەکداریی حیزبی شیوعیی عێراقی بکا، تا لە تەمووزی ۱۹٦۳ گیرا. بۆ زیاتر: عبدالفتاح علي البوتاني، المصدر السابق، ص۳۵۷.

[275] _ دیدارێک لەگەڵ عەزیز محەمەد ۲۰۱۵/٦/۱۲.

سەرباری ئەو لاسەنگییەی لە پێکهاتەی سەرکردایەتی دروستبوو و، لە بەرژەوەندیی پێکهاتەی عارەبی نەبوو، بەڵام ئێمە، بیرمان لەوەی نەدەکردەوە. دەبووایە لیژنەی مەرکەزی بە ئەندامێتیی ئەو دە کەسە ڕازیبێ کە لە سایەی بارودۆخی کاری نهێنی بۆ سەرکردایەتیی سێبەر دەستنیشان کرابوون. ئەوان لەسەر ئەو بنەمایانە دەستنیشان کرابوون:

١ـ تەمەنی حیزبی.

٢ـ نەتەوە، تا هاوسەنگیی نەتەوەیەیی بداتەوە حیزب.

٣ ـ ئاستی تەمەنیان.

٤ ـ ئاستی ڕۆشنبیرییان.

ئیدی دە هاوڕێ هەڵبژێردران و، پاشان هەندێکیان بۆ ئەندامێتیی مەکتەبی سیاسی و لیژنەی مەرکەزیی هەڵبژێردران و، لەوانەش حەسان عاکیف و لەبید عەباوی و خەڵکی دیکەش.[276]

لەبەر ڕۆشنایی ئەو کارەش، ڕای سەرکردایەتیی حیزبم وەرگرت داخوا چۆن مامەڵە لەگەڵ "سەرکردایەتیی سێبەر" بکەین. هاوڕێیەک ئاماژەی بەوەیدا با ناوی ئەو هاوڕێیانە نهێنی بێ و نەزاندرێ[277]، بە دەقی ئایین جەخت لەسەر ئەوەی دەکرێتەوە "پێویستی و ناچاری حەرام حەڵاڵ دەکا". بێگومان،

---

[276] _ دیدارێک لەگەڵ عەزیز محەمەد ٢/١٠/٢٠١٥.

[277] _ لەوانەی دوورخرانەوە عامر عەبدوڵلا و نەزیهە دلێمی و زەکی خەیری و جاسم حەلوائی و باقر ئیبراهیم و عەبدولوەهاب تاهیر و عەدنان عەباس و حەننا ئەلیاس و فاتیح ڕەسول و حوسێن سوڵتان و ماجید عەبدولڕەزا و ناسر عەبود و بوشرا پرتەو بوون. بۆ زیاتر : عدنان عباس ، المصدر السابق، ص ٢٩٠.

دەبووایە هێنانەپێشـــی ئەو هـاوڕێیە نوێیـانە بە ڕەزامەندی
لــیــژنەی مەرکەزی بــێ. دوای ئەوەی لــیــژنەی مەرکەزی
ڕەزامەندیی لەســـەر ناوەکان نیشـــاندا، من لەبارێکی گرانی
ســـەرشـــانم دەربازبووم. بەڵام دەســـتم لەو بارە قورســـەی
بەرنەدا. هەندێ سەرکردە، پێیانوابوو دەبێ ئەو هاوڕێیە نوێیانە
ئەو خەسڵەتانەی سەرەوەیان تێدابێ و، منیش ئەو سەروبەرەم
کرد و ئەوانەم هەڵبژارد کە ئەو خەسڵەتانەیان تێدایە.[278]
لادانی نەوەی کۆن!!!:
ئەوەی بوو پاکتاوکردن نەبوو، وەک هەندێک حەزیان لێیە ئەو
ناوەی لێ بنێن. بۆ نموونە، یەکێک گوتی، تۆ بەهادین نوریت لە
حیزب دەرکرد. من بەدرێژایی ژیـانم بە بیرم نـایەت بەو
مەبەستە لێپێچینەوەم لەگەڵ
هـاوڕێیەکدا کردبێ تـا لە حیزبی وەدەرنێم. هەنـدێ کەس ئەو
قسـانەیان سـەبارەت بە من کرد. من خۆم لەو قسـانە بەری
دەکەم، چونکە دەزانم دەرکردنی کەســـێـک لە حیزبەکەی چ
مـانـایەکی هەیە، لەکـاتێکـدا ئەو کەســـە هەموو ژیـانی بەو
چالاکییانە بەسەربردووە کە بۆ حیزبەکەی کردوویەتی.[279]
من هەرگیز لەگەڵ ئەوەی نەبوویمە هەڵاوێردن بۆمـانەوە یـان
دەرکردنی ئەندامێکی حیزب بکرێ. دەستەی سەرۆکایەتی سی
و یەک ئەندامی هەبووە. پێشـنیارمان بۆ کۆنگرەکرد نیوەی ئەو
ژمارەیە هەڵبژێردرێ و، ناوی کەســـمان لە لیژنەی مەرکەزی
دەستنیشان نەکرد. ئێمە پێویستمان بە پازدە ئەندامی نوێ بوو

[278] _ دیدارێک لەگەڵ عەزیز محەمەد ٢٠١٥/١٠/٣.
[279] _ دیدارێک لەگەڵ عەزیز محەمەد ٢٠١٥/١١/٢٢.

بۆ دەستەی سەرۆکایەتیی نوێ. پێش کۆنگرەش لە کۆبوونەوەی لیژنەی مەرکەزی لەسەر ئەوەی ڕێککەوتین. بۆیە، سێ و یەک ناومان خستە بەردەم کۆنگرە تا پازدە ئەندامیان هەڵبژێرێ. ئامانجمان دەستەبەرکردنی کاری نهێنی بوو. من زۆرم پێناخۆش بوو زەکی خەیری و عامر عەبدوڵلا هەڵنەبژێردران. ئاخر من سەرسامی هەردووکیانم، بەڵام بایی ئەوەندەیان دەنگ نەهێنا بیانکاتە ئەندامی دەستەی سەرۆکایەتی. ژمارەی ئامادەبووانی کۆنگرە نزیکەی "١١٧" نوێنەر بوون و، کۆنگرە لەژێر سایەی خیوەتی چیایەکانی کوردستان بەسترا.[٢٨٠]

نوێنەرانی کۆنگرەی ژمارەیان "١١٧"کەسبوو، دەنگیان بۆ پاڵێوراوان دا کە ژمارەیان سێ و یەک کەس بوو. سێزدە کەسیان دەنگی پێویستیان هێنا کە زۆرینەی ڕەهای سەرکردایەتیی نوێ بوون و، ئەوەش لە ژمارەی پێویست کەمتر بوو کە دەبووایە پازدە ئەندام بن. کۆنگرە رازی بوو پاڵ بە سێ کەسی دییەوە بنێ کە دەنگی نزیکی سەرکەوتنیان بەدەستهێناوە تا ژمارەکە ببێتە شازدە ئەندامی تەک ئەو دە ئەندامەی دیکەی بۆ سەرکردایەتی لە لیژنەی مەرکەزی دەنگیان بۆ درابوو. ئەوەی سەیربوو مەهدی عەبدولکەریمی کۆچکردوو لەسەر پاڵپێوەنانی دوو کەسان ڕازیبوو نەک سێ کەس و، نەیشسیدەزانی سێیەمەکە خودی خۆیەتی!. بڕیاریش

---

[٢٨٠] _ دیدارێک لەگەڵ عەزیز محەمەد ٢٠١٥/١٠/٢.

وابوو  بۆ لەبەرچاوگرتنی نهێنیبوونی کارەکان ئەنجامەکان لە کۆنگرە ڕانەگەیەندرێن.[٢٨١]

نوێنەرانی کۆنگرەی ژمارەیان "١١٧" نوێنەر بوو، سـێزدە ئەندامیان لە سـەرکردایەتیی نوێ هەڵبژارد و، ئەوەش لەو ژمارەیەی کەمتر بوو کە پێشتری پێشنیارمان کردبوو، واتە هەڵبژاردنی پازدە ئەندام. پاشـتری سـێ ئەنـدامـمـان لەوانە هەڵبژارد کە دەنگی نزیکی سەرکەوتنیان بەدەستهێنابوو و، مەهدی عەبدولکەریم لەسـەر دوو کەسان ڕازیبوو و دەنگی بۆ سـێیەمیان نەدا، ژمارەکە بووە شازدە ئەندامی تەک دە ئەندامی پێشتری.

ڕاسـتییەکەی، ئێمە کەسـمان لانەدا. وەک گەواهیدانێکیش بۆ مێژوو دەڵێم، هیچ شـتێکی ئاوا ڕوووینەداوە. من لەبەردەم دادگا نیم تا ئەو ڕاسـتییە بشـارمەوە. من ڕاسـتییەکە دەڵێم. لە کۆنگرە گوتم ئێمە لە سـڕینەوەی نیوەمـانـدا سـەرنەکەوتین. گوتم من، سـەربـاری قورسـییەکەیشـی، ئەو ئەرکە بۆ ئێوە بەجێدێڵم. دەبێ ئێوە بریار بدەن، ژمارەمان سـێ و یەک هاوڕێیە و بڕیارمان داوە ژمارەی خۆمان کەمکەینەوە. بەڵام دووبارەی دەکەمەوە، نیوەمان نەیتوانی نیوەکەی دیکەی بسـڕێتەوە، ئیدی کۆنگرە، وەک باسـم کرد، لەکۆی سی و یەک هاوڕێ سێزدە هاوڕێی هەڵبژارد.[٢٨٢]

---

[٢٨١] _ خەڵکێکی زۆر ڕەخنەیان لە شـێوازی هەڵبژاردنەکە گرت چونکە بە نهێنی کرا، حیزبی شـیوعیی عێراقییش پێشـتری شـتی ئاوای بەخۆوە نەدیتبوو، ئارا خاجادۆری سـەرکردەش باسـی ئەو بابەتە دەکا. هوامش علی لحظات حرجة ومنعطفات حادة، دار الشهد ، دمشق، 2009 ، ص91.

[٢٨٢] _ ئارا خاجادۆری سـەرکردە  باسـی ئەوەی دەکا کە عەزیز محەمەد سـەرەتای کۆبوونەوە گوتی ئێمە بۆ ئەوەی کۆبووینەتەوە تا نیوەمان نیوەکەی دیکەمان لابدا، بەو

# سەربردەی من لەگەڵ عامر و باقر و ماجد و زەکی و حوسێن سوڵتان:

پێدەچێ، سیاسەتی ڕاسترەوی و چەپڕەوی، سیفەتێکی هەمیشەیی بەخشیبێتە حیزبی شیوعیی عێراقی، ئەوجارەیان سیاسەتی سڕکردنی ئەندامێتیی تێپەڕاند و چووە سەر ئەوەی خەڵکێک نەباتە ناو سەرکردایەتی کە ڕێچکەیەکی جودا لە هیی حیزبی شیوعیی عێراقییان هەیە و، لەوانەش عامر عەبدوڵلای شیوعییەکەی دوو سەردەمان، هەتا بەستانی کۆنگرەی چواری حیزب لە ١٩٨٥ و بچووککردنەوەی قەبارەی لیژنەی مەرکەزی هەر ئەندامی مەکتەبی سیاسی و لیژنەی مەرکەزی بوو و، بە قسەی خۆیشی ئاگای لەو بچووککردنەوەیە هەبووە و بۆیە ئامادەی کۆنگرە نەبووە و، دواترێ، نووسراوێکی ناڕەزایی لە تەمووزی ١٩٨٦ لەگەڵ کۆمەڵێ ئەندامی مەکتەبی سیاسی و لیژنەی مەرکەزی پێشکەش کرد و، تێیدا خراپیی بارودۆخی حیزبیان ڕوونکردبووەوە و، ئەو کارەی کۆنگرەی چواریان بە لادانی ئەو هاوڕێیانە دانابوو کە سێدەیەی ژیانیان لە ناخۆشترین بارودۆخی حیزبدا بەسەربردبوو و، سەرکردایەتییان بەوەی تۆمەتبار کردبوو گوایە هەڵبژاردنێکی پاک و بێ گەردیان نەکردووە.[٢٨٣]

---

شێوازە ئامارییەش ململانێی ناوخۆی یەکلا کردەوە. بۆ زیاتر: ارا خاجادور، المصدر السابق، ص٩١.

[٢٨٣] _ غادة فائق محمد علي، المصدر السابق، ص١٣٦-١٣٧.

عەزیز محەمەدیش، وەها وەسفی نارازییان دەکا و لەوانەش ئەو چوارەی بەر بچووککردنەوەی ژمارەی ئەندامانی لیژنەی مەرکەزی کەوتن و، دەڵێ ئەندامانی کۆنگرە حەزیان لە چارەی عامر عەبدوڵڵا نەبوو. بەڵام ئێمە نەماندەویست لابدرێ. عامر عەبدوڵڵا دوای کۆنگرە پێیگوتم بۆ ناوی براوەکان و دۆڕاوەکانتان ڕانەگەیاند؟ گوتم هاوڕێ عامر ئەوە لەگەڵ ئەو نهێنگیرییەی ڕێکنایەتەوە کە وەک حیزبێکی نهێنی لە چالاکییەکانمان پەیڕەوی دەکەین. شتێکی دیکەیش هەیە و ئەگەر ناوی سەرنەکەوتووانمان ڕاگەیاندبا بەربەستێکمان دادەنا و لێ نەدەگەڕاین لیژنەی مەرکەزیی نوێ هەوڵدا سوودیان لێ ببینێ. ئێمە دەمانەوێ ئەو لێوەشاوەییانە بپارێزین. پێمگوت هاوڕێ عامر... تۆ عامر عەبدوڵڵای..... جا ئەگەر ئەندامی لیژنەی مەرکەزی بی یان مەکتەبی سیاسی و یان ئەندامێکی ئاسایی بی. ڕاستییەکەی، تۆ بە هەموو وزە و شارەزاییتەوە هەر ئەو عامر عەبدوڵڵایەی کە دەبێ تواناکانت بەرەو بەرژەوەندییەکانی حیزب بێ. ئەو باوەڕی بەو قسانە نەبوو کە دەمویست بۆی ڕوونکەمەوە لەوەی گەورەترە ببێتە ئەندامی لیژنەی مەرکەزی. گوتم بۆ نموونە نووژدارێکی شارەزای سەر ئاستی عێراق، ئەگەر لەبەر هەر هۆیەک بێ و بۆ ئەندامیی سەندیکای پزیشکان هەڵنەبژێردرێ، ئەوە مانای وا نییە ئەو نووژدارێکی بەتوانای سەر هەموو عێراق نییە. پێمگوت تۆش ئاوای، عامر عەبدوڵڵا پێیگوتم ڕاوەستە با وشەکانت بە گیانمدا بگەڕێ و تێیان بگەم. گوتم ئەو "نووژدار"ە نە لە مەکتەبی سیاسییە و نە لە لیژنەی مەرکەزییە. تۆ نووسەر

و سیاسیی و دەتوانی خزمەتی حیزب بکەی. ئەگەرچی هەندێ جاران عامر عەبدوڵلام بە دڵ نەبوو، بەڵام تواناکانی پشـــترێ ناکەم.[284]

هەر بەوەندەی وازم نەهێنا ڕەخنە لە عەزیز محەمەدی بگرم، گوایە عامر عەبدوڵلای لاداوە، بەڵکو باقر ئیبراهیمی کادیری شیوعیی دوو سەردەمانیش لە توێی یادەوەرییەکانیدا وەسفی بارودۆخی دوورخســـتنەوەی خۆی لە کۆنگرە دەکا و، ئاماژە بەوەی دەکا "دوای ئەوەی تێبینییەکانی خۆم لە نۆی تەمووزێ بۆ حیزب دەربڕی، کە لایەنی ســیاســی و ڕێکخراوەیی گرتبووەوە، ئەودەمای نامەکەم کاردانەوە و شــۆکبوونێکی توندی لای بەرپرســە ســەرەکییەکانی حیزب دروســتکرد و، عەزیز محەمەدیش لای خۆیەوە گوتبووی ئەوە بەرنامەیەکی دیکەیە بۆ حیزب. پێش کۆنگرەش، عەزیز محەمەد ســەردانی کردم و داوای لێ کردم خۆم ئامادەی سەفەرێ بکەم. سەبارەت بە بارودۆخی بەســتانی کۆنگرەی چوار قســەمان کرد، دیتم بەڵگەنامەکانی هەموو ئامادەن و من، پێچەوانەی ڕۆڵی دیارم لە شــەونخوونییەکانی ئامادەکاریی کۆنگرەکانی پێشــترێ، هیچ بەشدارییەکم تێیدا نییە و، بە عەزیزم گوت خەمی بەرایی ئێوە ئەوەیە کودەتایەک لە ســەرکردایەتیی حیزبدا بکەن و، ئەو کەسانە وەدەرنێن کە ئامادەکاریتان بۆ وەدەرنانیان کردووە و، ئەوانەش کارێکن پێشــترێ ڕێکخراون و گومانیشــی تێدا نییە جێبەجێ دەکرێن. ئیدی، بۆ ماندوێتیی سەفەر بکێشین! کەچی

---

[284] _ دیدارێک لەگەڵ عەزیز محەمەد ٢/١٠/٢٠١٥.

عەزیز محەمەد گوتی، ناتوانم حیزب و سەرکردایەتیمان بی ئ
بێنمە بەرچاو"[285]

عەزیز محەمەد، وەڵامی قسەکانی باقر ئیبراهیم دەداتەوە و دەڵێ، ئەوەی ئەو دەیڵێ ڕاستە و نزیکبوونەوەی ئەو دووەش دەگەڕێتەوە سەردەمی خەباتی هاوبەشمان، نەخاسمە لەو کادیرانەی حیزبین کە پێمان دەڵێن نەوەی کۆن و، تا ڕادەیەک بیرکردنەوەمان لێکدی نزیکە و بۆچوونی دوورخستنەوەش بەسەر ژمارەیەک کادیرانی کۆنی حیزبدا زاڵ ببوو و لەوانەش[286] باقر ئیبراهیم. هەوڵمدا ئەو بیرۆکەیەی لەمێشکیدا پەرتکەم، بەڵام ئەو لەسەری ڕشت بوو و، ڕازیم کرد ئامادەی کۆنگرەبێ و هەر بەراستییش هات، بەڵام دەنگی پێویستی نەهێنا.

نموونەیەکی دیکەی ترس لێ نیشتنی هەندێ ئەندامی نەوەی کۆن لە هەڵنەبژاردنەوەیان لە کۆنگرەی چوار، ماجد عەبدولڕەزا بوو. پێش بەستانی کۆنگرە، ماجد هەندێ تێبینیی گوێ لێ ببوو کە ڕەنگە بۆ ئەندامیی لیژنەی مەرکەزی هەڵینەبژێرنەوە. پێیگوتم: "هاوڕێ دەمەوێ لەوبارەیەوە پرسیارت لێ بکەم، " ماجد هەندێ ڕەخنەی لەسەر دروست ببوو، لەوانەش ملدانی بۆ داواکانی بەعس". گوتم هاوڕێ راستە حیزب لە هەندێ

[285] _ باقر ابراهیم ، المصدر السابق، ص ٢٣٦-٢٣٧.

[286] _ دیدارێک لەگەڵ عەزیز محەمەد ٢٠١٥/١١/٢٢.

بابەت لەگەڵت هاورا نییە. بەڵام من بە هەموو دڵسۆزییەکەوە دەمەوێ لە حیزب بمێنیتەوە.
یەک لەو خەوشانەی لەسەر ماجد بوو ئەوەبوو، لە دوارۆژەکانی بەرەدا دەستگیر کرابوو. دەسەڵاتە ئاسایشییەکانیش بە ماجدیان گوتبوو لارییان لە بەردانی نییە، بەڵام بەو مەرجەی وتارێک بە ناوی خۆی لە ڕۆژنامە بنووسێ و، نووسینەکەش ڕێکەوتی دەستگیرکردنی ئەوی لەسەر بێ. بەوەش دەیانویست تانە لە راستگۆیی هەڵمەتی جیهانیی حیزب بدەن، کە بۆ داوای بەردانی بەرپای کردبوو. داوا لە ماجد کرا بڵاوکردنەوەی وتارەکەی تا دوای وەستانی هەڵمەتەکە دوابخا، کەچی ماجد وتارەکەی بڵاوکردەوە. جا لەکاتی لێپێچینەوەی لیژنەی مەرکەزی ماجد دانی بە هەڵەکەی خۆیدا نا. بەداخەوە، ماجد دەنگی پێویستی بوونە ئەندامی لیژنەی مەرکەزیی حیزبی لە کۆنگرەدا نەهێنا.
یەک لەوانەی ترسی ئەوەیان هەبوو هەڵنەبژێردرێنەوە باقر ئیبراهیم بوو. پێمگوت شتی وا لەگۆڕێ نییە و نازانم هۆی ئەو مەترسییانە چییە، ئیدی خۆی بۆ هەڵبژاردنی لیژنەی مەرکەزی نەپاڵاوت.
هەرچی زەکی خەیرییە، من وەک برایەکی گەورەی تەماشا دەکەم. ئەو ڕۆشنبیریکی لێزانە و زۆریشی شایی بەخۆیە. هەندێ جاران لەگەڵ ئەو ڕایانەی ڕێکنەدەکەوتم کە دەیخستنە ڕوو. سەرباری ئەوەی هەندێک لەوەی ناڕازیبوون دەنگی ناڕەزایی بەرانبەر سیاسەتی حیزب هەبێ، بەڵام لەبەر ئەو لێوەشاوەیی و توانایەی وەک دەنگێکی ناڕازی هەیبوو،

هیواخوازبووم لە سەرکردایەتی بمێنیتەوە. من ئامانجم ئەوەبوو نەیانگەیەنینە خاڵی دابڕان.
ڕاستییەکی گرنگ هەیە و دەبێ ئاماژەی پێ بکرێ، ئەویش ئەوەیە هیچ نیازێکمان بۆ دوورخستنەوەی عامر و زەکی و هەندێ ئەندامی سەرکردایەتیی پێشتری نەبوو. بەڵام ئەوەتا هۆشیاریی هەڵبژاردن و لاوازیی بژاردەکردن بوونە هۆی ئەوەی هەندێ هاوڕێ نەتوانن دەنگی پێویست بەدەست بێنن تا ببنە ئەندامی لیژنەی مەرکەزی و مەکتەبی سیاسی. ئەو کارەش دەکەوێتە سەر بژاردەی ئەندامانی کۆنگرە و ناکەوێتە سەر شانی سکرتێری حیزب.
حوسێن سوڵتان سوبیی ئەندامی لیژنەی مەرکەزی، لە بیرەوەرییەکانیدا دەڵێ تۆ بارودۆخی تاراوگە و کاری نهێنیت بۆ ئەوە قۆسووەتەوە تا هەندێ کێشەی کۆنی پێ لەگەڵدا یەکلا بکەیەوە، بەتایبەت هەڵویستی بەرانبەر بەکوردکردنی حیزب و، کارت بۆ ئەوەی کردووە تا لە بوڵگارستانی بێنییە دەرێ و بانگی دیمەشقی بکەیەوە و، لە خانوێکی خراپی ئەوتۆی نیشتەجێکەی کە لەگەڵ بارودۆخی تەندروستییدا نەدەگونجا و لە گوزەرانێکی ناخۆش لەژێر چاودێریدا بووە.[٢٨٧]
ئێمە دژی هیچ شیوعییەک نەوەستاوین. بۆ نموونە حوسێن سوڵتان سوبی لە برادەرە نزیکەکانم بوو. ئەو لە لایەنگر و چالاکە ڕاستەقینەکانی ڕێکخراوی "ڕاية الشغيلة"ی ساڵی

[٢٨٧] _ خالد حسين سلطان ، المصدر السابق، ص ١٥٠.

١٩٥٣ی شـــاری نەجەفی ئەودەمی بوو. ئەوەش بەهێزترین ڕێکخســتنی "رایة الشـغیلة" بوو. لە کاتی دەرچوونم لە عێراق دوای کودەتـای ٨ی شــوبات، ئەو لە پراگ بوو و ئەنـدامی دەســتەی ســەرۆکـایەتیی حیزب بوو. ئەو، گـاڵتەی لەگەڵ هاوڕێیەکانی دەکرد. ئەو، بەوەی ناسـراوە زۆر دەخوێنێتەوە و زۆریش دەنووسێ و زۆر ئاگای لە دنیایە. ئەگەر پرسیاری لێ کرابا داخوا چ دەنووســێ، وەڵامەکەی ئەوەبوو توێژینەوەیەک دەنووســم!! بەڵام بەداخەوە، هەنـدێ کەس پێیـانوایە گۆڕانی جێگەکەی لە پێگەی ئەوی کەمکردووەتەوە. ئەوەش لەگەڵ نەریتەکانی حیزب ڕێکنایەتەوە، چونکە لای مرۆڤی شــیوعی جیاوازیی نییە، چ لەناو ســەرکردایەتی کار بکا و چ لەدەرەوەی ســەرکردایەتی. گۆڕینی جێگەی حیزبی بوو وای لە هەندەکان کرد لە ســەردەمی دەســەڵاتی ســەدام حوســێن و لە کۆتایی هەشتایەکان بگەڕێنەوە وڵات.[٢٨٨]

---

٢٨٨ _ دیدارێک لەگەڵ عەزیز محەمەد ٢٠١٥/١١/٢٢.

## شەڕی کویت و ڕاپەڕینی شەعبانی[1]

هەڵوێستمان شکۆمەندییە بۆ حیزب. عەبدولکەریم داوای کویتی کرد و بڕیارێکی دەرکرد تا بکرێتە قەزایەکی سەر بە بەسرا. دژی ئەو ئاڕاستەیەی ڕاوەستاین و، قاسممان لەو سەرچڵییەی ئاگادار کردەوە. کە سەدامیش کوێتی گرت، وەک پشتیوانییەک لە گەلی کوێت، هەر لە یەکەم ڕۆژیڕا ئەو داگیرکردنەمان سەرکۆنە کرد و داوامان کرد هێزە عێراقییەکان بکشێنەوە و، هۆشیاریی ئەوەمان دا چ کارەساتێکی گەورە بەسەر گەلەکەمان و ناوچەکەدا دێنێ. ئێمە، دەمانزانی ئەگەر سەدام لە کوێت بمێنێتەوە، شەڕێکی وێرانکەر دروست دەبێ. بۆیە، بە مانەوەی ناڕازی بووین و هەوڵێکی زۆریشمان لای ئەو لایەنانە دا کە پەیوەندیی دۆستایەتییان لەگەڵ ڕژێمی سەدام هەبوو و ، داوامان لێکردن هانیدەن تا لە کوێت بکشێتەوە. بەڵام، ئەو شەڕە وایکرد گەمارۆیەکی ستەمکارانە بخرێتە سەر گەلی عێراق و، هەر لە سەرەتاڕا گوتمان ئێمە دژی ئەوەین گەمارۆی ئابووری بخرێتە سەر گەل، چونکە ئەوە ئازاری دەدا و ژیانی دەکاتە کەکرە و زەرەند و، بگرە توانای خەباتیشی لاواز دەکا. گەمارۆ بووە ئەوزارێک بەدەست سەدامەوە تا چارەسەری قەیرانەکانی خۆی پێ بکا، ئیدی بازرگانیی بە برسیەتی و نەخۆشیی گەلەکەمان و مەرگی منداڵانییەوە دەکرد تا گەمارۆی سەر ڕژێمەکەی هەڵگیرێ و، ڕێی بدرێ سەروبەری داهاتەکانی نەوت بکا تا ئەو چەک و جبەخانەیە بەدەستبێنێتەوە کە بەشی هەرەزۆریی لە داگیرکردنی کوێت و "ئومول مەعارک"ە

شـــــوومەکەی و دواتریش لە ڕێککەوتنەکەی ژێر خێوەتەکەی سەفوان لەدەستدابوو.[٢٨٩]

هاوکاتی کشـــانەوەی هێزەکانی عێراق و ئەو نائومێدییەی لە وێرانکردنی سـوپای عێراق و شـەڕی دووەمی کەنداو دروست بـوو، دۆخەکە لە ئـازاری ١٩٩١ تەقـیـیەوە و ڕاپەڕیـن لە پارێزگاکانی باشـوور و باکووری عێراق بۆ لەناوبردنی سـەدام حوســێن دەســتی پێکرد و، حیزبی شـــیوعیی عێراقییش لەو ڕاپەڕینە بەشدار بوو و لە هەر جێیەکی لێی بووبن بەشدارییان کردووە و، لە هەندێ جێیش پێشـــەنگ بوون. پارێزگای ئەنبار ی ڕەمـادی و فەلووجەی لەخۆ دەگرت و ســـێ پـارێزگـای دیکەش، ســـەدام ناوی لێنابوون پارێزگا ســـپییەکان، ئەوەش دانپێـدانـان بوو کە ڕاپەڕین هەموو چواردە پـارێزگـایەکـانی دیکەی گرتبووەوە. بەڕای من، پـارێزگـای ئەنبـاریش هەر بەو سـپێەتییە نەمایەوە و دوای لە سـێدارەدانی ژمارەیەک لە ڕۆڵە ئەفســـەرەکانی تووڕەییەکی گەورەی بەخۆوە دیت، لەوانەش محەمەد مەزڵووم و هاوڕێیەکانی.

لێرەدا، مەبەســـتمـان ئەو شـــیوعییـانەیە کە پەیوەنـدییەکی ڕێکخراوەییـان بە حیزبەوە هەبوو. قســـەش لەســـەر ئەو جەمـاوەرە شـــیوعی و لایەنگرانە دەکەین کە لەبەر دۆخە تۆقێنەرەکە و پچرانی پەیوەنـدی لە چوارچێوەیەکی حیزبی کاریان نەدەکرد، تەنیا ئەوانە نەبن کە هەموو پەیوەندییەکیان لە ڕێی گوێگرتن لە ئێزگەی مەرکەزیی حیزبەوە بوو، ئێزگەی

---

[٢٨٩] _ دیدارێک لەگەڵ عەزیز محەمەد ٢٠١٥/١١/٢٢.

دەنگی گەلی عێراق، كە چەندین ساڵ بوو خەڵكێكی زۆر گوێیان لێ رادەگرت و ئەوەی پەخش دەكرا تۆماریان دەكرد و بە زۆر شێوازیش دەیانگواستەوە و بڵاویان دەكردەوە و، لە رێیشییەوە پلانەكانی حیزبیان وەردەگرت و لەبەر رۆشنایی ئەو پلانانە كاریان دەكرد. لە رۆژانی راپەڕین خەڵكێكی زۆر لەوانە لەهیكڕا بە ئاشكرا دەركەوتن و بانگەشەیان كرد و رێكخستن و دەستەیان بە گەلێ ناو پێكهێنا. ئیدی شیوعییەكان لە هەموو بارەگا هاوبەشەكانی راپەڕیوان و لەگەڵ رێكخستنەكانی دیكەدا هەبوون و، لە بارەگای تایبەتی خۆیشیان هەر هەبوون. هەرچی كوردستانە، ئەوا رۆڵی شیوعییەكان لەوێ روون و ئاشكرا دیارە.

لەو كاتیدا، وا بڵاوكرابووەوە كە هەر ئەوەندەی رژێمی سەدام حوسێن برووخێ ئیدی شەڕی ناوخۆ هەڵدەگیرسێ. من، مەترسیی سەرەكیم لە مانەوەی سەدامدا دەدیت. ئەوەی دەربارەی مەترسیی هەڵگیرسانی شەڕی ناوخۆیش دەگوترێ تەنیا داهۆڵێكی تۆقاندن بوو و، لە بنەڕەتدا لایەنگرانی رژێم بڵاویان دەكردەوە، تا كۆسپ بخەنە بەردەمی خەباتی گەلی ئامانجی رووخاندنی ئەو رژێمە بوو. ئەگەر پێشبینیی تەقینەوەی شەڕێكی ناوخۆم نەدەكرد، ئەوە مانای وانەبوو كە هەموو شتێك ئامادەیە تا دەسەڵاتێكی ناوەند لەگەڵ رووخانی رژێم بێتە سەركار. ژان و ژوورێك پەیدادەبێ.رەنگە ژان و ژوورێكی ئەستەمیش بێ. ئەوە پەیوەستی ئەوەیە ئۆپۆزسیۆن چەندە وشیاری مەترسیی ئەو ململانێیانەی نێوانیانە و، چەندەش وشیاری مەترسیی بەدەمەوەچوونی ئەو

دەســــتتێوەردانە هەرێمی و نێودەوڵەتییانەیە، کە ڕەنگە هەوڵی نــانەوەی دووبەرەکی و دوورکەوتنەوەی هێزەکــان بــدا و، تەگەرە بخاتە ڕێی بەرپابوونی ژیانێکی دیموکراتیی بۆ خەوش. قسـە لەسـەر ئەوەش دەکرێ، مەترسیی ئەوەی هەیە هەر ڕێک لەگەڵ ڕووخانی ســـەدامدا عێراق پارچە پارچە ببێ. لە کاتێکدا کەتواری "واقیع" حـاڵەکە هەموو ڕۆژێـک دووپـاتی دەکـاتەوە مانەوەی سـەدام لەسـەری سـەرەوەی دەسـەڵات هەڕەشـە لە پارچە پارچەکردنی عێراق دەکا. چونکە هەر ئەوە، بە گەمارۆ خســتنە ســەر هەرێمی کوردســتان و بێبەشــکردنی لەوەی مامەڵەیەکی ئابووری و کۆمەڵایەتیی ئاسـایی لەگەڵ بەشـەکانی دیکەی عێراق بکا، ئەو دابەشـبوونەی ئێسـتا قووڵتر دەکاتەوە. قســـە لەســـەر ئەوەش دەکرێ، خۆرئاوا لە عێراق و ناوچەکەدا هەن و، جا دەبێ بپرســـین داخوا کێ ئەو پەلپ و بیانگانەی دەســتەبەر کردووە تا بێنە ئێرە و، تا ئێســتایش هەر دابینیان دەکا؟[٢٩٠]

[٢٩٠] _ مقابلة مع عزيز محمد؛غسان شربل، حوار مع عزيز محمد، مجلة الوسط، لندن، اب ١٩٩٧.

# کۆنگرەی پێنجی حیزبی شیوعیی عێراقی[1]

دوای ڕاگرتنی شـــەڕی نێوان عێراق و ئێران لە ١٩٨٨/٨/٨ و، ئەو تێشـکانە سـەربازییەی هێزەکانی پشـتیوانی و هێزەکانی دیکەی ئۆپۆزسـیۆنی هاوکات لەگەڵ ئەو ئاگربەسـتە هات و، کشانەوەیان بۆ ناوچە ئازادکراوەکانی باکووری عێراق لەلایەک و، ڕەتکردنەوەی ئەو ئاشـتەواییەی ڕژێمی بەعس خسـتبوویە ڕوو لەلایەن حیزبی شـیوعییەوە، حیزبی شـیوعییان تووشـی بارودۆخێکی ناخۆش و حاڵەتێکی ئاڵۆز کرد.[291]

موکەڕەم تاڵەبانی، سـەبارەت بە داوای ئاشـتەوایی بەعس، ئاماژە بۆ هەلوێسـتی عەزیز محەمەد دەکا "عەزیز محەمەدی سکرتێری یەکەمی لیژنەی مەرکەزیی حیزبی شیوعیی عێراقی، باوەڕی بەوەی هەبوو دەبێ حیزبی شـیوعی لەناو جەرگەی ڕووداوەکان بێ نەک لە پەراوێز یان پشـتی ڕووداوەکان. ئەگەرچی سکرتێری یەکەمی لیژنەی مەرکەزی باوەڕی بەوەی هەبوو کە لەو بارودۆخانەدا بژاردەیەکی دیکەیان نییە، بەڵام ئەو دەسـتبەندی ئەو بڕیارانە بوو کە لە کۆنگرەی چواری حیزبی شـیوعی دەرچووبوون و، ڕەخنەیان لەو سـیاسەتی هاوپەیمانییە دەگرت کە حیزب لەسەری ڕۆیشتبوو"[292].

حیزبی شـیوعیی عێراقی، هەوڵیدا ڕاسـتە و پاسـتەیەکی بارودۆخی خۆی لەگەڵ هێزە ئۆپۆزسـیۆنەکانی دیکە بکاتەوە، تا لە دیمەشـقی پایتەختی سـوریا و لە ١٩٩٠/١١/٢٧ واژوو

---

[291] _ صلاح الخرسان، المصدر السابق، ص٢١٦.

[292] _ بۆ زیاتر: مکرم الطالباني، مراحل تطور الحركة الكردية، ص٤٧١-٤٧٢.

لەسەر بەرنامەیەکی سیاسیی لیژنەیەکی کاری هاوبەش بکەن، کە ١٧ حیزب و بزووتنەوەی سیاسی واژوویان لەسەر کرد و ئەوەش ڕێ خۆشکەر بوو بۆ بەستانی کۆنگرەیەکی گشتیی هێزەکانی ئۆپۆزسیۆنی عێراقی لە بەیرووت و لە ماوەی نێوان ١١-١٣ی ئازاری ١٩٩١. جا عەزیز محەمەد لە کۆنگرەدا ڕوونیکردەوە "جیاوازییەکانمان نامانترسێنێ ئاخر بیروڕای جیاواز لەناو ڕەوت و حیزبەکاندا پێکەوە دەژین"[٢٩٣]

لە سایەی ئەو بارەدۆخەی عێراقی پێدا تێپەڕی، چ لە سەرکوتکردنی ڕاپەڕینی ئازاری ١٩٩١ و چ ئابلووقەی ئابووریی سەر عێراق، حیزبی شیوعیی عێراقی، بۆ بەرەوڕووبوونەوەی ئەو ئالنگارییە نوێیانە، بەستانی کۆنگرەیەک هەر زۆر پێویستە و لەسەر ئەوەی ڕێککەوتین کۆنگرە لە دیمەشق ببەستری، چونکە زۆربەی کادیرەکانی حیزبی شیوعیی عێراقی لەوێبوون و لەبەر ئاستەنگی گرێدانیشی لە عێراق زەمینە لەوێ ڕەخساوتر بوو و، پێیشموابوو، لەبەر گەلێ هۆ، لەوانە چووبوومە ناو ساڵ و پیرببووم و نەمدەتوانی شتێکی نوێ پێشکەشی حیزب بکەم و پێویستیش بوو هەل بدرێتە کەسانی دی، واباشترە خۆم بۆ سکرتاریەتی لیژنەی مەرکەزیی حیزبی شیوعیی عێراقی کاندید نەکەمەوە.[٢٩٤]

---

[٢٩٣] _ صلاح الخرسان، المصدر السابق، ص٢١٧.

[٢٩٤] _ دیدارێک لەگەڵ عەزیز محەمەد ٢٠١٥/١١/٢٢.

کەچی کادیرێکی حیزبی شیوعیی عێراقی، هۆیەکی دیکە دەداتە لاچوونی عەزیز محەمەد و، دەیباتەوە سەر:
١ـ قەیرانی ئەو کێشانەی لە سەرکردایەتیی حیزبدا هەبوون.
٢ـ لاوازیی ڕێکخستن بە شێوەیەکی گشتی.
٣- دروستبوونی دیاردەی بەربەرەڵلایی و گوێ پێ نەدان لە ڕیزەکانی حیزب و لە سەرکردایەتییشدا.
٤- لاوازیی سەرکردایەتیی حیزب و، لەسەرووی هەموویشیانەوە سکرتێری حیزب، لە یەکلاکردنەوەی هەندێ کاروباری ڕێکخستن و سیاسی و فیکری.[٢٩٥]
جا کارەکە هەرچۆنێک بێ، کۆنگرەی پێنجی حیزب لە ١٢-٢٥ی تشرینی دووەمی ١٩٩٣ لە شەقلاوەی هەولێرێ بەسترا و، "١١٥" نوێنەر ئامادەی بوون تا ناو لە کۆنگرە بندرێ "کۆنگرەی دیموکراتی و نوێبوونەوە" و دروشمێکیشی بۆ داندرا کە ئەوەبوو: "لەپێناو هەستاندنەوەی گەلەکەمان و هەڵگرتنی گەمارۆی ئابووریی سەر گەل و ڕووخاندنی دیکتاتۆرییەت و دامەزراندنی عێراقێکی دیموکراتیی فیدراڵیی یەکگرتوو و بەرگریکردن لە بەرژەوەندییەکانی ڕەنجدەران"[٢٩٦]. کۆنگرەی پێنجیش، حەمید مەجید موسای وەک سکرتێری نوێی حیزب هەڵبژارد.

---

[٢٩٥] ــ عزیز سباهي ، المصدر السابق، ص٢٩٥.

[٢٩٦] ــ فیصل الفؤادي، المصدر السابق، ص١٩٨.

جاســـم ئەلحەلوائی دەڵێ، بۆیە ناو لە کۆنگرە نرا "کۆنگرەی دیموکراتی و نوێبوونەوە"، وەک عەزیز سباهییش باسـی دەکا، چونکە کەشـــەکەی کەشـــی بە ئاشـــکرا دووان و ئازادیی ڕەخنەگرتن بوو کە بۆ ئەندامانی کۆنگرە ڕەخسـابوو، لەکاتێکدا هۆی راســـتەقینە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی حیزب ئایدیۆلۆژیای خۆی نوێکردبووەوە، ئەوەش بە راستەڕێکردنەوەی شـوناسـی حیزب و چاوگەی فیکری و، جا حیزب لە حیزبێکی مەرکەزیی توندەوە کە زاڵییەکی پۆلایینی هەبوو، لە ڕووی کرۆک و ئامانج و بونیـاد و ڕێکخســـتن و چـالاکییەوە، بووبووە حیزبێکی دیموکراتی، ئەوەش، هێ لە نوێکردنەوەی ســـەرکردایەتییەکەی و لەوانەش کەسی یەکەمی ناو حیزب.[297]

لێرە، عەزیز محەمەد هۆیەکی دی دەکـاتە پـاســـاو و دەڵێ، نوێبوونەوە زۆر پێویســـتە و من دژی ئەوەیمە ماوەیەکی دی لەسکرتێری بمێنمەوە، ئاخر ۲۹ ساڵ سکرتێری حیزب بووم و، دژی ئەوەیمە بەدرێژایی ژیان هەر سکرتێر بی.[298]

---

[297] ـ جاسم الحلوائي ، محطات مهمة في تاريخ الحزب الشيوعي العراقي، ص۲۷۱-۲۷۲.

[298] ـ دیدارێک لەگەڵ عەزیز محەمەد ۲۰۱۵/۱۲/۲۲. هەولێر.

# سەربردەی من لەگەڵ پۆل بریمەر؛

دوای ئەوەی ئەمریکا لە ٩ی نیســـانی ٢٠٠٣ عێراقی داگیرکرد، قۆناغێکی نوێ دەستپێکرد. قۆناغی کۆتاییهاتنی ڕژێمی حیزبی بەعســـی لە ســـاڵی ١٩٦٨ڕا گەیشـــتبووە دەســـەڵات و، ئەو ســـاڵانەش پڕبوون لە ڕووداو و گۆڕانکاری، چ لە بارودۆخی ناوخۆ و چ لە سەرئاستی دەرەوەی ناوچەیی و جیهانیی لەبەر کاری بێ ســـەروبەری ڕژێمی دەســـەڵاتدار نەتەوەی عەرەبی بردە ســـەر دیاریکردنی ڕێچکەیەکی دیاریکراوی مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو گۆڕانکارییانەی لەو ماوەیەدا دروســـتببوون و، هەر ئەو ڕژێمەش لۆلەپی ئەو گۆڕانکارییانە بوو.

ســـەرەتا، حیزبی شیوعیی عێراقی لەگەڵ داگیرکردنی ئەمریکیدا نەبوو و، بگرە ئەمریکییەکـانی لە بەڕێوەبەریی مەدەنیی ئەمریکیدا خۆیان بەرجەستە دەکرد و، لە سەری سەرەوەشیان پۆل بریمەری فەرمـانڕەوای مەدەنی، بیریـان لەوەی نەکردەوە کەناڵێکی پەیوەندی لە ڕێی نەســـیر چادرچییەوە لەگەڵ حیزبی شـــیوعی بکەنەوە، بەو ســـیفەتەی ئەندامی ئەو لیژنە حەوت کەســـییە بووە کە نوێنەرایەتیی هێزە ســـیاســـییە عێراقییەکانی نەیاری ڕژێمی بەعســـیان کردووە و، ئەو داوای دامەزراندنی ئەو کەنـاڵی پەیوەنـدییەی لە پۆل بریمەر کردووە. نەســـیر چـادرچی دەڵێ:"پۆل بریمەر داوای لێ کردن نـاوی هەنـدێ کەســـی پێبڵێم کە شـــایانی ئەوەی بن بۆ ئەرکی فراوانکردنی لیژنە حەوت کەسییەکە بشێن. منیش پێشنیاری ئەوەم بۆ کرد با شیوعییەکان لەنوێنەرایەتیدا ئاستێکی باڵایان هەبێ، لێنەگەڕا

قسەکەم تەواو بکەم و قسەی بڕیم و داوای لێ کردم هەرگیز باسی ئامادەبوونی ئەوانی بۆ نەکەم و، پێدەچوو لە پێشنیارەکەم بۆهێنانی شیوعییەکان بێزاربووبێ و، گوتی ئەوان ئێستا هیچ خەڵک و توانایەکیان لە عێراقدا نییە. پێمگوت دەبێ درک بەوەی بکا حیزبی شیوعی مێژوویەکی دووردرێژی لەو وڵاتەدا هەیە و بۆ ماوەیەکی دووردرێژیش چەوسێندراوەتەوە و ئەوەندەیشی قوربانی داوە کە هیچ حیزبێکی سیاسیی دی ئەوەندە قوربانییەی نەداوە و، خەڵکێکی زۆری پێشتر ئەندامی ئەو حیزبە بووینە لەبەر ئەوەی ماوەیەکی زۆر لێی دابڕاون ئێستا ئەندامی نین، بەڵام ئەگەر پرسیاریان لێ بکەی ئەوا لایەنگرییەکی ڕەهایان بۆ حیزبە کۆنەکەیان هەیە، چونکە ئێستاش کاریگەرییان لەسەر شەقام هەیە و ڕێکخستنی چالاکیان لەناو کۆمەڵگەی عێراقیدا هەیە. بە سەرسامییەوە گوێی بۆ ڕادێرابووم، ئەوجا نموونەیەکم سەبارەت بە حیزبمان بۆ هێنایەوە کە داوامان لە هەندێ برادەری شیوعیی کۆن کردبوو تا بێنە ڕیزەکانمان، بەڵام دانیان بەوەیدا نا کە ئەوان تەنیا لایەنگری حیزبی شیوعین و، ئەوانەش بە بژاردەی کۆمەڵگە و لێوەشاوەکانی دادەندرێن. ساتۆکەیەک هەستی لەوەی ڕاگرت کە لەمنی گوێ لێبوو و گوتی، هەلێکی بیرکردنەوەم بدەرێ تا بیر لە بابەتەکە بکەمەوە. دوای چەند ڕۆژێک لە نووسینگەکەم لە باڵاخانەی چاردچی سەردانی کردم و گوتی پێموایە پێشنیارەکەی تایبەتی حیزبی شیوعیت مایەی

پشـــتگیری و قەناعەتە.[299]لە ســـەردانی ســـێیەمیی ڕازیبوونی بەشداریی حیزبی شیوعیی لەگەڵدابوو ، پاشتریش زانیم چەندین پێشـــنیاری دیکە لە لایەنی دیکە بۆ ئەوەی پێشـــکەشـــکراون تا حیزبی شیوعی لە لیژنەی حەوتیدا بەشداربێ"[300]

پێدەچوو ئەو شـێلگیرییانەی بەشـدارکردنی حیزبی شـیوعی لە ئەنجوومەنی حوکمدا لەو باوەڕەیانەوە هاتبێ کە هەموو بنکە جەماوەرییەکەی لەدەســـــتداوە و، هەر لەپای ئەوەش، کە پۆل بریمەر سەردانی هەولێری کرد لەوێ چاوی بە عەزیز محەمەد کەوت تا لەبارەی بارودۆخە نوێیەکە گوێی لە ڕای ئەوبێ و، عەزیز باسی ئەوەی دەکا لەگەڵ پۆل بریمەری باسی مێژووی حیزبی شـیوعی و سـەرکردایەتیی حیزبی شـیوعیی کردووە و، باسـی ئەوەیشـی کردووە بۆچی خۆی بۆ سـکرتێریی لیژنەی مەرکەزیی حیزب هەڵنەبژاردووەتەوە و، بۆی ڕوونکردووەتەوە کە حیزب پێویستی بە نوێکردنەوەی سـەرکردایەتییە، بەتایبەت هێنانی خوێنی تازە بۆ ناو حیزب و، نموونەیشـــم لەســـەر

---

[299] _ پۆل بریمەر لە بیرەوەرییەکانیدا باسی بەشداریی حیزبی شیوعیی عێراقی دەکا' بەریتانییەکان بیرۆکەی بەشدارپێکردنی ئەندامێکی حیزبی شـیوعییان هێنا گۆڕێ کە لە پەنجایەکان یان شـەسـتەکانی تەمەندا بێ، ئەو حیزبە زۆری ڕۆشـنبیر و هونەرمەندی عێراقی بەلای خۆیدا ڕاکێشـا و ئیسـتاش لەو بازنانەدا شـوێنکەوتەی هەر هەیە و، سـەدامیش ڕێگەی دا حیـزب بە لەتردانەوە بمێنێ، چونکە پێیوابوو لە بەرەوڕووبوونەوەی ئیسـلامییان بێ خواییە ڕاگەیاندراوەکەی شـیوعییان سـوودێکی هەبێ'بۆ زیاتر: بول بريمر، عام قضـيته في العراق، ترجمة:عمر الأيوبي، دار الكتاب العربي، بيروت، ٢٠٠٦، ص١٢٦.

[300] _ مذكرات نصير الجادرجي، طفولة متناقضة، شباب متمرد، طريق المتاعب، دار المدة، بغداد، ٢٠١٧، ص٢٤٥-٣٤٦.

مانەوەی سەرکردان دایە کە تامردن لە پۆستەکەیان ماونەتەوە و، لەوانە مانەوەی لیۆنێد بریژنێڤ لە سەری سەرەوەی حیزبی شـــیوعیی ســـۆڤیەتی کە لە بارودۆخێکی تەندروســـتیی زۆر خراپدا بوو و هیچی نوێی پێشکەشی حیزبەکەی نەکرد.[٢٠١]

دوای ئەو ســـەردانە، بریمەر هەندێ بۆچوونی ســـەبارەت بە عەزیز محەمەد لا دروســـتبوو و لە بیرەوەرییەکانیدا باســـی کردووە و گرنگترین شـتیشـی ئەوەیە: "لە تەمموزی ٢٠٠٣ لە نووســـینگەی ســـاوەرز، ڕووبەڕوو لەگەڵ عەزیز محەمەدی ئەمینداری گشـتیی حیزبی شـیوعیی بەودواییانە خانەنشـینکراو دانیشـتم. ئەو کوردێکی حەفتا و نۆ سـاڵی بوو و شـوێنەواری سـاڵانی تەمەنی پێوە دیاربوو و هەسـتیشـی پێ دەکرد. دوای ئەوەی، ســـەبارەت بە ئەنجوومەنی حوکم، باســـی پلانەکانی خۆمانم بۆ کرد، پرســـیاری ئەوەم لێ کرد داخوا چ دەربارەی ڕووخانی شـــیوعیی ســـۆڤیەتی دەزانی، عەزیز لە وەڵامەکانیدا باســـی ئەوەی کرد بەبیری دێ بریژنێڤ نامەی دەگەیشـــتە دەستێ، بەڵام قەت نەیدەخوێندنەوە و هەندێ نامەیشـی دەنارد کە قەتی بەخۆی نەنووسـیبوون، ئەو تێبینییەی شـتێکی جودای لا دروســتکردم و کە پێیوایە بریژنێڤ تا ئێســتاش لە مۆســکۆ کارەکان بەڕێوە دەبا و، ئازایەتیی ئەوەم نەبوو پێیبڵێم لیۆنید بەو دواییانە حاڵی باش نەبووە و، ئیدی عەزیزمان لە لیسـتەکە لادا، خۆشـــبەختانە من و ســـۆرزیش –نوێنەری تایبەتی تۆنی بلێری ســـەرۆکوەزیرانی بەریتانیا- دیدارێکمان لەگەڵ کەســـی

[٢٠١] _ دیدارێک لەگەڵ عەزیز محەمەد ٢٠١٥/١٢/٢٢ هەولێر.

جێی عەزیز محەمەدی سەرکردایەتیی حیزب، واتە حەمید مەجید موسا، کرد کە پیاوێکی تێکسمڕاوی ناوەڕاستی چلەکانی تەمەنی بوو و، یەک لە ئەندامە هەرە کاریگەر و بە جەماوەرەکانی ئەنجوومەنی حوکم بوو"[302]
ئەو کارەش، دوای ئەوەی عەزیز محەمەد بیرەوەرییەکانی پۆل بریمەری خوێندەوە، تووڕەی کرد و گوتی ئەو لەمەبەستی قسەکانم تێنەگەیشتووە و، کە لە عێراقیش بوو هیچی بۆ کەس نەدرکاند داخوا چیی نووسیوە تا وەڵامی بدرێتەوە و، وەڵامدانەوەیشی ئێستا هیچ سوودێکی نییە"[303]

---

[302] _ بول بريمر، المصدر السابق، ص١٢٦.

[303] _ دیدارێک لەگەڵ عەزیز محەمەد ٢٠١٥/١٢/٢٢. هەولێر.

# مردنی:

دوای ئەوەی وازی لە سـکرتێریی حیزبی شـیوعی هێنا، وەک ئەندامێکی حیزب مایەوە و لە هەولێر دادەنیشت و بەشداریی هەندێ چالاکی و ئاهەنگی دەکرد کە حیزبی شیوعیی کوردستانی ناوە ناوە ڕێکیدەخستن و، پێشـوازیی لەو کەسـانەش دەکرد کە سـەریان لێدەدا، چ هاوڕێ شیوعییەکانی و چ سەرکردەی هێزە سیاسییەکان. ئیدی خەریکی خوێندنەوەی کتێب و گۆڤارەکانی بەردەسـت بوو و، هەمـوو ڕۆژەکەی پێ بەسـەردەبـرد تـا قەرەبـووی دووریـی خانەوادەکەی بکاتەوە کە بەئازارەوە باسـیان دەکا. دەڵێ لە سـاڵی ١٩٥٩ ڕا زەماوەندم لەگەڵ خاتوو کافییە کردووە و، ئەو ئێسـتا لە سـوێد دەژی و، دووکچم هەیە گەورەکەیان ناوی فێنکە و لە لەندەن دەژی و، شیرینیش لە ئەڵمانیایە و، کوڕێکم هەیە ناوی ئاراسە و لە هۆڵەنـدا دەژی و ئێمە خێزانێکی پێنج کەسـیین. بەڵام ئەو خێزانە ئێستا بەسەر پێنج دەوڵەتدا دابەش بووە، ژنەکەم لە سویدە و کچە گەورەکەم لە بەریتانیایە و ئەوەی دیکەیان لە ئەڵمانیایە و کوڕەکەم لە هۆڵەندایە و منیش لە کوردسـتانی عێراقم. عەزیز محەمەد زۆری میـداڵ و نۆتەڕێز دراوەتێ و، دوایەمینیـان میـداڵی "بـارزانیی نەمر"بوو، کە مەسـعود بارزانیی سـەرۆکی هەرێمی کوردسـتان لە ١٠ی حوزیرانی ٢٠١٥ پێیبەخشـی. عەزیز محەمەد لە دواڕۆژەکانی ژیانیدا نەخۆش کەوت و بەربووەوە و سـێبەندەی شـکا و، ئیدی چەنـد مـانگێـک لە جووڵە کەوت و لە ٣١ی ئـایـاری ٢٠١٧ کۆچی دوایی کرد و لە گۆڕستانی حیزبی شیوعیی کوردستانی لە هەولێر نێژرا.

# کۆتایی:

لێکۆڵینەوە لەسـەر کەسـایەتییە سـیاسـییەکان گەلێ کۆسـپ و تەگەرە بۆ لێکۆڵەران دروسـت دەکا، نەخاسـمە ئەگەر بتەوێ بڕیارێکی گشـتی بەسـەر ئەو کەسـایەتییە و ئەو هەڵوێسـتانەیدا بدەی کە بەرانبەر کۆی کێشە و بابەتە ناوخۆیی و دەرەکییەکان هەیەتی، لەو کەسـایەتییانەیش عەزیز محەمەدی پتر لە سـێ دەیە سکرتێری حیزبی شیوعیی عێراقی بووە و، ئەو ماوەیەیش پڕی ململانێی نـاوخۆی نـاو حیزبی شـیوعی بووە لەگەڵ هەڵوێستی حکوومیی ڕژێمە ئایدیۆلۆژیا جیاوازەکانی دەسەڵات بەرانبەر بەو حیزبە.

سەبارەت بە عەزیز محەمەد، وەک سکرتێری حیزبی شیوعیی عێراقی ، چەندین شیوعیی هاوسەردەمی، چ لایەنگر و چ نەیار، گەلێ ڕەخنەیـان بەهۆی پەیڕەوکردنی ئەو سـیاسـەتەی وروژاندووە کە بە سیاسـەتی سـازاندن ناسـراوە و لە هەندێ لایەنی کاروانی حیزبی شیوعیی عێراقیدا پەیڕەوی کردووە و ، خەڵکێکی زۆریش پێیانوابووە لە هەندێ لایەن لەگەڵ ڕێچکەی حیزبی شیوعیی عێراقی ڕێکنایەتەوە.

کارەکە هەرچۆنێک بێ و چەندە لەسـەر کەسـایەتیی عەزیز محەمەدی هاوڕا نەبن، ئەو بەو سـیاسـەتەی بە سـازاندن ناسـراوە توانیی ببێتە لایەنی لێکنزیککردنەوەی جەمسـەرەکانی حیزبی شـیوعیی عێراقی، نێوان ئاڕاسـتە ڕاسـتڕەوەکان "پارێزگاران" و چەپڕەوی "ئەوانەی ڕێچکەیەکی شۆڕشگێڕییان

هەیە"، کە دواترێ عەزیز ئەلحـاج وەک نوێنەری ئەو رەوتە دەرکەوت و لە ساڵی ١٩٦٧ لە حیزبی شیوعی جودابووەوە.
عەزیز محەمەد، وەک سـکرتێری حیزب، دوو قۆنـاغی دیت.
یەکەمیان ڕژێمی عـارفی بوو"١٩٦٣- ١٩٦٨" دواتریش ڕژێمی بەعسـی دووەم "١٩٦٨- ١٩٧٩" کە ئەوەش قـۆنـاغـی لێکنزیکبوونەوەی ئەو دوو حیزبە ئایدیۆلۆژیا دژبەرە بوو و، خۆی لەبەشـداریی فەرمیی حیزبدا دیتەوە لە حکوومەتدا و لە سـاڵی ١٩٧٢ وەک دوو وەزیری فەرمیی نوێنەرایەتیی حیزبیان دەکرد، کە ئەوەش پێشـترێ بۆ شـیوعییەکان ئاشـنا نەبوو و دواتـرێ دواخـاڵـیش بەرەی نـیشـتـمـانی و نەتەوەیـی پێشـکەوتنخوازبوو لە ١٩٧٣ و، پاشـانیش ئەو سـیاسـەتی پاشـەکشـەیەی لە ١٩٧٩ روویدا و دواتریش هەڵوەشـانەوەی بەرە.
سـەرباری سـیاسـەتی پاشـەکشـەی نێوان هەردوولا و، بەرزکردنەوەی دروشـمی "رووخـانـدنی دیکتـاتۆری" لە تەمموزی ١٩٧٩. حیزب دەسـتی بە ڕێکخسـتنی بنکەکانی دەرەوەی وڵات کرد و، دواتریش ڕێکخسـتنی دەسـتەکانی پشـتیوانی لە باکووری عێراق لەگەڵ سـەرکردایەتیی کوردیی نەیاری ڕژێم و پێکهێنانی بەرەی نیشـتمانی لەگەڵ ئەو هێز و حیزبانەی نەیاری ڕژێم بوون.
گەلێ شـیوعی ڕەخنەیـان لە عەزیز محەمەد گرت، گوایە لە کۆنگرەی چواری ١٩٨٥ کـاری بۆ بەکوردیکردنی حـیزبی شـیوعیی عێراقی کردووە و، کادیرە شـیوعییە کۆنەکانی ئەندامی مەکتەبی سـیاسـی و لیژنەی مەرکەزیی پاکسـازی

کردووە و، خەڵکێکیش بەوەیان تاوانبار دەکرد گوایە هەرکەسێکی ئاراستەیەکی نەیاری سیاسەتی عەزیز محەمەدی گرتبێ، لایداوە.

# سەرچاوە و ژێدەرەکان

چاپکراوە حکوومییەکان:
--الشـرطة العامة-مديرية التحقيقات الجنائية، موسـوعة سـرية خاصـــة بالحزب الشــيوعي العراقي الســـري، 6 أجزاء، مطبعة الحكومة بغداد، 1949، ج2- 4.
-مديرية الامن العامة، الحركة الشـــيوعية في العراق 1958-1963، جزأن، بغداد، 1966، ج2.
-مـديريـة الامن العـامـة ، دور المعلومـات والخبرة الأمنيـة في متابعة الحزب الشيوعي العراقي، نيسان 1985.

بەڵگەنامەکانی حیزبی شیوعی:
--الشـرطة العامة-مديرية التحقيقات الجنائية، موسـوعة سـرية خاصـــة بالحزب الشــيوعي العراقي الســـري، 6 أجزاء، مطبعة الحكومة بغداد، 1949، ج2- 4.
-مديرية الامن العامة، الحركة الشـــيوعية في العراق 1958-1963، جزأن، بغداد، 1966، ج2.
-مـديريـة الامن العـامـة ، دور المعلومـات والخبرة الأمنيـة في متابعة الحزب الشيوعي العراقي، نيسان 1985.
نامە و توێژینەوەکان:
-ثورة نصيف جاسم الربيعي، التطورات السياسـية الداخلية في العراق في عهد الرئيس عبدالرحمن محمد عارف 1966-1968، رســالة ماجســتير غير منشــورة، معهد التاريخ العربي والتراث العلمي للدراسات العليا، 2010.

-علي ناصر علوان الوائلي، عبدالسلام عارف ودوره السياسي والعسكري حتى عام 1966، رسالة ماجستير غير منشورة، المعهد العالي للدراسات السياسية والدولية العليا، الجامعة المستنصرية، 2005.
-غادة فائق محمد علي، عامر عبدالله ودوره السياسي والفكري في العراق 1924-2000، رسالة ماجستير غير منشورة، كلية الاداب ، جامعة بغداد، 2014.

کتێبە عەرەبی و تەرجومەکراوەکان:

-ارا خاجادور، هوامش على لحظات حرجة ومنعطفات حادة، دار الشهد ، دمشق، 2009.
-بهاء الدين نوري ، مذكرات، مطبعة جامعة صلاح الدين، السليمانية، 1995
-حنا بطاطو، العراق، 3 اجزاء، منشورات دار القبس، الكويت
-الحزب الشيوعي العراقي ، فلتتوقف الحرب المدمرة بين العراق وايران، 24 ايلول 1980، نقلاً:"مجلة الثقافة الجديدة"السنة 27، ايلول 1980، العدد 9، ص3-5.
-اوريل دان، ترجمة:جرجيس فتح الله، العراق في عهد قاسم 1958-1963، دار نبز للطباعة والنشر، السويد، 1989
باقر ابراهيم، مذكرات باقر ابراهيم، دار الطليعة، بيروت، 2002.
-بول بريمر، عام قضيته في العراق، ترجمة:عمر الأيوبي، دار الكتاب العربي، بيروت، 2006.
-توفيق التميمي ، شهادات عراقية(حوارات في ذاكرة عراقية)، دار الحصاد، دمشق، 2011.

-ثابت حبيب العاني، صفحات من السيرة الذاتية 1922-1998، دار الرواد المزدهرة، بغداد، 2014.
-جاسم المطير، مواقف بين عبدالكريم قاسم والحزب الشيوعي، امل الجديدة، دمشق.
-جاسم الحلوائي، الحقيقة كما عشتها، دار الرواد المزدهرة، بغداد، 2006
-جاسم الحلوائي ، محطات مهمة في تاريخ الحزب الشيوعي العراقي، دار الرواد المزدهرة، بغداد، 2009.
-جعفر عباس حميدي، التطورات السياسية في العراق 1941-1953، مطبعة النعمان، النجف، 1976.
-مذكرات الرئيس جلال طالباني(رحلة ستون عاماً من جبال كردستان إلى قصر السلام)، اعداد:صلاح رشيد، ترجمة:شيرزاد شيخاني، الدار العربية للعلوم ناشرون، بيروت، 2018.
-جليلي جليل واخرون، الحركة الكردية في العصر الحديث، ئاراس، اربيل، 2013.
-حازم صاغية، بعث العراق (سلطة صدام قياماً وحطاماً، دار الساقي، بيروت، 2003.
-حكمت خليل محمد(ابو ناظم)، دور الحزب الشيوعي العراقي والشيوعيين في الحركة الوطنية 1951-1958، دار العباد، بغداد، 2007.
-حميد حمد السعدون، عناقيد النار(جدلية التأويل في السياسة العراقية)، مكتبة عدنان، 2011.
-خليل ابراهيم حسين الزوبعي، العراق في الوثائق البريطانية 1958-1959، 6 اجزاء، بيت الحكمة، بغداد، 2002، ج4.

-ذكرى عادل عبدالقادر ، رابطة المرأة العراقية ودورها في الحركة النسوية في العراق 1952-1975(دراسة تاريخية)، دار الرواد المزدهرة، بغداد، 2015، ص302-303.
-زكي خيري وسعاد خيري، دراسات في تاريخ الحزب الشيوعي العراقي، اصدار اليوبيل الذهبي، 1984.
-سالم الاطرقجي، من مشوار الصمت مذكرات واحداث 1958-1990(العراق-تركيا-ايران)، بساتين المعرفة، بغداد، 2013.
-سمير عبدالكريم، اضواء على الحركة الشيوعية، 5 اجزاء، دار المرصاد، بيروت، ج2.
سيف عدنان ارحيم القيسي، الحزب الشيوعي العراقي، من اعدام فهد حتى ثورة 14 تموز 1958، دار الحصاد، دمشق، 2012.
-سيف عدنان ارحيم القيسي، الحزب الشيوعي العراقي في عهد البكر 1968-1979، دار الحكمة، لندن، 2014.
-شكيب عقراوي، سنوات المحنة في كردستان (اهم الحوادث السياسية والعسكرية في كردستان العراق 1958-1980)، مطبعة مناره، اربيل، 2007.
-شوكت خزندار، سفر ومحطات "الحزب الشيوعي العراقي ، رؤية من الداخل، دار الكنوز الأدبية، بيروت، 2005.
-صدام حسين، خندق ام خندقان، دار الثورة ، بغداد، 1977.
-صلاح الخرسان، صفحات من تاريخ الحركة الشيوعية في العراق، دار الفرات، بيروت، 1993.
-طارق مجيد تقي العقيلي، فصول من تاريخ العراق المعاصر، مؤسسة ثائر العصامي، بغداد، 2014.

--عبدالجبار حسن الجبوري، الاحزاب والجمعيات السياسية في القطر العراقي 1908-1958، دار الحرية، بغداد، 1977.

-عبدالرزاق الحسني ، تاريخ الوزارات العراقية ، الجزء التاسع ، الطبعة الخامسة ، دار الحياة ، بلا.

- عبدالرزاق الحسني، حميدي، الجبهة الوطنية في العراق (جذورها التاريخية وتطورها)، بغداد، 1978

-عبدالجبار حسن الجبوري، الاحزاب والجمعيات السياسية في القطر العراقي 1908-1958، دار الحرية، بغداد، 1977.

-عبدالفتاح علي البوتاني ، العراق دراسة في التطورات السياسية الداخلية 14 تموز 1958-8 شباط 1963، دار الزمان، دمشق، 2008.

-عبدالكريم فرحان، حصاد ثورة(مذكرات تجربة السلطة في العراق 1958-1968)، دار البراق، دمشق، 1996، ط2.

-عثمان علي، الكورد في الوثائق البريطانية، مؤسسة موكرياني للبحوث والنشر، اربيل، 2008.

عزيز سباهي، عقود من تاريخ الحزب الشيوعي العراقي، 3 اجزاء، منشورات الثقافة الجديدة، دمشق، 2002، ج1.

-علي كريم سعيد، عراق 8 شباط من حوار المفاهيم الى حوار الدم مراجعات في ذاكرة طالب شبيب، دار الكنوز الادبية، بيروت، 1999.

-علي ناصر علوان الوائلي، عبدالسلام عارف ودوره السياسي والعسكري حتى عام 1966، رسالة ماجستير غير منشورة، المعهد العالي للدراسات السياسية والدولية العليا، الجامعة المستنصرية، 2005.

-علياء محمد حسين الزبيدي، العهد العارفي في العراق 1963-1968، دار ومكتبة عدنان، 2013.
-غائب طعمة فرمان، الحكم الأسود في العراق، دار الفكرن، بيروت، 1957.
-غسان شربل، حوار مع عزيز محمد، مجلة الوسط، لندن، 1997.
-فيصل الفؤادي، الحزب الشيوعي العراقي والكفاح المسلح(منذ تأسيس الحزب 1934 حتى المؤتمر الخاكس 1993)، دار الرواد، بغداد، 2010.
-قادر رشيد، بشتاشان بين الالام والصمت، ط2 ، 2008.
-ماجد شبر، خطب الزعيم عبدالكريم قاسم 1958-1959، دار الوراق ، لندن، 2007.239 .
-مالك سيف، تجربتي في الحزب الشيوعي، دار الوقائع، بيروت، 1974.
-مجيد خدوري، العراق الجمهوري 1958-1968(العهدين القاسمي والعارفي)، منشورات الشريف الرضي، 1990.
-مسعود البارزاني، البارزاني والحركة التحررية الكردية ، 3أجزاء ,مطبعة وزارة التربيةواربيل، 2002، ج3.
-مكرم الطالباني، الحياة لا تجري دوما حفيفة ناعمة، مذكرات مخطوطة غير منشورة بحوزة الباحث.
- مراحل تطور الحركة القومية الكردية، جزأن، مؤسسة حمدي للطباعة والنشر، السليمانية، 2009، ج1.
-موفق خلف جاسم، نزيهة الدليمي ودورها في الحركة الوطنية والسياسية العراقية، دار الرواد المزدهرة، بغداد، 2014.

-يفغني بريماكوف، الشـرق الاوسـط(المعلوم والمخفي)، ترجمة عبدالسلام شبهاز، دار اسكندرون، دمشق.
-يوسف حنا يوسف(ابو حكمت)، مذكرات، مطبعة الثقافة، اربيل، 2011.

سەرچاوە بیانییەکان:

Benjamin Shwadran, The Power Struggle in Iraq, Council for Middle Eastern Affairs Press, New York, 1960.

گۆڤار و ڕۆژنامەکان:

-اتحاد الشعب (لسان حال الحزب الشيوعي العراقي)
-الثقافة الجديدة(مجلة شهرية)
-الجماهير(جريدة)
-طريق الشعب السرية(لسان حال الحزب الشيوعي العراقي).

دیدارە تایبەتەکان:

-مقابلات متعددة مع عزيز محمد(اربيل)
-مقابلة مع محمود عثمان، 2012/3/29(اربيل)
-مقابلة مع مكرم الطالباني(، 2012/6/11(السليمانية).

# ئەوەی لەسەر عەزیز محەمەد نووسراوە،

## فەخری کەریم

تەنێ مەرگ مانای وەهم ئاشـکرا دەکا و، خۆ پێوە هەڵواسـینە شـەیداییەکانی گەڕان بەدوای "گیای" نەمریدا دەڕووخێنێ، کە کەڵگامێش ئێمەی خستە داوی ئەوەی گوایە هەیە، یانیش، پێش ئەوەی بەخۆیشـی بکەوێتە نـاو بیری نـائومێدییەکەی و بێ ئەوەی مانای ئەو ژیانە بزانێ، کە بۆی بەدوای نەمرییەکی بێ هوودەدا دەگەڕا، بمرێ ، وەهای بردە مێشـکمانەوە گوایە ئەو لە ئـامـانجەکەی نزیـک بووەتەوە. لەگەڵ ئەوەشـدا مرۆڤ لەوەدەمیرا لە بـازنەی ونگەکەی کەڵگـامێشـدا دەخولێنەوە و، هونەر لە ئەفرانـدنی نەمـامی گیـای نەمریـدا دەنوێنن و، بە مردنێش نەبێ وەهمی ئەو بەڵایەیان لێ ناتەکێ، چونکە پێیانوایە نەمری ئەو ڕاستییە ڕەهایەیە کە زانینی ئەستەمە.!

من قوربانیی ئەو وەهمە بووم، ئاخر گرەوم لەسـەر ئەوەی کردبوو عەزیز محەمەد دەکرێ ڕۆژێکی دیکەش چاوەڕێ بکا، تا دەسـتم بۆ دیدارە دواخراوەکەی بەتاڵ دەبێ: تەنیا ڕۆژێکی دیکە و، چیدی نا.

بەڵام، عەزیز محەمەد ئەو وەهمەی ڕەواندمەوە و، لە ساتێکدا کۆچی کرد کە هێشتا لۆچەکانی مردن لەسەر ئەنیەی دەرنەکەوتبوون و شوێنەوارێکیان لەسەر ڕوخساری بەجێنەهێشتبوو پێشبینیی کۆچێکی ناوادە بکا ، کۆچێکی هێشتا بەخۆیشی خۆی بۆ ئامادە نەکردبوو. ئیدی مردن ئاوایە، لەقبوونی بوون و نەبوونە، شاراوەیەکی ڕەهایە و ئالنگاریی ئەقڵی مرۆیی دەکا، بەکوێیدا بوێ و بەکوێیدا حەزبکا و چۆنی بوێ، ئاوا جلیتانێی تێدا دەکا!.....

عەزیز محەمەد درۆی لەگەڵ خۆی نەکرد. ئەو دەیزانی خۆی چییە و، هەرچەند جاری بیدیتبا ئەو خۆ دەربرینە نموونەیەک یان ڕێوانێک بۆ بەرەوڕووبوونەوەی ساتمەکردنێک یان دوو پاتکردنەوەی بەهایەکی دروست دەکا ، کە دەیەوێ لە داڕشتنی نموونەیەکی خەیاڵکردەیی ژیانێکی بەسەر داهاتوودا دەڕوانێ زاڵی بکا، ئیدی خۆی یەکالا دەکردەوە. ئەو بەردەوام دووپاتی دەکردەوە کە قەرزاری بنەچە چینایەتییە نەدارەکەیەتی. ئەو هەمیشە گرانیی بارێکی قورسی مرۆیی بەسەرشانەوەیە کە دایکی ڕەنجەکەی بۆ ئەوە داوە تا باشی پەروەردە بکا. دایکی هەرگیز لە هیچ کارێکی ئابروومەندانە نەدەپرینگایەوە، هەرچەندی قورسیش بوایە، تا ئەو لەژێر ئەو سەوەشیرەی بێتەدەرێ و هەرچی زووە و پێش وادە ببێتە پیاو، بێ ئەوەی لە ناوە پەتییەکەی بترازێ هیچی دی لەبارەی منداڵییەوە بزانێ، دوایەش نوقمی سەفای جورئەتێکی لە تەمەنی خۆی گەورەتر ببێ. بەڵام، لە ئاستی ئەو وشیارییە پێش وەختەی بێ، کە لە ماندوێتیی دایکی و ژینگە هەژارە نەدارەکەی

وەریگرتبوو، کە بە تەواوی مانا، پڕی دیاردەی چەوساندنەوە و زوڵم و زۆر و هەموو شتێکی ئازار بەخش بوو و ، هەموو شتێکی وزە وروژێنەری ناڕەزایی و توانای بەرەوڕووبوونەوەی ستەم و دامەزراویی گۆڕینێی تێدابوو.
عەزیز محەمەد بووە کوڕی دایکی، بووە قەبارەیەک لە هەڵباوسکان[٣٠٤] بە هەر ڕێیەکی ئەوزارێ[٣٠٥] بێ و مافی ژیانێکی مرۆیی بداتەوە ئەو خەڵکەی لەناو ژینگەی ئەوان پەروەردە بوو، ژیانێکی پڕ داد و دادپەروەری و ویژدان، ژیانێکی هێشتا ڕەهەندەکانی بۆ ڕوون نەببووەوە، چونکە ئەو ئاوێتەیەک بوو لە فیکر و هیواخوازییەکی بەخەیاڵی هەموو ئەو مرۆڤانەدا دێ لەلای بنەوەی کۆمەڵ یان لە پەراوێزدان و، بەرەوڕووی زوڵم و ستەمیش دەبنەوە. بەڵام، کە شارەزای ڕەهەندی لەوەی ڕوونتر بوو کە ئەو ستەمە تەنیا دیاردەی ستەمێکی تاکەکەسی و خۆ دەرخستنێکی ستەمێکی نادیار بێ، ئیدی خێرا وشیاریی زیادی کرد جا کە چووە ناو دنیای کارکردن و شارەزای لایەنی دیکەی گشتگیرتری زوڵمی کۆمەڵایەتی و ستەمی سیاسی بوو، بۆی دەرکەوت ئەو دیاردانە لەبەرهەمی سیستەمێکی کۆمەڵایەتیی ئابووری بترازێ شتێکی دیکە نییە کە بە حوکمی سروشتە چینایەتییەکەی هەر دیاردەیەک لەو دیاردانە بۆ ستەم و جیاکردنەوە تەرخان دەکا، ئیدی کە هێشتا پۆلەکانی سەرەتایی نەبڕیوە، زۆریان بیر لێ دەکاتەوە و لەوانەی نزیکەخۆی دەپرسێ و چەندی بۆیشی بلوێ

---

[٣٠٤] _ هەڵباوسکان: خۆهەڵواسینی بەزۆر بەشتێکی بەرەوسەروەت ببا.

[٣٠٥] _ ئەوزار: کەرەستە و ئامراز.

دەخوێنێتەوە، بێ دوو دڵییش لای ئەوانەی لە خۆی گەورەترن بەدوای وەڵامی ئەو کێشـــانەدا دەگەڕێ کە لە کردنەوەی گرێ کوێرەی ئەو فیکر و چەمکانەدا دێتە پێشـــی و هەندێ جاران لە خودی دیاردەکە ئاڵۆزتر دەردەکەون. لەکۆتـاییدا گەیشـــتە تێگەیشـــتنێکی تـایبەتی هۆی ســـتەمی هەموو شـــتەکانی دەوروبەری و ژینگەکەی. بەســـادەیی هەرزەکارێکی قووڵترین ماریفەتی بە مەدلوولاتەکانی ئەو ژیانەی تێیدایە وەرگرت و ، واتە لە خودی ژیـان و بێ هـیچ ئـاڵۆزییەکی چەمـک و تیۆریزەکردنان، ئیدی بووە شـــیوعی و چووە ناو ڕیزەکانی شـیوعی بوون، هەر لە یەکەم ســات و بێ هۆدانەوەش، لەگەڵ قەوارەی حیزب بووە یەک پـارچە. بووە مـاڵ بەکۆڵی مـاڵە نهێنییەکانی حیزب، لە چاپخـانەی حیزب و لە وێســـتگەکانی بەریدی حیزب و لە پەناگەکانی کادیرەکانی ســـەرکردایەتیی. لەوێ فێرە دەســـتپاکی و پابەندی و لایەنگریی ڕەها بوو. لەو قۆنـاغە مێژووییەی بەوپەڕی قوربـانیدان و لەخۆبووردەیی لە ئاوی پاقژگە هەڵکێشـــرابوو، ئەوانە سـیمای مرۆڤی شـیوعی بوون و ، ئەو قۆناغەی دوو گیان بوو بە هیوا و ئالنگاری و خۆزگەی سەراوبن کردنی پێوەرەکان و دووبارە ئەفراندنەوەی بەهایەکان و بەرکەماڵیی بنەمایەکانی دادپەروەریی کۆمەڵایەتی و ئازادیی ویژدان و باوەڕ و وەلانانی هەموو ئەو شـــتانەی لەگەڵ دنیـایەکی بێ چەوســـاندنەوە و زوڵم و جیـاکـاری ڕێکنایەنەوە. ئەو قۆناغە، قۆناغی دزەکردنی هۆشـیاری بوو بۆ ناو هەموو کون و کەلەبەرێکی کۆمەڵگە و ژیانی ســـیاســـی. واگـابوون لە هەموو شـــتێکی هـێزەکـانی گۆڕانکـاری

راســـــتدەکــاتەوە و، بنەمــاکــانی ڕەتکردنەوەی زولـم و چەوساندنەوە و ستەم لە ویژدانی گشتیدا ڕەگاژۆ دەکا.
عەزیز محەمەد، بێ ئەوەی لەو شـــتانە بترازێ کە پابەندی و ئەرکی حیزبیی بوون، ئاوڕ لە هیچ شـــتێکی دی بداتەوە، هەر لەو ســـــاتەی چووە ڕیزی حیزب، نوقمی ناو چالاکیی حیزبی بوو و، ئەوەش لە کۆتایی چلەکانی ســـەدەی رابردوو گەیاندییە بەندیخانەی پاشـایەتی و دە سالّی لەوێ بەڕێکرد و شـۆڕشـی ١٤ی تەمموزی ١٩٥٨ لە شـــوورایەکــانی بەنــدیخــانەی دەربازکرد.
بەندیخانە، حالّی ئەویش وەک حالّی ئەو هاو نەوانەی خەبات و ئـالنگـاری بردبوونییە بەنـدیخـانە و گرتووخـانـان، ئەگەرچی بژاردەی خۆی نەبوو، بەڵام بووە قوتـابخـانەی فێربوون و پێکهـاتنی مـاریفەتی و ســـیـاســـی. عەزیز لەوێ بەردەوام دەیخوێنـدەوە، ئەو بووە دیلی شـــــەیـدایی فێربوونی زمـانی عارەبی و تێگەیشـــتنی دەلالەتە زمانییەکانی. ئەو تەنێ کتێبە سـیاسـییەکانی نەدەخوێندەوە، بەڵکو رۆمان و شـیعر و کتێبی ســـەربردە لەبەرایی هەڵبژاردنەکانی بوون و، لەوێ بە هەردوو زمانی عارەبی و کوردی لێی هەڵدەهێنجان. تا دواساتەکانیشی هەر وابوو، ئەستەم بوو ڕۆژی تێپەڕێ و کتێب هاودەمی نەبێ، ئاخر ئەو، ســـــەعاتێک پێش کۆچکردنی بە حەیدەری هاوڕێی گوتبوو، کە بەردەوام لەلای بووە، خۆزگە دەخوازێ بتوانێ بجوولێ و بچێتە سەرکورسییەکە و بخوێنێتەوە!.
کە دوای شۆڕشی تەمموزێ لە بەندیخانە دەرچوو، چووە ناو کاری ســەرکردایەتیی حیزب و، جێ بە جێ دەچووە بەر ئەرک

و پێگە سەرکردایەتییەکان و، لە بنیاتنانەوەی ڕێکخستنەکانی حیزبدا بەشدار بوو، کە دوای کودەتا خوێناوییەکەی٨ی شوباتی ١٩٦٣ لە لایەن دەستەی ستەمکاری بەعس و حەرەس قەومییە خوێنڕێژەکەی تووشی داپسان و کوشتن و راوەدوونان ببوون. لە گەرمەی کەشی ململانێ و نەبوونی ڕوئیا و لێکهەڵوەشانی ڕێکخستنە حیزبییەکان، بێ ئەوەی دەنگ بۆ خۆی بدا و، دوای چەندین ساڵیش هەر جارێکی پێویستبا دەیگوتەوە کە ئەو هەرە لێوەشاوەی ناو هاوڕێکانی نەبووە، بۆ سکرتێریی لیژنەی مەرکەزیی حیزب هەڵبژێردرا. ئەوەی لە سەرکردایەتیدا کاری لەگەڵ کردبێ، دەزانێ ئەو ، لە لیژنەی مەرکەزی و لە مەکتەبی سیاسییش، گرنگییەکی ناوازەی بە توانا و لێهاتووییەکان دەدا و بۆ ڕوونکردنەوەی هەڵویستەکان و سیاسەتەکان و بەڕێوەبردنی کاری سەرکردایەتی بۆ لای خۆی دەبردن. قەتیش لەوەی بێزار و دوودڵ نەدەبوو خەڵکێک لەناو ئەوانەدا هەبێ و جیاوازییەکی فیکری و سیاسیی لەگەڵ ئەودا هەبێ، یان لەگەڵ ئاڕاستە باوەکەی حیزب و سەرکردایەتی یەکتربڕ بێ.
نەرمییەکەی، لە چارەسەری ناکۆکییەکانی ناو سەرکردایەتی و ئەو ئاڕاستانەی کێشمەکێشیان لەناو حیزبدا هەبوو، کە مایەی ڕەزامەندی و قبووڵکردن نەبوو، بەتایبەت ئەگەر جیاوازییەکە ڕێچکەیەکی پێچەوانەی ڕای گشتیی حیزبی بگرتایە و، هەر لەناو سەرکردایەتییەکەی نەبووایە. ڕەنگە زۆربەی شیووعییەکان نەزانن ئەو نەرمی و لێبووردەییە و هەندێ کات چاوپۆشی لە لادەر و جیاوازەکانیش دابڕاوی ئەو تاقیکردنەوە

تاڵە نەبوو کە ئەو و دەستەیەک لە سەرکردەکان لە بەندیخانە دیتبوویان، کاتێ تێڕوانینی خۆیان دەربارەی سیاسەتی باو بۆ سەرکردایەتی نووسیبوو و بە ئاشکرایش دەریان نەبڕیبوو و ڕایاننەگەیاندبوو، کەچی بەرپرسی یەکەم بە کۆمەڵ و بێ گفتوگۆ و داوای ڕوونکردنەوە ڕاست و چەپێکی بەسەرداهێنان و، لە بەندیخانەش بەرەو "تەریکی"ی بردن!

ئەوەی سەیرە ئەوەیە، هەموو ئەوانەی دەرکران، لە حیزبدا بوونە سەرکردە و ، هەندێکیان شەهیدبوون و، ئەوەی بڕیاری دەرکردن و ئازاردانی ئەوانی دا چووە دەرەوەی حیزب و، هەندێ لە یارانیشی کەوتنە پێگەی هەڵگەڕاوەیی خیانەتیش....

عەزیز محەمەد، تەنانەت لە ناو جێگای نەخۆشی و بگرە لە دەمی ئاویلکەدانیش، بەردەوام دیلی ئەندێشەی زوڵمی بێ بیروباوەڕی بوو. ئاخر ئەو قەتی قسە لەگەڵکردنی ئەوانە ڕەت نەکردەوە کە هیچ کەرەستەیەکیان نەهێشت تا حیزب و خودی خۆیشی بشکێنن و، هەندێکیان خۆیان لەوەش نەپاراست خۆیان بخەنە بەردەستی باڵیۆزخانەکانی عێراق و ، هەندێکی دیکەیان خەریکبوون بوختانیان دەدایە پاڵی.

عەزیز محەمەد، بە سروشتە خۆپارێزەکەی، لە ژینگەی ئەو تێشکان و پاشەکشە و ململانێیەدا دروست بوو کە حیزبی داگرتبوو و، لە کەشێکی کە زۆرجاران پێوەری ناباوەڕی باڵی بەسەردا کێشابوو و ، لایەنگیرییەکی ورووژاوی خود و ململانێیەکی لە ساتە وەرچەرخانییەکانیدا لەو جێیەی نەدەوەستا کە سوودی هەبێ یان زیانێکی گەورە بە بوونی حیزب نەگەیەنێ و سەلامەتیی حیزب بپارێزێ و، بگرە زیانی

بۆ بەرژەوەندییە باڵاکانی نیشتمانیش هەبوو و، ئەو بارودۆخەش ڕووناکی دەخاتە سەر ئەو قۆناغە جیاوازانەی ئەو لەسەرەوەی کارە سەرکردایەتییەکان بوو.
بەڵام، عەزیز محەمەد، سەرباری ئەوەی لێی دەڵێن و ئەو هەڵە و لاسەنگییانەی دەدرێنە پاڵی، قەت "تاکڕەو" یان خۆسەپێن نەبووە، تەنیا بەو ڕادەیە نەبێ کە بێدەنگیی ئەوانەی کاریان لەگەڵ دەکرد، یان خۆ گرتنیان لە هەڵوێستی روونی وەرچەرخان و ئەو ململانێیانەی لە دەست دەرچووبوون، ڕێگەی پێ دەدا. ئەو بە سروشتی خۆی پاڵی بەو کەسانە دەدا کە شارەزایی و خاوەن بیروڕایی و لێوەشاوەیی تێدا بەدی دەکردن تا ئاراستە و هەڵوێستەکان تەواو پێگەیشتووبن. ئەو خووەیشی، کە هەندێ کەس بە ڕێچکەیەکی نەرێنی و لاوازییان دادەنا، لەکۆبوونەوەکانی لیژنەی مەرکەزی روون دەبوونەوە، کاتێ لە ڕوونکردنەوەی کورتەی ئەو شتانەی تێیدا تاوتوێکرابوون دوودڵ دەبوو و، ئەو کارەی بۆ بۆچوونەکانی خرابوونە روو و بۆ ئەو هەڵوێست و بیرورا و ئاراستانە بەجێدەهێشت کە زۆرینە دەنگیان بۆ دابوو.
عەزیز محەمەد، تا دواساتی ژیانیشی هەر کەمەندکێشی ئەو شتەی بوو کە بە کێشەی ژیانی خۆی دادەنا، تەوەری کێشەی ئەو و ئەوزاری دەستەبەرکردنی ئەو شتەی لە ژیاندا چاوی لە دەستەبەرکردنی بوو ، بەردەوام حیزب بوو.کە دەستی لە بەرپرسیاریی سەرکردایەتییش بەردا، راکردن نەبوو، بەڵکو بۆ ئەوەی بوو تا خوێنێکی نوێ لە دەماری حیزب بکا کە رەنگە بتوانێ کارلێک لەگەڵ ئەو گۆڕانکارییانە بکا خەریکە بەسەر

دنیـادا هەڵـدەکـا و، ئەو خوێنە بتوانێ حیزب نوێکـاتەوە و کەرەســـتە و ئامراز و شــێواز و بنیادەکەی وەها بەرزکاتەوە هەماهەنگییەک لەگەڵ ئەو شـــتە دروســـتکا کە دەیکاتە هێزێکی بزوێنەری ئـافرێنەری بنیـاتنـانی عێراقێکی دیموکراتیی ئەوتۆی دیموکراتیی تێـدا بەرکەمـالبێ و، دادپەروەریی کۆمەڵایەتی و ئاشتیی کۆمەڵایەتی باڵی بەسەردا بکێشێ.

عەزیز محەمەد، پێش ئەوەی دوا خولی گفتوگۆی کێشـــە و هەڵویسـتانی لەگەڵ بگێڕم، کۆچی کرد. دەمویسـت دوا قسـەی خۆیـان تێدا بکـا، بەڵکو قســـەکـانی پێـداچوونەوەیەک بەو هەڵسەنگاندنانەی ئەو کێشە توند و هەڵوێستە لەرزۆکانەدا بکا کە لەیادەوەریمدا چەسپیون.

ئێســـتا، کە دەربارەی عەزیز محەمەد دەنووســـم، دان بەوەیدا دەنێم لەگەڵ زۆربەی هاونەوەکانمان جودابوو. ئەو برادەرێک بوو ناکۆکی و ڕای جیاوازی فیکر و هەڵسەنگاندن و هەڵویست برادەرایەتییەکەی نەدەڕووشـــاند. چەندین ســـاڵ تێپەڕین و، ســـەرباری ئەوەی وەهاش نەبووین، کەچی دەتگوت هاوڕای یەکدیین. لە ســـاڵانی دیکەدا بای درزی هەڵوێســـت بەســـەریدا هەڵکردین، بەڵام ئێمە لایەنگری برادەرایەتییەک بووین ئـاگرەکەی کز نەدەبوو و بە وەفـای ئـاوات و کێشـــەیەک پیرۆزکرابوو تەواو ڕەگـاژۆ ببوو و ڕەگی قووڵ بوو. ڕەنگە ئەوەش، بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە هەردووکمـان لەیەک خـاکـدا ڕووابووین و بە ئاواتێکی دایکێک نەبینین بە ناچارییەوە ڕەنج بـدا، بـاوکێـک نەبیدین بە هەڵگرتنەوەی ڕزق و ڕۆزیی خانەوادەکەی پشتی کۆم بووە.

بەڵام، ئەوە ئاواتێکی دواخراوە و ڕەنگە تا ماوەیەکی دیکەیش هەر دوابخرێ.

دایکانی دڵشکاو، دنیامان پڕ خەم و خەفەت دەکەن و، باوکانی پشـــتیان چەماوەتەوە و ڕوخســـاریان تەڵخ بووە، تەنیا لەنا و تەرمی ئەو قوربانییانەدا پارووی خانەوادەکەیان دەردێنن کە خۆیان داویانە و، هیی وایشـیان هەیە دوور لە چاو و دیتنان لە پـاشـــمـــاوەی هەرچی و پەرچییەکـانی ڕژێم پـاروەکە هەڵدەگرێتەوە...

هاوڕێی ئازیزم، تەنیا ئێستا بۆت دەگریەم و، لە گوناهی کۆچی بێ ماڵئاواییت دەبوورم..

ئێســـتا بۆ کەموکووری و نائومێدییەکانمان دەگریەم، چونکە بەهەشتێکمان لەسەر ئەم دنیایە بۆ هەژاران بنیات نەنا....

خۆزگە یەک ڕۆژ چاوەڕێت دەکرد و هیچی دی نا. ئەرێ ئەوە بۆ تۆ زۆربوو؟ یان ئەوە ئەو وەهمەیە تا ساتی ئەبەدییەت هەر لەگەڵمان دەبێ!

## عادل حەببە:

لە نیوەڕۆی چوارشەممەی ڕێکەوتی ٣١ی ئایاری ساڵی ٢٠١٧، هاوڕێ عەزیز محەمەدی سکرتێری پێشتری لیژنەی مەرکەزیی حیزبی شیوعیی عێراقی، لە تەمەنی نەوەد و سێ ساڵی، کۆچی دوایی کرد. کۆچکردوو لە گوندی بێرکۆتی دەوروبەری هەولێرێ و لە تەمووزی ١٩٢٤ لە خێزانێکی جووتیاری هەژار لەدایک بووە. لەبەر بارودۆخی مادیی خانەوادەکەی، کۆچکردوو هەلی تەواوکردنی خوێندنی بۆ نەڕەخسێ، واتە ئەو بارودۆخە ناخۆشەی عێراقییەکانی تێدا دەژیان.

هەر هێندەی عەزیز محەمەد پارچەڵەبوو، خۆی لە گەرمەی ئەو شەپۆلە سیاسییانەدا دیتەوە کە ئامانجیان ئەوەبوو نەتەوەی کوردی، کە ئەویش سەر بەو نەتەوەیە بوو، لەجەور و چەوسانەوەی نەتەوەیی ڕزگار بکەن و، گەلی عێراقیش لە پاشکۆیەتی و دەرەبەگ و دۆخی گوزەرانی پڕ بەدبەختییان دەرباز بکەن. ساڵانی ١٩٤١-١٩٤٩ سەرەتای چوونە ناو چالاکیی سیاسیی بوو. چووە ڕیزی حیزبی هیوا و لە ١٩٤١ بووە ئەندامی ئەو حیزبە و لەکاتی چالاکییەکانی ناو ئەو حیزبەی ئەو بیروبۆچوونە پێشکەوتنخوازانەی ناسی کە ئەو حیزبە بانگەشەی بۆ دەکردن. هێندەی نەبرد، پەیوەندیی بە ڕیزەکانی حیزبی شۆڕش کرد کە وەک کاردانەوەیەکی خراپیی بارودۆخی وڵات، بانگەشەی بۆ چەمکە مارکسییەکان دەکرد.

ئەو ڕێکخراوە ڕۆڵی لە کڵپەسەندنی ورەی هەزاران گەنجی پێگەیشتوودا هەبوو و بیروبۆچوونی ئازادیی سیاسی و دادپەروەریی کۆمەڵایەتیی بڵاودەکردەوە، بەتایبەت دوای ئەو گۆڕانکارییانەی لەگەڵ گڕی شەڕی دووەمی جیهانیدا بەسەر دنیادا هاتبوون. لە ساڵی ١٩٤٢دا بووە ئەندامی ڕێکخراوی گەلی بە نهێنی ڕۆژنامەی بڵێسەی دەردەکرد. دوای فراوانبوونی چالاکییەکانی حیزبی شیوعیی عێراقی و بەستنی یەکەم کۆنگرەی لە بەراییەکانی ساڵی ١٩٤٥، عەزیز محەمەدی کۆچکردوو ئاشنای ئامانجەکانی حیزب و بەرنامەکەی بوو، کە لەسەرئەوەی مکوڕ بوو دەبێ گەلی عێراق ببێتە خاوەنی ماف و برایەتی و یەکسانی و، جا کۆچکردوو، لە ڕێی ناسینی خەباتی نیشتمانی و کۆمەڵایەتیی حیزبی شیوعیی عێراقی و، بەرگریکردنی لە شکۆی نیشتمانی و داواکارییەکانی ئازادیی دیموکراتی بۆ گەل و دەستەبەرکردنی بەرژەوەندییەکانی کرێکاران و جووتیاران و هەموو ئەوانەی بە دەست و بیر کاریان دەکرد، ڕێی پەیوەندیکردنی بە حیزبەوە دۆزییەوە و لە زستانی ١٩٤٥-١٩٤٦ چووە ناو ڕیزەکانی. ڕاپەڕینی شکۆمەندانەی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٨هەنگاوێکی چۆنایەتیی لە ژیانی سیاسیی کۆچکردوودا دروستکرد، چ لە ئاستی چالاکیی سیاسی و چ لە ئاستی هۆشیاریی فیکری و سیاسییدا، ئەوەش وای لێکرد لە کاری حیزبیدا ببێتە پیشەگەر و بووە بەرپرسی ڕێکخراوی حیزب لە هەولێر. بەڵام، دوای ئەو هەڵمەتەی ڕژێمی پاشایەتی دژی حیزب و بۆ گرتنی سەرکردەکانی بەرپای کرد، سەرکردایەتیی حیزب بانگی

بەغـدایەی کـرد. لەگەڵ بەدوای یەکـدا هـاتنی هەڵمەت و بەسـەردادانەکانی لانە و ماڵە نهێنییەکانی حیزب، حیزب داوای لێ کرد لەگەڵ دایکی لەمـاڵێکی گەڕەکی قـاترخـانەی بەری رەسـافە نیشـتەجێ بێ کە چـاپخـانەکەی حیزب لەوێ دامەزرێنـدرابوو. بەڵام هێنـدەی نەبرد پۆلیسـی عێراق بە مـاڵەکەیـان زانی و لەگەڵ دایکی گیران و، دادگـای بەدنـاوی نەعسانی لە ١٩٤٩/٢/١٢ پازدە ساڵ بەندیی بە کاری قورسەوە، بۆ کۆچکردوو بڕییەوە.

لە بەنـدیخـانەدا، قۆنـاغێکی گرنگی نوێی ژیـانی کۆچکردوو دەسـتی پێ کرد، کە لەلایەک پڕ سـتەم و بێ بەشـی بوو و، لەلایەکیش پتربوونی وشیاری و شارەزایی و ڕۆشنبیری بوو، کاتێکی شـیوعییەکان بەندیخانەیان کردە بازنەی خوێندنی ڕۆشـنبیری و سـیاسـەت. کۆچکردوو فێری زمانی عارەبی بوو و لێی مەعلان بوو. هەلی ئاشـنابوون بە خەزێنەی ماریفەت و ئەدەبی عـارەبی و جیهـانییش بۆ کۆچکردوو ڕەخسـا. کۆچکردوو لە بەنـدیخـانەی نـاوەنـدیی بەغـداوە ڕەوانەی بەندیخانەی نوگرە سـەلمانی بەناوبانگی بیابانی باشـوور کرا و، دواترێ، دوای ئەو فشـارەی خانەوادەی بەندییەکان لەبەر دووریی ئەو بەنـدیخـانەیەی بیـابـانێ دروسـتیـان کرد، گواسـترایەوە بەندیخانەی کووت. هەر هێندەی لە سـاڵی ١٩٥٣ گواسـترایەوە بەندیخانەی کووت، ئیدی بەرەوڕووبوونەوەی نێوان بەندییان و بەڕێوەبەریی بەنـدیخـانەی بەغدا دەسـتی پێکرد، ژمـارەیەک بەنـدی شـەهید و برینـدار بوون و، ئەو بەرەوڕووبوونەوانە گەیشـتنە بەنـدیخـانەی کووتیش، چونکە

بەندییەکان ئەرزوحاڵێکیان پێشـــکەش کرد و داوایان دەکرد بـارودۆخی ژیـانیـان بـاشـــتر بکرێ. دەســـەڵاتەکـان بەدەم داواکـانیـانەوە نەهـاتن و تـا دووی ئەیلولی ١٩٥٣ ئـاو و خواردنیـان لەســـەر بەنـدییەکـان بڕی. دەســـەڵاتەکـان دەســـتپێشـــخەرییان لە بانگکردنی هەندێ بەندییان کرد تا بیـانگوازنەوە بەنـدیخـانەی دیکە و کۆچکردوویش یەک لەوانە بوو. بەڵام بەندییەکان ڕازی نەبوون ئەو داوایەی دەســـەڵات جێبەجێ بکەن، بۆیە پۆلیس هێرشـی کردە ســەر بەندییەکان و لەو بەرەوڕووبوونەوەیەی ژمارەیەک شـیوعی بوونە قوربانی و هەندێکیان کوژران و هەندێکیش بریندار بوون.

دوای ســـەرکەوتنی شـــۆڕشـــی چواردەی تەممووزی ١٩٥٨، سەرکردەکانی شۆڕش هەموو بەندییە سیاسییە شیوعییەکانیان بەردا و، عەزیز محەمەدی کۆچکردوویش لەنـاو بەردراوەکـان بوو. ئەودەمی قۆناغێکی نوێی چالاکیی سیاسیی دەستی پێکرد. لەکۆبوونەوەی فراوانی لیژنەی مەرکەزی و کادیرانی حیزب لە ئەیلولی ســـاڵی ١٩٥٨لیژنەی مەرکەزی فراوانکرا و هەنـدێ ئەندامی نوێی لە کادیرەکانی ســـەرکردەیی ناو ئەوانە بۆ زیاد کرا کە تازە بەردرابوون. کۆچکردوویش، سەرباری ئەندامێتیی لە لیژنەی لقی کوردســـتان، بۆ ئەندامێتیی لیژنەی مەرکەزی هەڵبژێردرا. لەساڵی ١٩٦٠کرایە بەرپرسی لقی حیزبی شیوعیی عێراقی لە کوردســـتان. لەو کاتی ئەو بەرپرســـیارییەی هەبوو پشێوییەکانی شاری کەرکووک هەڵگیرسان. ڕێکخراوی حیزبی شـــیوعی و حیزبی شـــیوعییش، بەنـاحەق تـاوانی ئەو پێـدرێژییـانەیـان درایەپـاڵ. کۆچکردوو کە بەچـاوی خۆی

بەرەوڕووبوونەوەکانی دیتووە و ئەودەمی لەوێ ئامادەبووە، بەو جۆرەی دەگێڕێتەوە: " لەیەکەم ساڵیادی شۆڕشی تەممووزدا، پەیوەندیمان بە هێزەکانی دیکەوە کرد تا ڕێپێوانەکان و دروشمەکان یەک بخرێن. بەڵام کورد و تورکمانەکان پێشنیارەکەیان ڕەتکردەوە. ئیدی بەرەبەیانی ١٤ی تەممووزی ١٩٥٩ خۆپیشاندان و ڕێپێوانەکان دەستیان پێکرد و، هەرسێ هێزەکە تێیدا بەشداربوون؛ واتە حیزبی شیوعی و پارتی دیموکراتی کوردستان و تورکمانەکان. ئەو جادوای چەند تەقەیەک پشێوی دروست بوو و، نەمانتوانی دۆخەکە بەیدەست بکەین و، ئەوەش شەپۆلێکی هێستیریایی دژایەتیی لەنێوان هێزە ڕکابەرەکاندا دروست کرد، بەتایبەت لەنێوان کورد و تورکمان، کە قوربانیی لێکەوتەوە و بەتایبەت لە ڕیزەکانی تورکمانان، ژمارەیەک شیوعییش کوژران و لەوانەش سەرۆکی شارەوانی و حوسێن بەرزنجیی برای، ئەگەرچی لە گۆڕەپانی بەرەوڕووبوونەوەکەش دووربوون"

دوای کودەتای ٨ی شوباتی ١٩٦٣ و پاش ئەو قەسابخانەیەی بۆ شیوعییەکان و دیموکراتەکان و نیشتمان پەروەرەکانی عێراق داندرا، کۆچکردوو و ژمارەیەکی زۆری لە دەستاری تیرۆر دەربازببوون، ڕوویان لە چیایەکانی کوردستان کرد و دەستیان بە ڕێکخستنی هێزەکانیان کرد تا بەرەوڕووی ئەو هەڕەشە مەترسیدارەی ببنەوە کە وڵاتی تێکەوتبوو. کۆچکردوو، ڕۆڵێکی دیاری لە دابینکردنی پێداویستییەکانی ئەو ڕێچکە نوێیەی حیزب گێڕا. دوای ئەو زیانە گەورەیەی لەکودەتای شوبات بەر حیزب کەوت، ئەو سەرکردایەتییەی

حیزبی مـابوون دەسـتیـان بە پێچـانەوەی بریـنـان کرد و سـەرلەنوێ بنیـاتنـانەوەی حیزب. ئیـدی بۆ هەڵبژاردنی سـەرکردایەتییەکی نوێ، کۆبوونەوەیەکی ئەو سـەرکردە و کادیرانەی حیزبی مابوون لە ساڵی ١٩٦٤ و لە دەرەوەی وڵاتدا کرا، لەوانەش عەزیز محەمەدی کۆچکردوو. بەکۆی دەنگی هەموو بەشـدارانی کۆبوونەوەکە، دەنگی خۆی لێ دەرچێ، هاوڕێ عەزیز محەمەد کرایە سکرتێری نوێی لیژنەی مەرکەزی و، هاوڕێ عەزیز تا سـاڵی ١٩٩٣ لەو پێگەیەیدا بەردەوامبوو، کە ئەوساڵی داوایەکی پێشکەش کرد تا لەو ئەرکەی ببەخشرێ. کۆچکردوو، سـەرباری بارودۆخ و فشـارەکانی دەرەوەش، لە بـارودۆخێکی زۆر ئـاڵۆزی نـاوخۆی حیزبدا سـەرکردایەتیی حیزبی کرد. حیزب لە ماوەیەکی کورتدا توانیی خۆی بگرێتەوە و سـەرباری ئەو ناکۆکییانەی ناوە ناوە ڕیزەکانی دەهەژاند و دوای ئەوەی شـیوعییە عێراقییەکـان، بەدرێژایی کـاروانە پیرۆزەکەیان، تاڵیی سـتەم و چەوسـاندنەوە و بەندیخانە و کوشـتنیان چەشـت، حیزب توانیی سـەرلەنوێ وەک هێزێکی سیاسی بێتەوە گۆڕەپانەکە.

هـاوڕێ عەزیز محەمەد، بەردەوام لە هەوڵی ئەوەیـدا بووە یەکێتی و سەلامەتیی حیزب و سەلامەتیی کادیر و ئەندامەکانی لە بەرایی ئەرکەکانیدا بن. کۆچکردوو، هەر لەسەر ئەو ڕێچکەیە مامەڵەی لەگەڵ بابەتێکی زۆر گرنگ و ئاڵۆزی وەک هاوپەیمانی لەگەڵ بەعسـدا کرد، بەرە لە ڕوانینی ئەودا ئامرازێک بوو بۆ ڕێکخسـتنەوەی حیزب دوای ئەو گورزە وێرانکەرانەی بەعس دوای هاتنەوە سـەردەسـەڵات لە ١٩٦٨ لە حیزبی دا و، وەک

چۆن ئەوزارێکیش بوو بۆ هاندانی کەســـە ئەقلانییەکانی ناو بەعس و پشتگیریکردنیان تا لە بانگەشەی بیروباوەڕدا ڕێیەکی ئەقلانی و دوور لە توندوتیژی بگرن و، دووربن لە لادان و کوشـــت و کوشـــتار. هاوڕێ عەزیز، زۆریش لەســـەر مافی شـــیوعییە عێراقییەکـان ســـووربوو تـا لە ڕێی دامەزراوە هەڵبژێرداوەکانیانەوە ئەو ســـیاســـەتە هەڵبژێرن کە لەگەڵ بەرژەوەندییە نیشـتمانییەکانی عێراق دەگونجێ. کۆچکردوو، لە دیدارێکی ڕۆژنامەوانییدا دەڵێ: "گەلێ نووســـەر و قســـەکەر هەوڵیانداوە ئاماژە بە کاریگەریی ســـۆڤیەت و ســـەپاندنی ئارەزووەکانیان بکەن بەســـەر ئێمەدا، ئەوەش کارێکە و دەکرێ لە گەلێ هەڵوێســـتدا ناڕاســـتییەکەی بخرێتە ڕوو. هەر بای ئەوەندەی ڕای سۆڤیەتییەکانمان دەخوێندەوە و هەڵویستەکانی ئەوانمان شـــیدەکردەوە کە پەیوەندیی بە ســـیاســـەتی ئێمەوە هەبووایە و، بەڵام هەرگیز لە بڕیاردانی ســـیاســـەتی خۆماندا ئـامـاژە و ڕامـان لەوان وەرنەدەگرت. دەشـــمەوێ دووپـاتی بکەمەوە هەرگیز لەژێر کاریگەریی ئەو ســـووســـەکردنانەدا نەبووینە، چونکە ئێمە خۆمان ، نەک سۆڤیەتییەکان، هەڵوێستی خۆمان لەســـایەی ئەو بارودۆخە گشـــتییەدا دیاری دەکرد کە حیزبی ئێمەی تێدا دەژیا. بەڵێ ئێمە بە تیۆری و پێشنیارەکانیان ڕێی خۆمـان ڕۆشـــن دەکردەوە، چونکە ئەوان خـاوەنی تـاقیکردنەوەیەکی دوورودرێژ بوون. ئەوان هەمیشـــەش دووپاتیان دەکردەوە دەبێ نزیکبوونەوەکانمان بەو شێوەیە بێ کە خزمەتی حیزبمان بکا. نکۆڵی لەوەش ناکەم بەرژەوەندییە هاوبەشـــەکانیان لەگەڵ دەســـەڵاتی عێراق کاریگەریی لەســـەر

ئەوەی هەبووە شـــێوازێکی لێـک تێگەیشـــتن لەگەڵ ڕژێم بدۆزینەوە."

کۆچکردووی ئـازیز، کـاتێ مـاڵئـاواییت لێ دەکەین، هەمیشـــە ئەوەمان بەبیردێتەوە چەندە خاکەڕا و ئارامگر بووی، چەندە ئامادەبووی گوێ لە ڕایە جیاوازەکان بگری و چەندیش توانای ئەوەت هەبوو ڕایە جودایەکـان لەیەکـدی نزیـک بکەیەوە، بەبیرمان دێتەوە چەندە پاک و بێ خەوش بووی چەندیشـــت ئـارەزوو دەکرد هـاریکـاریی هـاوڕێکـانـت و خەلکی دیکەیش بکەی، ئەوەشـــمـــان بەبیردێتەوە هەرکەســـێکی، لە حیزبە عێراقییەکان و بێگانەکانیش، تۆی بدیتبا چەندی ڕێز لێ دەنای. هـاوڕێی ئـازیز، ئێمە تۆمـان لەدەســـتچوو، بەلام خەنـدە و گەشـــبینی و خۆش مەعشـــەرییەکەتمان لەدەســـت نەچووە. بە ئـارامی لە دواهەوارت بخەوە، هیوای ســـەبر و ئـارامیش بۆ هاوبەشـــی ژیانت، دایکی ئاراســـی بەڕێز و ئازیزان فێنک و شیرین و ئاراس دەخوازین.

## د. موهەننەد ئەلبەڕاک

بە كۆچی دوایی هاوڕێ عەزیز محەمەد "ابو سعود"، تێكۆشەری دیاری نیشتمانی و نێونەتەوەیی، حیزبی شیوعیی عێراقی و كوردستانی و گەلی عێراق بە هەموو پێكهاتەكانییەوە، تێكۆشەرێكی جەربەزەیان لەدەستچوو، كە قوربانیی بە ژیانی پڕ بەخششی خۆی داوە و، كاری لەپێناوی هەمووواندا كردووە و بۆتە نموونەیەكی دیاری كاروان و خەباتی گەلەكەمان بە عەرەب و كورد و هەموو پێكهاتەكانییەوە... هەرچەندی توێژەران سەبارەت بە ڕۆڵ و دروستیی هەڵوێستەكانی ڕای جیاوازیان هەبێ، كەچی لێكۆڵینەوەی دروست و قووڵی كاروان و ژیانی ناخۆشی گەلەكەمان دەیسەلمێنن، لەو ماوەیەی كە سكرتێری گشتیی حیزبی شیوعی بووە و تا كۆچی دواییشی، سەرباری ئەو كەموكووڕی و هەڵانەی لە كاروانی پڕ مەینەتیی دووروودرێژی حیزب و گەلدا هەبووە، چەندە لە ڕێچكە و بیروباوەڕ و بیركردنەوەدا ڕاست و دروست بووە.

سیاسییان و شارەزایانی سیاسەت و خەڵكانی بێلایەنی ئاگاداریش، دووپاتی دەكەنەوە كە دەبێ ئەو قۆناغە وەبیرەخۆ بێنینەوە ئەبو سعودی تێكۆشەر تێیدا چالاک بووە، ئەوكاتەی نەوەكانی ئەو قۆناغە تژیبوون لە گەرموگوڕی و ورە بۆ دواڕۆژێكی باشتری شایانی وڵات، ئەو بارودۆخەی لێوڕێژی ئالنگاری و هیوای دەستەبەركردنی ئاواتان و بەرچنینەوەیان بوو، لەدنیای شەڕی ساردی نێوان ئەو دوو زەبەلاحە، دنیای

خەباتی بێ ملدان لەپێناو ماف و دادپەروەریی کۆمەڵایەتی، ئەو بارودۆخەی ئەبو سعود تا کۆتایی لە بارەیەوە دەیگوت ئەوەی دەیەوێ بزانێ چۆنە دەبێ کتێبی "دە ڕۆژی دنیایان هەژاند" و "چۆن پۆلامان ئاودا" و"پیلانەگەورەکەی سەر رووسیا" بخوێنێتەوە تا بزانێ شۆڕشی ئۆکتۆبەری سۆشیالیستی چۆنی هەژاندین و ئەوزارەکانی خەباتی چ بوون و چۆن بەسەر فاشیزمدا سەرکەوت و، چۆنیش لەو بارودۆخە ناخۆشەی وڵات و ، لە هەمووان ئەستەمتریشی ئەو بارودۆخە پڕ برینەی حیزب لەپای کودەتای شوباتی ڕەشی ساڵی ١٩٦٨، بووە نموونەی باڵامان، ئەو ساڵەی هاوڕێمان وەک سکرتێری گشتیی حیزب هەڵبژێردرا و کەچی هەر دەیگوتەوە ئەو لەناو سەرکردەکاندا لە هەمووان لەبارتر نییە و، ئەوەش بواری بۆ ئەندامانی سەرکردایەتی خستە سەر پشت تا ڕۆڵی خۆیان لەو بڕیارانەدا هەبێ کە دەردەچوون و ئیدی هەمووان، لەژێر ناوی ئەودا چونکە سکرتێری حیزب بوو، لە سەرکەوتن و شکستیاندا بەرپرسیاربوون، کە ئەوەش وای لێکرد دوای چەندین ساڵ بڵێ ئەو وەک سکرتێری حیزب دەچێتە بن باری بەرپرسیاریی هەموو هەڵە و کەموکوڕییەکانی، وەک خۆی دەڵێ "دەیانزانم و نایانزانم". ئەوانەی لەگەڵیشیدا ژیاون هەمووان لەسەر ئەو سەنگینییە تایبەتەی کۆکن کە لەناو تێکۆشەران و سەرکردە باڵاکانی ئەودەمیدا ڕوون و ئاشکرا دیاربوو، وەک ئەو بارودۆخانەی پێکەوەی کۆدەکردنەوە، وەک بەندیخانە و کاروکردەوە فراوانەکان و یانیش لە ناو هێزەکانی پشتیوانی....ئەو سەنگینییەی بە هەڵوێستی قارەمانانە و

هەڵوێستی جوانی ناو گرتووخانەکان پیرۆز کرابوو لە بەرەوڕووبوونەوەی ستەمی لە ناشیرینترین شێوەکانیدا خۆی دەنواند، ئەو کاتەی بەندی لەبەر دەستی جەللادە بێ نەزاکەتە دەستکراوەکاندایە..... ئەو سەنگینییەی دەلالەتەکانی لەو نموونانە دەردەکەون کە خۆی، سەبارەت بە هەوڵەکانی ڕاکردن لە بەندیخانەی نوگرە سەلمانی تۆقێنەر گێڕاویەتییەوە یان دەربارەی ئەوم گوێ لێبووە، ئەو ڕاکردنەی ئەوانەی بانگەشەیان بۆ دەکرد دەیانگوت "ئازادی و ڕزگاری و جێبەجێکردنی کاری باش و خەون و....." دەستەبەر دەکا و، جا سەرباری ئەو بیرۆکە و خەونانەی گەنجانێکی بە زەبری هێز لە ژیان دابڕێندرابوون و لە گرتووخانەیەکی بیابانی دوورەدەست بوون، ئەوا ئەوێکی حوکمی تاهەتا درابوو، لانیکەم داوای گفتوگۆ و ژیریی دەکرد، ئاخر لە بارودۆخێکی کەسێک نییە چاوەڕێی ڕاکردووان بکا و جێیەک نییە خۆیانی تێدا بشارنەوە و ناشزانن چۆن خۆیان بشارنەوە؟ ئەو داوایەی هەمووانی دەرباز کرد و بەتایبەت ئەو گەنجانەی چاوەڕێی چەند مانگێک بوون تا ماوەی بەندییەکەیان کۆتایی پێ بێ، لە کاتێکدا ئەوانەی لەسەر ڕاکردن سووربوون شوێنەوارێکیان لەناو لمی ئەو بیابانە بەرفراوانە چۆڵەدا نەما.

نموونەی دیکەیان، گەیاندنی هەواڵی مانگرتنی بەندییەکانی بەندیخانەی ناوەندیی بەغدا بوو و، هەندێکیان سەرپێچییان کرد تا سزابدرێن و ڕەوانەی بەندیخانەی نوگرەسەلمان بکرێن و ئەوانیش هەواڵی مانگرتنەکە بدەنە بەندییەکان تا مان بگرن و هاریکاری بەندییەکانی بەندیخانەی بەغدا بن... سەرباری

نارەزایی لیژنەی حیزبی بەندیخانەی بەغدای ئەو بەرپرسی بوو، بۆ سەر "پەیماننامەیەک بەناوی - بەها"ی سکرتێری ئەودەمی حیزب - مەبەست بەهادین نورییە. و. ک_ کە لەو ساڵانەی دوایی لە وەڵامی پرسیارێکمدا باسی کرد.

بگرە لە کۆچکردنیشیدا هەندێک هێرشیان کردە سەری، وەک ئەوەی ئەو لە حیزبدا هەموو شتێک بووبێ، نەک حیزبێکی چەندین دەستە و لیژنەی سەرکردایەتی و هێ لە هەزاران چالاکوان و ئەندام و چەندین ئەوەندەش دۆستی نزیکی هەبووە...هێرشیان کردە سەری و لەبیریان چووبوو مارکسیزم هەڵوێستێکی کەسی و خودییە بەرانبەر بە ژیان و بارودۆخی ژیان و هەزاران کەسی ناوەندە هەژارەکانی گەل و پیاوانی زانست و ئەدەب و ڕۆشنبیری و هونەر پێیەوە پەیوەستن و، چوونە ڕیزی حیزبیش بڕیارێکی تاکەکەسیی ئازادانەیە لە بارودۆخێکی تێگەیشتن لێی پشت بە چۆنیەتیی ناوەرۆکی ئەو سەرکەوتنانە دەبەستێ کە ڕەنگە حیزبێکی شیوعی لە وڵاتێکدا بەدەستی بهێنێ لە ژێر جەور و دەسەڵاتی ئاسن و ئاگر و نەخوێندەوار کردندا ژیاوە و دەژی، واتە وڵاتێکی وەک وڵاتی خۆمان.

ئەو، وەک زاهیدێکی خەسڵەت سادە و خاکەڕا ژیا، تەنیا لە هەڵوێستی بەرانبەر کێشەی گەل نەبێ، بە بیروبڕوایەکی نێونەتەوەیی ژیا و دەستپێکی بیرکردنەوەیشی واقیعە خەماوییەکەی ژیانی عێراق بوو. بنەچە خانەوادەییە نەدارەکەی کاریگەرییەکی روونی لەسەر خولق و خووی لێبووردەییە بەخشندەکەی و، گرنگیدان بە ژنە خەباتگێڕە پەروەردەکارەکەی،

واتە دایکی فێنک و کچەکانی و کوڕەکەی بەجێهێشـــتبوو.....
وەک هەر مرۆڤێک ژیا کە مگێز و دنیای تـایبەت و خەمی
هەمەجۆری خۆی هەبێ... و ئەســـتەمە وێنـایەکی تەواوی
کەســـایەتییە کامڵە هەمەلایەنەکەی و بەهرە ســـیاســـییەکانی
بخرێتە بەردەســـت. من خۆم لە بەهاری ۱۹۷۳دا ناســـیم، ئەو
ڕۆژەی هاوڕێ ئەبو سـعود خۆی لە ژووری قوتابیان لە بینای
"طریق الشــــعب" لە بالاخانەی "طحـان" ســـــەردانی کردم تا
بەدواداچوون بۆ کێشەیەکی هەستیار بکا، کە هیچ پەیوەندییەکی
بە ڕێکخســــتنەکانی قوتـابییـانەوە نەبوو و من و هـاوڕێیەکی
دیکەی سـەفەری کردبوو بەدوایدا دەچووین.... ئیدی دیدارەکان
بەردەوام بوون و پەرەیان سـەند و بوونە سـەردانی خێزانی و
گەرموگوڕی کە پتر باسـی خانەوادەی بەندییە سیاسـییەکان و
یادگارییەکانی نوگرەســـــەلمان و باقووبەی ئەوانیان تێدا دەکرا
و، لەوێ زۆر ڕاستیم سەبارەت بە هەندێ تێکۆشەری جەربەزە
زانی کە پێشتری نەمدەزانین و باسی ئەوەیان دەکرد چۆن، بە
پەیوەنـدییە بەردەوامەکـانیـان لەگەڵ گەل بە هەموو توێژ و
چینەکـانییەوە، لە ڕێی ترانزســـــتۆر و لە ڕێی ئەو نـامـانەی
دەپێچرانەوە و بە قۆچەقـانی دەهـاوێژران، بەنـدیخـانەکـانیـان
کردبووە گۆڕەپانی تێکۆشانێکی زیندووی پەیوەندیدار بە دنیای
دەرەوە، کردبوویـانە گۆڕەپـانی بەرەوڕووبوونەوە و ململانێی
راســــتەوخۆ لەگەڵ دڵڕەقترین جەلادەکانی گەل.... کردبوویانە
پەیمانگای زانست و ماریفەت.

لەوێ زانیم دایکی کۆچکردووم، کە کچە مەلا بوو و، باوکم و
ئێمەی منداڵیش دەچووینە ســـــەردانی ئامۆزا لاوەکەم، عەدنان

بەراکی زرنگ، کە دواتریٚ شەهید بوو. ئەو سەردانانەی وێنەی لێرەولەوێیان لە یادەوەریمدا تۆمارکردبوو و، لەوێ زانیم لە چلەکانی سەدەی رابردووڕا چ برادەرایەتییەکی قوول کۆی دەکردنەوە. سەرباری ئەو سنووربەندییە توندەی هاوڕێ ئەبو سعود هەمیشە پابەندی بوو و نهێنیی شاراوەی ئەو خەباتگێرانەی ئاشکرا نەدەکرد کە ڕێیەکانیان لەیەک دابڕابوون و دواتریٚ ڕێیان هاتبۆوە سەر یەک ڕیٚ، یان ڕێی دیکەیان هەڵبژاردبوو و لە هەمان خەندەقی خەباتی ڕێی ئازادی و بەختەوەریی گەل مابوونەوە..... ئەو سنوورەی تا کۆچکردنیشی، کە مانگێک پێش کۆچکردنی یەکدیمان دیت، هەر پابەندی بوو ، جا هەر لەو گفتوگۆ هەمە جۆرانەڕا ڕاستییەکانی ئەو ڕووداوە سیاسی و حیزبییە فراوانانەم زانی کە وڵات و بزووتنەوەی سیاسی و حیزبیشیان هەژاندبوو.

جارێکیان کە باسی ئازاری ژیانی نهێنیی خۆی دەکرد، کە بەزمێک بووە و لە چلەکانی سەدەی رابردوو تووشی بووە، خواردنی ماڵەکەی چاپخانە تەواودەبیٚ و دەبیٚ بچێتە شت کڕینیٚ و لە گەڕەکێکی بەغدای بەدەگمەن کوردی لێبووە و، کەسانی ماڵەکەیش، لە ترسی هێرشی پۆلیس بەتوندی خۆیان دەپاراست نەکا سەرنجی کەس بۆ ئەوەی راکێشن خەڵکی غەوارە لەو ماڵەدا هەن و، ئەویش عارەبی نازانیٚ. کە بە زمانی ڕێزمانیی عارەبی قسە لەگەڵ قەسابەکە دەکا دەڵیٚ: بەیانیت باش ئەی قەساب! قەسابەکە بە پرسیارەوە چاوان فش دەکاتەوە و دەپرسیٚ: کوڕەکەم دەتەویٚ چ گۆشتێک بکڕی؟ دوای بیرکردنەوە دەڵیٚ: گۆشتی برنج! قەسابەکە تێیڕادەمێنیٚ و

دەڵێ: پێدەچێ ئەو برایەمان فەلەستینی بێ، وایە؟، ئیدی کارەکە بێ کێشە تێدەپەڕێ.

باسی ئەو برادەرە هەرەنزیکەی خۆی کرد کە لەوی بەتەمەنتر بووە و، سیاسەت و ئابووری و زمانی لێوە فێربووە و ئەندامی مەکتەبی سیاسی بووە و لە چلەکان لە هەمان ماڵدا لەگەڵی ژیاوە. جا ئەو هاوڕێیە سەرکراوە و هاوڕێ عەزیز بەوەی نەزانیوە و پەیوەندییان هەر بەردەوام بووە و ئیدی گومانی دەکەوێتە سەر و لەبەر ئەو پەیوەندییە لە حیزبدا سزا دەدرێ...

باسی سالانی کۆتایی شەستەکانی بەغدای دەکرد و، دوور لەو خانەوادەیەی دژایەتیی دەکرا و ژنەکەی و دایکی و هەرسێ منداڵەکەی بوون و ، ئەو لە ماڵێکی نهێنیی حیزبی نیشتەجێ بووە و زۆریان بیردەکا و ناشتوانێ بچێ بیانبینێ..

کە ئەو دژی ڕواڵەتی پووچ بوو و ئەگەر ئەو ڕواڵەتە لە سەنگی مەحەک بدرێ هیچ مانایەکی نابێ، ئەوا نموونەی بە بەرپرسیشانەیەکی هەولێرێ دەهێنایەوە کە ناوی لە خۆی نابوو هەڵۆ و سمێڵێکی ستالینیی بەردابووەوە و تەزبێحێکی سووری دەنک گەورەی بەدەستەوەبوو، کەچی کە گیرا بەیەک زللە هەموو نهێنییەکانی خۆی ئاشکراکرد، کەچی هاوڕێیەکی لاوازی شلک بەرگەی گرت و یەک وشەیشیان لێ دەرنەهێنا!

بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە دەبێ لە لاوازیی مرۆیی تێبگەین و دەشکرێ بنیادەم سەرلەنوێ خۆی بنیات بنێتەوە... ئەو کە بە قارەمانییەکانی گرتووخانە و جەنگەکانی پشتیوانان و شەڕەکانی شەقامانیدا هەڵدەدا، جەخاری بۆ ئازاری ئەوانەش دەخوارد کە بەرانبەر ئامێرەکانی سەرکوتکردن و ئەشکەنجەی

تۆقێنەر لاوازببوون و، ئەو لەباســـی ئەوانەی لە ڕیزەکـانی حیزب دەرچووبوون دەیگوت، ئەوانە بە ســـەرکوتکردن و بە زۆرداری لە ڕیزەکـانی خەبـات چوونەتەدەرەوە نەک لەبەر قەنــاعەت و بـیــروبــاوەڕی جــودا، ئەوەش لە دیــداره نێونەتەوەییەکانی ڕەنگی دەدایەوە... داوای لە پشتیوانان دەکرد -مەبەســت پێشــمەرگەکانی حزبە . ل. ب- ڕێزی قارەمانەکانی کاری نهێنی بگرن، چونکە نەبەردییەکانی پێشـــمەرگە هیچی لە نەبەردییەکـانی کـاری نهێنی پتر نییە و، هەر چـالاکی و نەبەردییەکیش پاڵەوانی خۆی هەیە..

هەر دیدارێکی کار یان دیدارێکی کۆمەڵایەتیی خـانەوادەیی لەگەڵ هاوڕێ ئەبو سعود، مانا و حیکمەت و تاقیکردنەوەیەکی خۆی هەبوو.. لەو دیدارانەدا هاوڕێ باســی گرنگیی خوێندنەوە و پتر شــارەزایی و ماریفەتی بۆ هەر کەســێک دەکرد بڕیاری دابێ "لەپێناوی کێشە نیشتمانییەکەماندا بێتە ناو کۆڕی خەبات"، تـا کۆتـاییش هەر دەیگوت و دووپـاتی دەکردەوە. ئەو بەوەی ناســـرابوو کە خوینەرێکی زۆرباشـــی کتێب و ڕۆمانی خاوەن پەیامە، جێ دانیشــتنە ســادەکەی ماڵەکەیشــی گەواهیدەری ئەو ڕاستییەن کە پڕی کتێبی سیاسی و ئەدەبیی بە هەردوو زمانی عــارەبی و کوردی بوو و، لەژێر گڵۆپەکەی ســـــەرمێزی کە بەدەســـــت لەپشـــــت ســـــەرییەوە لەدیوارەکە لەبن وێنەیەکی مێژوویی کوترابوو کە هیی کۆمەڵێ گەنجی هەر بیســت ســاڵ دەبوون و لە چلەکانی ســـەدەی رابردوو لە هەولێر لەبەردەم کتێبخــانەکەی "شــــێخەشـــەل"یان گرتبوو، کە ئەوێ بنکەی

کۆبوونەوەی گەنجە شیوعی و چەپڕەوەکان بوو، لەناویشیان عەزیز محەمەدی گەنجی کەشخە دیارە.

لەلایەکی دیکەوە و، سەربارى چالاکیی ئاشکرای حیزب و دەستەبەرکردنی بەیەک گەیشتنی لەگەڵ جەماوەری گەل، کە ئەوە لە عێراق دەگمەن بووە، دەبێ ئەو راستییە بگوترێ کە چەندین دەیە دوای سەدان شەهید و ئەو هەموو ئازار و خوێنەی لەبەر ئەو بەرە نەگریسە ڕژا کە لەگەڵ بەعس کرا، ئەودەمیش لە قسەکانی ئەبو سعود هەستم بە گەرموگوڕییەک نەکرد بۆ بەرەی هەبووبێ، لەوەی بترازێ کە پەیوەستبوونی ئەرکێکی حیزبی بوو بەرانبەر کێشەیەکی حیزب بڕیاری لەسەر دابوو و، بگرە لە زۆر هەڵوێستانیش دەیگوت، دەبێ لە بەعس وریابین... بەتایبەتیش کە لە وتەی کاتی واژووکردندا وریایی ئەوەی ورووژاند کە واژووکردن تەنیا نیوە ئاسانەکەیە و گرنگی لە نیوە قورسەکەدایە و چۆنیەتیی جێبەجێ کردن و ئاماژەی بەوەی دا کە مرۆڤ لە هیواو ئاواتان دەوەستێ ئیدی شۆڕشگێڕ نییە... ئەوەیشی بۆ دووپاتکردنەوەی وابەستەیی سەربەخۆیی حیزب و بەردەوامیی حیزب و بڕیارەکانی گوت...

سەربارى بەرپرسیاری و تاوانی بەعس، کە بەرەی بە ئەشکەنجە و غافڵکوژکردنێ وێران کرد، ئەندامانی حیزب باری بەرپرسیاریی کەلەبەر و هەڵەکانی مامەڵە لەگەڵ بەعس کردنێ داوێنە ئەوستۆی سەرکردایەتییەکەیان، جا هەر کەسە و بە پێی پلەی خۆی و دەیخەنە ئەستۆی میکانیزمە وشک و بێگیانەکەی پەیڕەوی ناوخۆی ئەوێ دەمێی حیزبیش، کە دەستە بەرپرسەکانی ناوەراستێی لەنێوان ئەرکی ڕەنگدانەوەی

داواکارییەکانی جەماوەر و دەستە بنکەییەکانی بەرەوسەرێ و جێبەجێکردنی فەرمانەکانی سەروو دا هەڵەرێ کرد و، لێنەگەرا فشار بخاتە سەر دەستەی سەرێ تا سیاسەتی خۆی بگۆرێ!!
ئازار و هەڵچوونی ئەبو سعودم لە سەرهەدەکانی ساڵی ١٩٧٥ باش لەبیرە لەســــەر کاردانەوەی بەعس بەرانبەر نارەزایی حیزب و مەحکوومکردنی ئەو کــارەی جەللادەکــانی بەعس کردبوویان و، پتر لە سی بەندیی سیاسیی شیوعیی پێشترێ و چەپرەوی هەمەجۆر و نەتەوەیی ئــازادیخواز و کوردیــان بە تەور کوشــتبوو و، ســەدان گیراوی ســیاســییشــیان بەلایاندا بردبوو تا قۆمەتی جەســتە لەتوکوت کراوە پاکەکانیان ببینن و ئەو تووڕەیی و هەڵچوونەشــی کاتێ بوو کە ســەدامی تاوانبار گـوتـبـووی"ئـێـمە بەدوای ســــزایەکـی لەمـردن بەهـێـزتـردا دەگەرێین[٢٠٦] و شەهید بۆ دوژمنەکانمان دروست ناکەین"
هەمیشەش، لەناو هەمەجۆر فشاری سەر ئەندامان و دۆستانی حیزب، لە دیدارەکانی ئەو کاتیی بەرەدا وشیاریی ئەو قسەیەی سەدامی دەدا کە گوتبووی "ئێمە چاومان لەوەیە کارلێک بکەین و ببینە یەک قەوارە". زۆریش لە هەوڵی بەعس وریــابوو کە دەیویست لە ساڵانی شەڕی ناوخۆی لوبناندا حیزبی شیوعیی لوبنانی هامێزگرێ و بەردەوام کادیرەکانی دەهاتنە بەغدا، جا مکوڕی ئەوەی بوو بەردەوام ئاگاداریان بکاتەوە. ســــەرباری ئەوەی بەردەوام قســەکەی شــەهید عادل ســەلیمی، دەربارەی ئەو لەسێدارەدان و ڕاگواستن و سووتاندنی گوند و پێدرێژییە

[٢٠٦] _ مەبەستی ئەوەیە بەبێ گیان بژین، بە دەروون و ئەقڵێکی ویرانەوە.

نالەبارەکان و گرتنی لە کوردستان پەیڕەو دەکرا، لە لیژنەکانی بەرەدا وەک ناڕەزاییەکی بەردەوام دەگوتەوە .
وریایی بەردەوامی لە لێخوڕینی ئۆتۆمۆبیل و، زۆرجارانیش سەرباری ئاگادارکردنەوەی هاوڕێیانی بەتەنیا دەردەچوو و، دوای دابڕانێکی دوورودرێژی خانەوادەکەی، وەک هەر باوکێک لەگەڵ ژنەکەی و دوو کچەکەی دەچووە پیاسەکردنێک، ئیدی، کە لەگەڵ ژن و کچەکانی بوو، پیاوانی ئاسایشی تایبەت دوایان دەکەوتن و لەپشتیانەوە هاواریان دەکردنێ "ها؟ لەکونە تاریکەکانتان هاتوونەتە دەرێ؟؟"، " بەخوا، ئەگەر بەزیندوویی بمێننەوە، دەبێ تەمبێتان بکەین و بتاننێرینەوە کونەکانتان" جا، دوای ئەوەی چەند کەسێکیان لە پیاوانی ئاسایش لەگەڵدا نیشتەجێ کردن، وەک هەر کەسێکی ڕاوەدوونراو و چاولەسەری دەزگاکانی ئاسایش لەگەڵ خانەوادەکەی دەژیا ....
زۆر دەلالەتی دیکەی ئەوەی کە دەسەڵاتی بەعس لێی بەگومانە و چاوی لەسەر جوولانەوەکانیەتی و، ئەویش، لە هەر پێچدانەوەیەکی شڵۆقی بارودۆخەکەدا، بەیتە شیعرەکانی جەواهیریی نەمری دەگوتەوە کە سەرەتاکەی دەڵێ " سڵاو لەوانەی مەرگان دەکەنە پردی پەرینەوەی کەژاوان"، " سلامٌ على جاعلين الحتوف جسرا للموكب العابر".[٢٠٧]
لە کاتێکدا، هەندێ لە سەرکردە بەدەسەڵاتەکانی حیزب لە ئاهەنگدا دەژیان و بۆ بەرەی لەگەڵ بەعس زۆر گەرموگوڕ بوون و، بگرە هەندێکیان بەپێی دەربڕینی خۆیان، ئەوەیشیان

[٢٠٧] _ ئەوە حاڵی ژمارەیەک ئەندامانی مەکتەبی سیاسی و لیژنەی مەرکەزییش بوو کە لە بەعس وریابوون.

خستەڕوو کە دەکرێ"یەک قەوارە و یەک حیزب دروست بکەین!!!" و، بۆ ئەو ئاڕاستەیەش نووسینیان لە ڕۆژنامان نووسی و نامیلکەیان بڵاوکردەوە و، جا ساڵانی پاشتریش ئاشکرای کردن و هەڵوێستی ڕاستەقینەی ئەوانی بە بوختان و هێرشکردنە سەر ئەبو سعود ئاشکرا کرد، وەک ئەوەی ئەو هۆکار بووبێ!!

جا هەندێ پرسیار سەبارەت بەو بەرەیە هەر بە کراوەیی دەمێننەوە و، بۆ وەستان لەسەر ئەو پرسیارانەش پێویستی بە توێژینەوەیەکی تایبەت و قووڵ هەیە، ئەرێ بەرە بە مەرجەکانی بەعس دروستبوو؟ _سەرباری هەندێ هەموارکردنەوە و شاردنەوەی بەشێکیش لە ناو ڕەوانبێژیی زماندا_ ئەرێ بەهۆی فشاری ڕژێمە سۆشیالیستییەکانی سەر حیزب و دوای واژووکردنی پەیماننامەی دۆستایەتیی عێراقی - سۆڤیەتی و کرانەوەی دەسەڵاتی بەعس بەسەر وڵاتە سۆشیالیستەکاندا، کە پێشترێ عێراق ئەوەی بەخۆوە نەدیتبوو، بەرە دروست ببوو؟ و بەعس پێوەبوو سوود لە هەردوو بلۆکە جیهانییەکە وەرگرێ. یانیش لەبەر ئەو دابڕانی دووڕیانە پڕ جەخارە بوو کە لەگەڵ بزووتنەوەی نەتەوەیی کوردی ڕوویدا و یانیش گۆڕانەکانی هاوسەنگیی ناوچەکەبوو؟ و یان چەندین هۆی دیکە.

لە لایەکی دیکەوە، وەختە بڵێم هەموو ئەوانەی لێیەوە نزیکبووینە لەسەر ئەوەی هاوڕانە کە ئەوکارەی لەناو شەپۆلی پێکدادانی ڕەوتە جیاوازەکان، ئەبو سعودی بەخۆیەوە سەرقاڵ کردبوو هەوڵی ئەوە بوو گەل بە هەموو پێکهاتەکانییەوە

پێشکەوێ، دەستەبەرکردنی هەر پێشکەوتنێکی حیزبی شیوعی و بانگەشــەکردنی بۆ ئاســایش و دیموکراتییەکی بەڕاســتی و پـێشــــکەوتـنی کـۆمەڵایەتـیی وڵات، چ لە ڕێی چــالاکیی نزیککردنەوەی بۆچوونە جیاوازەکان بووبێ کە لە ناو حیزب و لایەنە نیشــتمانییەکان باو بوو، جارێک بە ڕاســترەو و جارێک بە چەپرەو دادەندرا... قەتیش ئەو خۆشییە ناوازەیم لەبیر ناچێ کە بەرانبەر هەوڵە هاریکارییەکانی گەیشــتنە شــامی موزەفەر نوابی شاعیری گەورە پێیەوە دیاربوو.

ســەرباری ئەو هەموو هێرشــانەی کۆچکردوو-ئەو دەمای- لە ناوەندە حیزبییە ســەرکردایەتییە ڕکابەرەکانەوە کرایە ســەری، هەندێکیان لە هێرشــەکانیاندا لە ڕێوجێی ســیاســی و ئەدەبی چوونەدەرێ و ژمـارەیەکیشــــیان چوونە ئامێزی خیـانەت و، هەنـدێ لە ســــەرکردایەتییەکـانی پێشــــترێ لە هەڵوێســــتە قورســــەکاندا دەســــتەپاچەیی خۆیان لە بڕیارداندا ڕاگەیاند و ڕایەکی خۆیان نەدا و چاوەڕێی ڕای ئەویان کرد تا پشــتگیریی بکەن و، دواتریش هێرشی بکەنە سەرێ و، هەندێکیش ئەودەمی بێدەنگییان هەڵبژارد و هەندێکی دی لەبەر دەســتەپاچەیی و بێ کــارەیی لەپرمەی گریـانییـان دا، ئەوەش لەو قســــەکردن و بیرەوەری و یـادەوەریی ڕۆژانـانەدا دەردەکەوێ دوای ئەوەی ڕۆژگارێکی درێژ بەسەر ڕووداوەکاندا تێپەڕیوە..

ناوی تێکۆشــەری کۆچکردوو، لە ســەر ئاســتی چەپرەوی و کوردســتانی و نیشــتمانی دەرنەکەوت، کە لێرەدا بواری ئەوەی نییە بچینە ناو وردەکارییەکانی، بەڵکو ناوی لەســەر ئاســتی چەپرەویی عارەبیدا بەرزبۆوە، ئەوەش ڕوون و ئاشــکرا لەو

ڕۆڵەدا دەردەکەوێ کە حیزب ئەودەمی بەکەســـــایەتیی ئەو گێڕای تا لە چارەســــەری جیاوازییەکانی چەپی ســـــوری و میســـریدا هاریکاری پێشـــکەش بکا و، هەوڵدا توانایەکانی چەپ لە کۆماری یەمەنی دیموکراتیدا یەکبخاتەوە..
ئەو، ئاگادارییشی سەبارەت بەو داهێزرانەی دەدا کە خەریکبوو باڵی بەسەر سیاسەتەکانی پارتە سۆشیالیستە دەسەڵاتدارەکانی ئەودەمیدا دەکێشــا و، ئەو لە هاندەرانی چاکســازی بوو، ئای چەندیش بەوەی دڵخۆش بوو کە لە یادی شــەســت ســاڵەی شۆڕشی ئۆکتۆبەری سۆشیالیستیی مەزندا ڕێز و ئیعتیباریان دایەوە جۆکۆڤی ســـەرکردەی ســـەربازیی مەزنی ســـۆڤیەتیی، ســەرکردەی ئەو بەرەیەی سۆڤیەتیی کە نازییەکانی تێکشکاند، دوای ئەوەی دەزگاکانی ســتالین، لە دوادواییەکانی ســەردەمی ســتالیندا، حوکمی نیشــتەجێی زۆرەملێیان بەســـەردا دابوو و هەموو شایستەییەکیشیان لێ داماڵیبوو.
ئەو، هۆشیاریی ئەوەیشی دەدا، ئەگەر ڕژێمە سۆشیالیستییەکان لایەک لە گرنگیی چاکســازیی ڕیشــەیی نەکەنەوە تا ســنوورێک بۆ بندەســـــتکردنی مرۆڤ دانێ، وەک ئەوەی ئامێرێکی کەڕ و لاڵ بێ، ئەوا ئەو ڕژێمــانە بەرەو بیرۆکراتی و فەرمــانــداری دەچن. ئەو بنــدەســـــتییەی مرۆڤ و بەئــامێربوونەشـــــی لەو پیشاندانە سەربازییەدا دەرکەوت کە لە ناوەڕاستی حەفتایەکان لە یــادی ڕاگەیــانــدنی کۆمــاری ئەڵمــانیــای دیموکراتی کرا و، ســــەربــازەکــان بە وردییەکی نیمچە خەیــاڵی جوولەکــانیــان پێشــکەش دەکرد و ســەرکردە ســۆشــیالیســتییەکانی ئەڵمانیش بەوەی دڵخۆش بوون، کۆچکردووش لە ســەرکردە ئەڵمانەکانی

دەپرسی: ئەوە دەڵێی بنیادەم نینە؟ ئەری جوولەی دەستێکی بەهەڵەی مرۆیی یان دواکەوتنی سەربازێک لە ڕۆیشتنی هاوڕێکەی؟ ئەوە ئازاربەخشە!!

هۆشیارییشی سەبارەت بە شێوازی جێبەجێکردنی پیرۆسترۆیکا دا لە یەکێتیی سۆڤیەت، کە بۆی هەبوو ببێتە مایەی تێکدانی حیزب و تێکشکاندنی دەوڵەتی سۆڤیەتی، ئەوەش لەبەر گەشەسەندنی چالاکیی دارایی و سەربازیی خۆرئاوا و، گەشەسەندنی چالاکیی زایۆنیی جیهانی و ڕێکخراوە ڕەگەزپەرستەکانی کۆمارەکانی سۆڤیەت و، ئەوەیشی، ئەودەمی، لە دیدارەکانی نێوان حیزبە برایەکاندا دەخستە ڕوو.

ئەمڕۆش، دوای ئەوەی ئەو گۆڕانکارییە بەهێزانە، دنیا و دەوڵەتەکانی و بنیاتنەرەکانیشیانی گرتووەتەوە، ئەبو سعود هێشتا هیوابڕاو نەبووە و تا کۆتاییش هەر نوقڵانەی خێری لێدەدا... ئەو باوەڕی بە دادپەروەریی ئەو کێشەیە هەیە کە ژیانی خۆی بۆ تەرخان کرد و، باوەڕی بە مافی ڕەنجدەرانیش هەیە ژیانێکی ئازاد و خۆشتریان هەبێ بێ جیاکاریی نەتەوەیی و ئایینی و تایەفی و، ئەو هەمیشە دەرگای بۆ ئەوانە کراوەبوو کە دەهاتن و ڕایەکیان دەویست یان پرسێکیان پێ دەکرد و، هەردەمیش بۆ کۆکردنەوەی شیوعییەکان و یەکێتییان و یەکێتیی هێزە نیشتمانییە عێراقییەکان لە چالاکیدا بوو.

دوای ئەوەی دەستی لە بەرپرسیارییە سەرکردایەتییەکانی بەردا، بەو هیوایەی خوێنێکی نوێ بچێتە دەماری حیزب و بتوانێ بەرەوڕووی ماجەرایان ببێتەوە و کارلێکیشیان لەگەڵ

بکا، تا نوێبوونەوەی حیزب بەردەوام بێ و بنیات بنرێتەوە و شێوازەکانی نوێ بکرێنەوە بۆ دەستەبەر کردنی دەستکەوتی پتری ڕێگای دادپەروەریی کۆمەڵایەتی...

بەرەو نەمریی هەرمان عەزیز محەمەد... ئێستاش وشەکانت لە یاددا دەزرنگێنەوە "هەندێ هەست هەن لە بەرکەوتن و دیتنێ دوورن، جا یان دەبێتە خۆڵەمێش، یان تێکۆشەر بەو هەستانەوە دەبێتە بنیادەمێکی هەڵکەوتوو!".

## د.خەلیل ئەلجەنابی

هاوڕێی ئازیز و شیرین یاد، عەزیز محەمەد – ئەبو سعود- تا ئەوپەڕی رادە مرۆڤێکی خاکەڕا بوو و زیرەکییەکی خۆڕسک و داناییەکی سیاسیی ئەوتۆی هەبوو شایانی ئەوەی کردبوو بە هەموو توانا و بەرپرسیارییەکەوە بێتە ناو گێژەنی کاری حیزبی. ئەوەیش شتێکی سەیر نییە، ئاخر ئەو دەرچووی ئەو بەندیخانانە بوو کە نزیکەی دەیەیەکی تێدا بەسەربردن.

لەو ماوەیەی لەبەندیخانەکانی بەسەربردن، فێری ئارامگرتن و دڵسۆزی و قوربانیدان و لەخۆبووردەیی بوو. ئەو ، بووە جوامێر و خانەدان و بەرگریی لە کێشەی کرێکار و جووتیار و چینە پاماڵەکانی، خۆیشی سەر بەوان بوو، دەکرد. لەبەرگریکردن لە گەل و نەتەوەکان لێزان بوو و، بەرگریی لە مافی چارەی خۆنووسین دەکرد، بەتایبەت گەلی کورد و گەلانی دیکەی ناو عێراق... ئەو، مایەی دڵنیایی یەکگرتوویی حیزب بوو و، لەکاتی ململانێی حیزبی و جیاوازیی تێڕوانینی هەڵوێستەکانی حیزبدا، لە زۆر کێشەی ناوخۆیی و دەرەوە و عارەبی و جیهانیدا، ئەو راستکەرەوەی ڕێوانی حیزب بوو. من لە پێگەیەکدا نەبووم بتوانم بچمە ناو وردەکاریی کارەکان، بەڵام ئەو دیدارە زۆرانەی جێی شانازیمان بوو و لەگەڵ عەزیز محەمەدی هاوڕێی کۆچکردوومان بۆمان لوا، لەو کاتەی لە سەرەتای حەفتایەکان بۆ خوێندن لە بولگارستان بووین و ماوەی دەساڵی خایاند، وایکرد لە نزیکەوە ئاشنای ئەو

کەسـایەتییە بێ هاوتایە و گەلێ کەسـایەتیی دیکە ببین، کە لە پێگەی سەرکردایەتیدا بوون.
دیدارەکانمان، لەگەڵ ئەو کەسـایەتییانە، ئەو کاتەی لەسـەر داوای هـاورێ بولگـارەکـانی پەیوەنـدییەکی پتەویـان لەگەڵ هـاوڕێیـانی حیزبی شـیوعیی عێراقیمـان و هەموو حیزبە شـیوعییەکانی وڵاتانی عارەبی و دنیا هەبوو، سـەریان لە بولگارستان دەدا، بەردەوام بوو.
ئەو یارمەتییە زۆرەی بولگارسـتان پێشـکەشـی ئەو حیزبانەی دەکرد لە ژمار نەدەهاتن، هەر لە بەخشـینی کورسـیی خوێندن بۆ قوتـابیـانی وڵاتی ئەو حیزبـانە، کە بە هەزاران کورسـی دادەندرا، لە هەموو بوارەکانی زانسـتی و ئەدەبی و تەکنیکی و پیشەیی و، تا ئامادەکردنیان وەک کادیری زانستیی لە کرداری بنیـاتنـان و ئـاوەدانکردنەوەدا خزمەتی وڵاتی خۆیـان دەکرد، ئەوەش سـەربـاری ئەو هـاریکـارییە مـاددی و لێکۆڵینەوە سـەندیکایی و حیزبییانەی بۆ ئامادەکردنی کادیری زانسـتی پێشـکەش دەکران تا لە پێشـی پێشـەوەی دیمەنە سیاسـییەکەی وڵاتەکەیان بن.
بەڵێ من، لەگەڵ هاوڕێیانی دیکە، شـانازیی بەشـداریی ئەو دیدارانەم پێ بڕا لەگەڵ ئەو کەسـانەی باسـم کردن و بەتایبەت لەگەڵ هاوڕێی کۆچکردوو، عەزیز محەمەد - ئەبو سـعود-.
ئەگەر بڵێم، دیدار لەگەڵ ئەودا تژیی گیانی بەرزی ئاشـنایی و خۆشەویستی و هیواو گەشبینی بوو، زیدەڕۆییم نەکردووە، کە ئەوانەش هەموویان سیفەتی ئەو هاوڕێ ئازیزەمان بوون.

هەندێ ڕێكەوتی جوانی ئەو دیدارانەمان لەگەڵ هاوڕێ ئەبو سعود هەیە، یەک لەو ڕێكەوتانە جارێكیان كۆمەڵێک هاوڕێی ڕێكخراوی بولگارستانی حیزبی شیوعیی عێراقی بووین و، لە شوێنی حەوانەوەیدا لە سۆفیا، چووینە سەردانی، ئێمە پێنج هاوڕێی كوڕ و یەک هاوڕێی كچ بووین، واڕێككەوت هاوڕێ كوڕەكان هەموو لەپێشەوە بووین و هاوڕێ كچەكەشمان لە دواوە. لێرەدا بە دەنگێكی بڵند پێیگوتین "هێشتا جووتیارن!!"، جا بەگەرمی تەوقەی لەگەڵ هاوڕێ كچەكەمان كرد چونكە دەیناسی و ئاگای لە مێژووی تێكۆشانی هەبوو و دەیزانی چ پێگەیەكی لە بزووتنەوەی ژنانی عێراق و هاوبەندیی ژناندا هەبوو. ئەو هاوڕێیەشمان "عەمیدە ئەلڕوفەیعی" بوو.

دوای دیدار و ڕۆیشتنمان، یەک لە هاوڕێیان پرسیی...بەڕاستی گوتی "نەمزانی مەبەستی هاوڕێ عەزیز محەمەد لەوەی چ بوو كە گوتی: هێشتا جووتیارن".... جا بۆمان ڕوونكردەوە كە جووتیار بە چاوێكی كەم و دواكەوتووانە سەیری ژن دەكا و، هەمیشە لە ڕۆیشتنێ بەدوای خۆی دەخا... ئەو هاوڕێیەمان ئاوڕێكی لە هاوڕێ"عەمیدە" دایەوە لەسەر ئەو تێكەوتنە لۆمەی كرد و، گوتی: "هاوڕێ عەزیز لەسەر تۆ سەركۆنەی كردین"ئەویش وەڵامیداوە: "شایانن، چونكە هەر یەكەتان وەک شێخی عەشیرەت خۆی فووداوە و لە پێشەوە دەڕوا!!".

ڕاستییەكەی، ئاماژەكەی هاوڕێ عەزیز محەمەد بۆ سەركۆنەكردن نەبوو، بەڵام ئەو وەک بەشێوەیەكی پەروەردەیی بەڕێزەوە وای گوت و مانایەكی زۆریشی هەبوو، بەتایبەت، كە ئێمە لەبولگارستانین و، دەبێ لە تێڕوانینمان بۆ

ژن و یەکسانیی تەواوی لەگەڵ پیاوان شتێک لە ڕۆشنبیری و هەڵوێستی ئەوان هەڵێنجین.

جارێکی دیکەیان، ڕۆژێکیان زانیم هاوڕێ عەزیز محەمەد بە هێڵی ئاسمانیی بولگارستان لە بەغداڕا دەگاتە فڕۆکەخانەی سۆفیا، جا لە وادەی دیاریکراو بۆ پێشوازیکردنی چوومە فڕۆکەخانە، دەشزانی نوێنەرێکی حیزبی شیوعیی بولگارستانی "پەیوەندییەکانی دەرەوە" لە پێشوازییدا دەبێ. فڕۆکەکە گەیشتەجێ و هاوڕێ عەزیز محەمەدیش گەیشتەجێ و وەک هەر موسافیرێکی ئاسایی چووە هۆڵی پشکنین و، بەداخەوە هێشتا نوێنەرەکەی حیزبی شیوعیی بولگارستانی نەهاتبوو ، کە دەبووایە لە پێشوازییدا بێ و کارئاسانیی چوونە ژوورەوەی بۆ بکا، لێرە، دەستپێشخەریم کرد و پەیوەندیم بە ئەفسەری فڕۆکەخانەوە کرد و خۆم و میوانی هاتووم پێ ناساند و، بە جوانترین شێوە هێنایانە ژوورەوە. هاوڕێ عەزیز پێشنیاری ئەوەی کرد تۆزیک لە هۆڵی چاوەڕوانی بمێنینەوە تا هەلێک بدەینە هاوڕێ بولگارەکە بگاتەجێ، ماوەیەک تێپەڕێ و کەس نەهات، ئەودەمی پێشنیارم بۆ هاوڕێ عەزیز کرد تاکسییەک بگرین و بچینە ئەو هۆتێلەی تایبەتی میوانانی حیزبە شیوعییەکانە، واتە هۆتێلی"ڕیلا" وەک لەبیرم بێ. هاوڕێ عەزیز باولێکی جلوبەرگی مامناوەندیی پێبوو، هەوڵمدا هاریکاریی بکەم و بۆی ببەمە ناو تاکسییەکە، بنەبڕ ڕەتیکردەوە و گوتی "هێشتا گەنجم" و، گوتی بۆئەوەی تووڕە نەبی ها ئەوکیسە بچووکەم بۆ هەڵگرە، کیسەکەی بەدەستەوە بوو.کە گەیشتینە هۆتێلەکەش جانتایەکەی بەخۆی هەڵگرت و چووینە ژوورەوە،

که پەساپۆرتەکەیشی دایە پرسگەکە، ناسییان و بانگی بەڕێوەبەری هۆتێلەکەیان کرد و ئەویش پێشوازییەکی گەرمی لێکرد و پێدەچوو زانیاریی لەبارەی هاتنی هاوڕێ عەزیزییەوە هەبووبێ. پێیشیگوتین هاوڕێیە بولگارەکە تووشی ڕووداوێکی ڕێگاوبانی لابەلا بووە و، لەبەرئەوەیە دواکەوتووە و ئێستا بەرەو ئێرە بەڕێوەیە. نزیکەی نیو سەعاتێک دواتر هاوڕێ بولگارەکە گەیشتەجێ و ئەو یەک لەوانەبوو کە زمانی عارەبییان دەزانی و لە شەرمان ئارەقەی کردبوو و بۆی باس کردین چیی بەسەرهاتووە و، لەبەر دواکەوتنەکەیشی زۆری داوای لێبووردن کرد و ، گوتی چۆن گەیشتنە جێ؟ هاوڕێ عەزیز بە خەندەوە گوتی: "بە پێیان هاتین!!" ئەوجا لێپرسیم چەندتان کرێی تاکسی داوە؟، سووریش بوو دەبێ بیزانێ و دواتریش بەزۆر دە لیفات و پاکەتێک چوکلاتی دامێ و چەپکە گوڵێکی کە لەگەڵ خۆی هێنابوو پێشکەشی هاوڕێ ئەبو سعودی کرد.

سێیەم سەربردەم لەگەڵ هاوڕێ ئەبو سعود، ئەوەبوو کە لە یەک لە سەردانەکانی بولگارستانی ڕێکەوتی لەوێبوونی هاوڕێی نەمر "خالد بەگداش"ی کرد، کە ئەویش بە داوەتێکی حیزبی شیوعیی بولگارستانێ هاتبوو. ئەو دوو سەرکردە شیوعییە لە باسەفایەکی گەشتیاریی شاری فارنای جوانی سەر دەریای ڕەش لە دیدارێکی نافەرمی یەکدییان دیت، هاوڕێ عەزیز، وەک بۆ ئێمەی باسکرد، بەو دیدارە دڵخۆش بووە کە چەندین و چەندین سەعات بەردەوام بووە و هەریەکەیان چیی لە خورجێنەیدا هەبووە سەبارەت بە

بارودۆخی بزووتنەوەی شـــیوعی لە جیهانی عارەبی و دنیای ســـێیەم و هەموو لایەکی دنیا بۆ ئەوی دیی هەڵڕشـــتووە و باســـی پەیوەندیی گەرمی نێوان هەردوو حیزبی شـــیوعیی ســـوری و عێراقییان کردووە و، پەیوەندییان لەگەڵ حیزبەکانی دیکە و بەتـایبەتیش لەگەڵ هەردوو حیزبی دەســـەڵاتـدار لە هەردوو وڵات کە "حیزبی بەعسی عەرەبیی ئیشتیراکی" بوو و تەنیا لە ناو پێکدی دەچوون و ئاڕادەی دوژمنایەتییەکی توند ناکۆکییـان لەبەینێدا بوو. ئیـدی، ئەو دوو هـاوڕێیەش پەنـد و تاقیکردنەوەیان هەڵدەهێنجا و ، وەک هاوڕێ عەزیزیش باسـی کرد دیداری نێوانیان ڕاشـــکاوانە بووە و ســـەرباری هەندێ کێشەی ڕێکخستنی لەو ماوەیەدا بە ئاشکرا دیاربوو و، هەندێ باڵی لە حیزبی شیوعیی سوری دەرکەوتبوون، بووبوونە هۆی سەرسمدانی حیزبی شیوعیی برا، وەگەرنا هەموو تێڕوانینەکان ڕێک هاوتای یەکدی بوون.

ئەو، ڕایدەســـپاردین پەیوەندیمان لەگەڵ هاوڕێیانی ڕێکخراوی حیزبی شـــیوعیی ســـوری پتەو بکەین و، چاومان لە چالاکی و کردارەکانیان بێ و هەوڵ بدەین کۆســـــپ و تەگەرە فیکری و ڕێکخستنییەکانی نێوان لایەنەکانیان تەخت بکەین.

ئەو دیـدارە بەردەوامـانەی لەگەڵ ئەو هـاوڕێیـانە بۆمـان دەرەخســـان، کە ســـەردانی ســـۆفیایان دەکرد، پشـــتیوانییەکی ڕۆشـــنبیری و مـانەوی بوون بۆ ئێمە تـا بەردەوام بە دوای ڕووداوەکاندا بچین. هەمووانیش، بێ هەڵاوێردن، پرســـیاری یەکەمیان ســـەبارەت بە حاڵوباڵی خوێندنی ئێمە بوو و هانیان دەداین، وەک هـاوتـاییەک لەگەڵ دروشـــمی ڕێکخراوەکـانی

قوتابیان و حیزبیمان زانست لەو ولاتە دۆستە هەلگرتبوو، کە دروشـــمەکەش ئەوەبوو"بالادەســـتیی زانســـتی و گەرانەوە نیشـــتمـان". بەڵام بەداخەوە دەیـان کەس گەڕانەوە و کەس گرنگیی پێ نەدان و لە شـــەقامەکان دەســـووڕانەوە و دان بە بڕوانـامەکـانیـانـدا نەنـدرا، بەتـایبەت دەرچووانـی ولاتە سـۆشـیالیسـتییەکانی ئەودەمی و، ئیدی لەکوێڕا هاتبوونەوە چوونەوە ئەوێ.

هەنـدێ هـاوڕێ، لەبەر ئەو مـاوە درێژەی لە بولگـارســـتـان مـابوونەوە، لەو دیـدارانەدا بەختیـان یـار بوو، لە بەرایی هەمووانیش هاوڕێی ئازیز "حەمید مەجید موســـا- ئەبو داود"، ئەویش لەبەر خوێندنی ئەکادیمیی و حیزبیی لە ســـۆفیا بوو. ئەو لێمان نزیک بوو و هاوڕێیەکی بەســـۆز بوو و لە زۆربەی چالاکی و کارەکانماندا بەشـــداریی لەگەڵدا دەکردین و، لەبەر ئەو دانایی و شارەزاییە حیزبی و ئەو ڕۆشنبیرییە سیاسییەی هەیبوو ببووە باشترین ڕێنوێنیکەر و ڕێ نیشاندەرمان . بەڵێ، دیـدارەکـانمـان لەگەڵ ئەو دەســـتە بەڕێزەی هـاوڕێیـانی ســـەرکردایەتی کـاریگەرییەکی فیکری و ڕێکخراوەیی و پەروەردەیی ئەوتۆی هەبوو کە شـــانازیی پێوە دەکەین و لە بەرایی هەموویشـــیانەوە هاوڕێی نەمر عەزیز محەمەد – ئەبو سعود... هاوڕێی ئازیز هەمیشە یادت بەردڵ و شیرین بێ.

## وەفیق ئەلدلێمی:

**سەرەتای هۆشیاریی سیاسی لە فیکری عەزیز محەمەددا:**
سالانی ١٩٤٠-١٩٤١ سەرەتایەکانی بەرایی چالاکیی سیاسیی بوو و، لە هەمان ئەو کاتەدا بوو کە دەستەیەک لاوی خوێن گەرم هانیان دەدا و پالیان پێوە دەنا تا بێتە ناو کێشمەکێشی ژیانی سیاسی، نەخاسمە لەبەر ئەو بارودۆخە سیاسی و ئابووری و کۆمەلایەتییە خراپەی کورد دووچاری ببوو و، کاردانەوەیەکی لای گەنجی کورد دروست کردبوو و خەریکبوون بەسەر واقیعە تالەکەیاندا راپەڕن.
لەو کەسانەی کاریگەرییان لەسەر عەزیز محەمەدی هەبوو، عیزەدین فەیزیی مامۆستا و ئەدیب بوو. ئەو باسی ڕۆلی کاریگەری ئەو مامۆستایەی لە گواستنەوەی نموونەی ئەدەب و سیاسەتی ئەوکاتی باس دەکا و دەلێ لە سالانی گەنجیمان نووسین بە زمانی کوردی زۆر کەم بوو. ئەو ئاماژە بەوەی دەکا و دەلێ لە سالی ١٩٤٠ز ئێمەی پۆلی چوار و پێنج و شەشیان بە گەشتێکی قوتابخانە بردە دەرەوەی هەولێر، کاتەکەی بەهار بوو و گیا لە چۆکان بوو، پێدەچێ بۆنەکەش نەورۆز بووبێ. مامۆستا عیزەدین فەیزی هەستایەوە و وتارێکی کورتی دا، تێیدا هانیداین و وایکرد ورەمان کلپە بکا و ئەودەمی هەستمان بەوەی دەکرد گەورەتر بووینە و خۆشەویستیی گەل و نیشتمان دلی داگیر کردین. جا ئەو ڕۆژە چەشنەیەکی تایبەتی لە ژیانی ئەودا هەبووە، چونکە بووەتە

ئەو هەنگاوی یەکەمەی وردە وردە خستبوویە سەر ڕێی تێکۆشانی قۆناغە جیاوازەکانی کە هەریەکەیان تام و چێژێکی تایبەتی خۆی هەیە. لە نۆبەرەی ژیانی سیاسییدا لە ئایاری ١٩٤١چووە ڕیزەکانی کۆمەڵەی هیوا و بووە ئەندامی ئەو کۆمەڵەیە، ئیدی ڕێوڕەسمی بوونە ئەندامی هیوای بۆ کرا و، ئەوەش لە ژیانیدا چێژێکی تایبەتی هەبووە چونکە ئارامی و شانازی بە دڵ و دەروون دەبەخشێ و، دەڵێ: سەرباری ئەوەی ماریفەتێکی سنووردارمان هەبوو، کەچی ئەودەمی جەربەزە و یەکگرتووبووین.

لە هیوادا وردە وردە دەچووە بنج و بناوانی فیکری پێشکەوتنخوازیی حیزبی هیوا هێنابوویە گۆڕێ، دواتریش چووە ڕیزەکانی "حیزبی شۆڕش"ی ، وەک کاردانەوەیەکی خراپیی باردۆخەکە لە ناوچەکە بەگشتی، خەریکبوو چەمکە مارکسییەکانی دەخستەروو. بەتایبەت لە بارودۆخی شەڕی دووەمی جیهانی و ڕێک ئەوکاتەی ئەڵمانیا لە ١٩٤١ هێرشی کردە سەر یەکێتیی سۆڤیەت. بەڵام، هێرشی ئەڵمانی بۆ سەر یەکێتیی سۆڤیەت ڕێڕاوی شەڕەکەی گۆڕی و ناوەرۆکێکی دیکەی دایە، نەخاسمە دوای شەڕەکانی ستالینگراد و ئەو سەرکەوتنانەی دیکەی سۆڤیەت بەدەستیهێنان و ئیدی کەش و هەوای سیاسیی عێراق بە گشتی گۆڕا، چونکە یەکێتیی سۆڤیەت چووبووە بەرەی هاوپەیمانان "کە ڕیزەکانی بریتیبوون لە بەریتانیا و فەرەنسا و یەکێتیی سۆڤیەت و دواتریش ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکای هاتە ناوێ" ئیدی شنەی ئازادی و دیموکراتی تا ڕادەیەک هەڵیکردبوو و، ئەو

ڕووداوانە تینێکی دابووە سەدان و بگرە هەزاران گەنجی تازە پێگەیشتوو و، ئەو فیکرە ئازادانەش لە ژێر کاریگەریی بارودۆخە نوێیەکەی دنیا بڵاوببوونەوە.

هەر لەو ڕێوانەیدا، چالاکییەکانی عەزیز محەمەد هەر بە چوونە ناو کۆمەڵەی هیوا نەوەستا، لەساڵی ١٩٤٢ بووە ئەندام لە کۆمەڵەی گەل کە ڕۆژنامەیەکیان بە ناوی "بڵێسە"دەردەکرد و، خۆی بە مارکسی دادەنا.

"دوای ئەوە، بە دوو قۆناغی دیکەدا تێپەڕیم، یەکەمیان بەستانی کۆنگرەی یەکەمی حیزبی شیوعی بوو لە بەراییەکانی ساڵی١٩٤٥ ز، دوای بڕیاردانی بەرنامەی حیزبی شیوعی، گەیشتمە ئەو قۆناغەی دەبوایە بیگەمێ، کە ئەو بەرنامەیە باوەڕی بە مافەکانی ئازادی و برایەتی و یەکسانیی گەلی عێراق هەبوو، کە پێشترێ ئەو بەرنامانەمان نەبوو دەستەبەری مافەکانی توێژەکانی خوارەوەی کۆمەڵگای عێراقی بکا.

**چوونە ناو ڕیزەکانی حیزبی شیوعیی عێراقی:**

لە بەهاری ساڵی ١٩٤٨ز و دوای ڕاپەڕینی کانونی دووەمی ١٩٤٨، کە گواستنەوەیەکی چۆنایەتیی ژیانی سیاسیی بوو و، خۆیشی ئاماژە بەوەی دەکا "بە پێودانگی کارەکەم خەریکبوو بیرکردنەوەم لە حیزبی شیوعی نزیک دەبووەوە وهەر ئەوەش پاڵپێوەنام کاری حیزبی لە ڕیزەکانی ئەو حیزبەدا بکەمە پیشە کە بەرگریی لە مافەکانی کرێکاران و چووتیاران و چینە ڕەنجدەرەکان دەکرد".سەرباری بەرایی کارکردنی و چوونە ناو ڕیزەکانی حیزبی شیوعی، کەچی لە زمانی کوردی بەولاوە هیچ زمانێکی دیی نەدەزانی، هەرچی عارەبییە ئەوا لە خوێندنی

ناو ڕیزەکانی حیزبی شیوعی فێری بوو و، ئەو، ئاوا وەسفی فێرە خوێندنەوە و نووسینی خۆی دەکا "بەندیخانە یەکەم قوتابخانەی فێرە خوێندنەوە و نووسینم بوو" و حیزبی شیوعییش نەخوێندەوارییەکەی ئەوی نەهێشت، وەک خۆی باسی دەکا و تۆزیکیش ڕووسی فێر ببوو. دوای کاندیدکردنی بۆ ئەندامێتیی حیزبی شیوعیی عێراقی لە جیاتیی نافع یونسی ببووە بەرپرسی لیوایەکانی باکوور و چووبووە کەرکووک، ئەو بووە بەرپرسی لقی هەولێر و، عەزیز محەمەدیش وەک بەرپرسەکانی پێشتریَ دەستی بە بڵاوکردنەوەی بنەمایەکانی حیزبە شیوعییەکەی کرد و، بۆ ئەوەش بۆنە نیشتمانییەکانی وەک جەژنی نەورۆز و بۆنەکانی دیکەی دەقۆستەوە کە لەویَ دەستیان بە کۆکردنەوەی کرێکاران دەکرد و جووتیارانیان لە گوندەکانڕا دەهێنا و جەماوەرێکی زۆریان کۆدەکردەوە. سەرباری بەرپرسیاریتییەکەی وەک بەرپرسی لقی هەولێر، وەک خۆی ئاماژەی پیَ دەکا، "دوای چوونە ناو ڕیزەکانی حیزبی شیوعیم هەر خێرا داوایەکم لەبەغداوە بۆ هات" تا بچێتە ئەویَ و ناوەندی حیزب لەبەر ئەو بارودۆخەی حیزبی پێدا تێپەڕیوە و دوای گیرانی سەرکردەکانی "فەهد – حازم – سارم" و دەستبەکاربوونی ئەو لیژنە حیزبییانەی لە لایەن کۆنگرەیەکی حیزبییەوە ڕێیان پیَ نەدرابوو و ئامانجیان، وەک ئەو وەسفی دەکا، ئەوە بووە کارەکانی حیزب لەو بارە شلۆقەدا بەڕیَ بکەن. دوای مردنی مەجید مەلا خەلیفەی یەک لە کادیرەکانی حیزبی شیوعی بوو لە بەغدا و بۆ سەرچیغبردنی دەسەڵاتیش لە ماڵێکی حیزبی نیشتەجیَ کرابوو، ئیدی پێویست

بوو خێزانێک بێنە ناو چاپخانەکە، ئەوەش وای لە مالک سەیفی بەرپرسی یەکەمی لیژنەی مەرکەزی کرد سەفەری کەرکووک بکا و، پاشان داوای لە عەزیز محەمەدی بەرپرسی لقی هەولێر کرد بۆ ئەو مەبەستە لەگەڵ دایکی بچنە بەغدا و، لەوێ لەیەکەم ماڵ لە قاترخانە نیشتەجێ بوون کە چاپخانەکەی حیزبی شیوعی لەو ماڵەدا بوو. جا عەزیز محەمەد ئاماژە بەوەی دەکا دایکی زۆرجاران بۆ بەختی ڕەشی خۆیان گریاوە و لالاوەتەوە و گوتوویە داخوا چ چارەنووسێکی نادیار چاوەڕێیان دەکا.

سەرباری ئەوەی دایکی لە چارەنووسی نادیار ترساوە، کەچی بڵاوکراوە و ئەو نامانەشی وەردەگرت کە بۆ بنکەی حیزب دەهاتن و، وەک زەکییە مەلا خەلیفەی کادیری شیوعی لەبەردەم لێکۆڵینەوەکانی تاوان دانی پێدا دەنێ و دەڵێ: "من لەدەرگام دەدا و بەیاننامەکانم دەدایە ژنێکی کوردی نازانم ناوی چییە، بەڵام بەشێوە دەیناسمەوە و کوڕەکەیشی دەهات کە ناوی "عەبدوڵڵا" بوو. بەڵام پێدەچێ لە سایەی ئەو ڕاوەدوونانە ئاسایشییە و ئەو کەوتنە بەردەستی پیاوانی ئاسایش و ورەبەردانە پڕ دەنگدانەوەیەی هەندێ سەرکردەی حیزبی، کە هەر خێرا دەستیان بە ئاشکراکردنی حەشارگە و نهێنییەکانی ڕێکخستنەکانی حیزبی شیوعی کرد، وایکرد خەباتی حیزبیی ئەوەندە درێژە نەکێشێ، کە ئەوەش دوای گیرانی هەرسێ سەرکردەکەی لە ١٩٤٧ بووە هۆی نوشوستییەکی دیکەی حیزب. عەزیز محەمەدیش وەک شیوعییەکانی دیکە، لە بۆسەیەکی پیاوانی ئاسایش لە ١٩٤٨/١٠/١٢ لەگەڵ ئەندامانی لیژنەی مەرکەزیی یەکەم، واتە

دەستەی مالک سەیف – یەهودا سدیق، لە یەک لە ماڵە حیزبییەکانی دەکەوتە ناوچەی هیتاویین لەگەڵ دایکیدا گیرا، کە بڕەپارەیەکیش لە سەندووقەکەی دایکیی لە فرۆشتنی کەلوپەلی مالەوە و هەندێ ئاژەڵی لە گوندی هەیانبووە و لە پاشەکەوتی ئەو مووچەیەی کورەکەی کاتی کارمەندیی پاشەکەوتی کردبوو، دەستی بەسەردا گیرا. پاشان ماڵەکەی عەزیز محەمەد لەگەڵ دایکی چووە مالێکی لە گەڕەکی هیتاویین بوو چاپخانەکەیش گواسترایەوە ئەوێ و یەهودا سدیق و جاسم حەمودیش لەوێ لەگەڵی نیشتەجێ بوون، جا سەرباری کاری چاپکردن، پەیوەندیی بە ئەندامەکانی ڕێکخراوە حیزبییەکانیش دەکرد، چونکە ئەو کەسێک بوو دەسەڵاتە ئاسایشییەکانی بەغدا نەیاندەناسی.

دوای ئەوەی گیرا و ڕەوانەی بەردەم ئەنجوومەنی عورفیی سەربازیی یەکەم کرا، کە لە ١٩٤٩/٢/١٢ پێکهێندرا و عەبدوڵڵا ریفعەت نەعسانی سەرۆکی بوو و، هەردوو دادوەر، خەلیل زەکی مەردان و عەبدولکافی متوەلی ئەندامبوون، لەگەڵ موقەدەم محەمەد عەبدولقادر و ڕەئیس ئەوەل ئەحمەد داود. جا بەپێی مادەی یەکەمی پاشکۆی یاسای سزادانی بەغدای ژمارە"٥١"ی ساڵی ١٩٣٨ سزا درا، ئەویش دوای ئەو تۆمەتانەی ئەنجوومەنی عورفیی سەربازی ئاڕاستەی کرد بەوەی لە ڕێکخەرەکانی شانەکانە و شایەدەکان شایەدییان لەسەر دا، لەوانەش مالک سەیف و یەهودا سدیق و، کارەکانیشی بە دەلالەتی بڕگەی دووەمی ماددەی یەکەمی یاسای سزادانی

بەغدادیی ژمارە"٥١"ی ساڵی ١٩٣٨، بڕگەی "٥/ب"ی بەسەردا جێبەجێ دەبێ.

بەندیی هەتاهەتایی بە پازدەساڵ بۆ برایەوە بە کاری قورسەوە و، پێنج ساڵیش دوای بەربوونی بخرێتە ژێر چاودێریی پۆلیس، ئەوەش بەپێی مادەی "٧٨"ی یاسای سزادانی بەغدادی.

لاپەڕەیەکی نوێ لە ژیانی دەستی پێ کرد، بەڵام ئەوجارەیان لە بەندیخانەی نوگرە سەلمانی بیابان و، ئەویش دوای گواستنەوەی زۆربەی بەندییە شیوعییەکان بۆ ئەو بەندیخانەیەی بیابان، چونکە حکوومەت ناوی لێنابوون بەندییە مەترسیدارەکان و، تا لە هەموو ڕێکخستنەکانی دەوەرەوە دووربن و پەیوەندییان پێیانەوە نەمێنێ، نەک وەک ئەوەی دەستەکەی یوسف سەلمان یوسف "فەهد" کردیان و پەیوەندییان لەگەڵ ڕێکخستنەکانی دەرەوە پەیداکردەوە.

هاوڕێ عەزیز، ئاماژە بەو ماوەیەی بەندیی دەکا و، دەڵێ ماوەیەک بووە لە ماوەکانی ژیانی ئەو شیوعییانە کە لەبەر ئەو بیروباوەڕەی هەیانبووە زۆربەی ژیانیان لە بەندیخانە و راکردن لەدەست ئاسایش بەسەربردووە. دەڵێ، وەک شیوعی، بەپێی ئەو ڕێچکەیەی زۆربەی شیوعییەکان لە پێکهێنانی شانەی حیزبی و ئاڵقەکانی وانە و ڕوونکردنەوەی چەمکە مارکسی-لینینییەکان گرتبوویانە بەر، بەشێوەیەکی فراوانتر خەریکی خۆ ڕێکخستنەوە بووین، چونکە زۆربەی کادیرە ڕۆشنبیرەکان لە بەندیخانە بوون، سەرباری ئەوەی کارەکانی ناو بەندیخانە دابەشکرابوون، وەک نانەواخانە و پاککردنەوەی قاوشەکان. جا وەک گوتم قۆناغی بەندیخانە مەودای ماوەیەکی

فراوانتری فێربوونم بوو و، سەبارەت بە خوێندنەوەشم وەک باسم کرد من لە ڕێی خوێندنەوەی بەندیخانەوە فێری زمانی عارەبی بووم. هەر شتێکم بکەوتایە بەردەستی دەمخوێندەوە، نەخاسمە ڕۆمان و چیرۆک و بابەتی ئەدەبیی دیکەش. ئەوە، سەرباری کۆمەڵێ کتێبی سیاسیی هەمەجۆر بە زمانی عارەبی. من بە زمانی عارەبی فێرە سیاسەت بووم بۆیە دەبینی ئەوەندەم حەز لە خوێندنەوەی کتێبی سیاسیی بە زمانی کوردی نییە و، ئەوەی کارەکەش پتر ئاڵۆز دەکا ئەو بەرهەمانەنە کە لە زمانانی دیکەرا کراینە کوردی.

## ڕووداوەکەی بەندیخانەی کووتی ١٩٥٤

عەزیز محەمەد ، دوای حوکمدانی بردرایە بەندیخانەی ناوەندیی بەغدا و پاشان ڕەوانەی بەندیخانەی نوگرە سەلمانی بیابانێ کرا و، پاش داوا و تکای کەسوکاری بەندییان کە دەبێ ڕۆڵەکانیان بگوازرێنەوە جێی نزیک، چونکە لەبەر ئاستەنگی گەیشتنە بەندیخانەی نوگرە سەلمان ناتوانن سەردانیان بکەن، ئیدی عەزیز محەمەد لە ١٩٥٣گواسترایەوە بەندیخانەی ناوەندیی کووت، واتە، لەو کاتەی ڕووداوەکانی حوزێرانی ١٩٥٣ لە نێوان بەندییە شیوعییەکان و بەڕێوەبەرایەتیی بەندیخانە لەبەر خراپیی بارودۆخی ناو بەندیخانە ڕوویاندا و، ژمارەیەک بەندیی بەندیخانەی کووتی تێدا برینداربوون و ئەوەندە لە ڕووداوەکانی بەندیخانەی بەغدا جودا نەبوو. واتە مامەڵەی خراپی لەگەڵ بەندییە شیوعییەکان دەکرا چونکە بەندیی سیاسی بوون، ئیدی بەشێکیان ئەرزوحاڵێکیان دایە بەڕیوەبەرایەتیی بەندیخانە و داوایان دەکرد مامەڵەیەکی

باشـــیان لەگەڵدا بکرێ و، لە پای ئەوەش دادگایەکی تایبەت لەبەغداوە و لە ٢٧ی تەممووزی ١٩٥٣ گەیشـــتەجێ و هەندێ تۆمەتی ئاڕاســـتەی شـــیوعییەکان کرد گوایە ســـروودی شـۆڕشـگێڕانەی قەدەغەیان گوتووە، ئەوەش لەجیاتیی ئەوەی گوێ لە گلە و گـازانـدەکـانیـان بگیرێ و، لەوانەش عەزیز محەمەدی لەو داوایەدا ناوی بە مەسعود محەمەد خوێندرایەوە. وەک عەزیز محەمەد باسـی دەکا، بەڕێوەبەریی بەندیخانە هەر بە هەڕەشـــەکردن لە بەندییان دەســـتی بەرنەدا و، ئـاوی خواردنەوە و خواردن و کـارەبـای لەو گەرمـای تەممووزەی لەســـەر بەندییەکان بڕی. ئەوەش وایکرد بەهەمووومان بیرێکی ئـاوێ لێدەین، بەڵام لەبەر شـــۆریی ئـاوەکەی هەوڵەکـانمـان ســـەرنەکەوتن و لەســـــایەی ئەو بەرەوڕووبوونەوەیەش بەڕیوەبەریی بەندیخانە، لەبەر ئەو شـــەپۆلی نارەزایییەی دوای رووداوەکـانی بەنـدیخـانەی بەغـدا هەموو وڵاتی گرتبووەوە، ویســـتی بەرەوڕووبوونەوەکە ســـووک بکا، بەڵام بەندییەکان لەسـەر مانگرتنەکەیان سووربوون و هاریکاریی بەڕێوەبەریی بەنـدیخـانەیـان نەکرد، بەڵام ســـەربـاری ئەوەی لەبەر ئەو داهێزرانەی بەهۆی کەمیی خواردن و ئاوێ تووشـــی بەندییە شـــیوعییەکان ببوو، داوای شـــکاندنی گەمارۆیەکەیان دەکرد، کەچی کـارەکە تـا دووەم ڕۆژی ئەیلولی ١٩٥٣ی خـایـانـد و بەرێوەبەریی بەنـدیخـانە هەر زوو هەڵوێســـتی گۆڕا و بە ئەنجەتی گەڕان بە دوای چەکدا بەندیخانەیان پشـکنی و، دوای پشـــکنینەکەش بەڕێوەبەریی بەندیخانە داوای ژمارەیەک ناوی شیوعییەکانی کرد تا بیانگوازێتەوە بەندیخانەیەکی دی و، ناوی

عەزیز محەمەدیش لەنـاو ئەو لســـتەدا بوو و، لە ئەنجـامی ڕەتکردنەوەی بڕیارەکەیش هێزەکانی پۆلیس هێرشـــیان کردە ســـەر بەندییە شـــیوعییەکان کە بێ چەک بوون و نەیاندەتوانی بەرگری لە خۆیان بکەن و، ئەنجامەکەیشـــی کوژرانی چەند شـــیوعییەک بوو و برینداربوونی ژمارەیەکی دیکەیش و ئەوجا ئێمەیان بردە بەندیخانەی ناوەندیی دیالە.

لەناو حیزبەکەیدا، حیزبی کرێکاران و جووتیاران و هەژارانی عێراق بە گشتی، ناوی بەرزبووەوە و، لە هەڵگیرسانی شۆڕشی ١٤ی تەممووزی پیرۆزەوە، ناوی لەگەڵ ناوی شـــەهید ســـەلام عادلدا دەهات. دوای کارەســـاتی ڕەشـــی شـــوباتی ١٩٦٣ شـــیوعییەکان لە حەفتایەکانی ســـەدەی رابردوو دیســـان وەک ئەســـتێرە لە ئاســـمانی عێراق دەرکەوتنەوە و لە باکوورەوە تا باشـــووری ئاســـمانیان داپۆشـــی و، ناوی ئەویش لەناویاندا دەدرەوشـــایەوە. بەڵام، لە کۆتاییەکانی حەفتایەکان، غەدر و ناچیزیی فاشـیزم بە ناشـیرینترین شـێوە گەڕایەوە، تا سـتەمی خۆی بەسەر هەموو بستە خاکێکی عێراقدا دابەش بکاتەوە:

خەڵکی لە سێدارەدا و دووریخستنەوە و رایگواستن و، لە ڕێی ڕاوەدوونانەوە هەرکێی پەیوەندیی بە شـــیوعییەوە هەبوو یان گرتی و یان دووری خستەوە و، ناشیریترین جۆری ئەشکەنجە و کوشتنی بەدڕەوشتانەی بەکارهێنا.

ئەو ناوە، ســـەرکردە و تێکۆشـــەری نیشـــتمانی و نێونەتەوەیی دیار، عەزیز محەمەد بوو.

لە ســـەرەتای ١٩٨٠، ئەبو ســـعود گەیشـــتە عەدەن، تا دیدارێک لەگەڵ کادیرانی حیزب و ئەندامانی عەدەن بکا و، سەرکردەکانی

حیزبی سۆشیالیستی یەمەنیی براش ببینێ. سەرکردەکانی کۆماری یەمەنی دیموکراتیی میللیی، سەدان شیوعیی ژن و پیاو و خانەوادە گەیشتبوونە ئەوێ. منی ئەودەمی بەڕێوەبەری نووسینی ڕۆژنامەی "الثوري" بووم، ناجی برێکی برام راسپارد لەجێی حەوانەوەی سەردانی هاوڕێ ئەبو سعود بکا و، لەجیاتیی دەستەی نووسەرانی ڕۆژنامە بەخێری بێنێ و، دیدارێکی ڕۆژنامەوانیی بۆ ڕۆژنامەکە لەگەڵدا بکا.

قسەکانی هاوڕێ عەزیز محەمەد ورد و چڕ بوون، لە وتاردان و تیۆریزەکردن و پفدان دووربوون، لە خوێندنەوەی ئێستا و بینینی دوارۆژدا تا ئاستی سادەیی واقیع بین بوون. لە ڕێوانی قسەکانیدا، باسی ئەوەی کرد ئەو بارودۆخەی حیزبی تێدا ژیاوە بواری ئەوەی نەداوەتێ دیدارێکی ڕاستەوخۆی لەگەڵ جەماوەری گەلدا هەبووبێ، یان لە مینبەرەکانی راگەیاندن و هۆکارەکانی ڕاگەیاندنی بینراو و بیستراو و نووسراو قسەیان بۆ بکا، ئەوە سەرەڕای ئەو مزگەوتانەی بۆ خەڵکی دی کراوە و بۆ ئێمە قەدەغە بووە...تاد. تەنیا پێنج ساڵی دوای شۆڕشی ١٤ی تەممووزی پیرۆزی ١٩٥٨ نەبێ کە شیوعییەکان لە ڕووی ڕێکخستن و ڕۆشنبیریدا بە ئاشکرا کاریان کرد و، نزیکەی پێنج ساڵی حەفتایەکانیش دوای پێکهێنانی بەرەی نیشتمانیی پێشکەوتنخواز"... ئیدی هەرچیی لە تەمەنی حیزبدا دەمێنێتەوە ئەوا لە بەندیخانە و گرتووخانە و راوەدوونان و تاراوگەی بەسەربردووە.

لە مەودای ئەو دووماوە کورتەی باسکران، گەلی عێراق و لە بەراییشیاندا شیوعییەکان، توانییان بێنە ناو فەزایەکی فراوان و

هەرچی خۆشەویستی و بەختەوەریی ئەو واقیعە نوێیە هەیە، کە شۆڕشی تەمموز بەرکەماڵی کردبوو، دەربیبڕن. واقیعێکی نوێ و سەیر، بەڵام پتر بە ڕزگارکەر دەچوو، ئەو ڕزگارکەرەی جەماوەرەکە چاوەڕێی دەکرد و دەتگوت لە ئەزەلەوە دەیناسێ... سیمای ئەو واقیعەیش بەوەی جیادەکرایەوە کە شیوعییەکان لە بەرایی دیمەنە ژیارییە ڕۆژانەکەی بوون، ئەوە هێ لە سەرکردایەتی و ڕێنماییکردنیشی... واقیعێکی توانی حەفتا لە سەدی ڕۆڵەکانی گەلی عێراق لەکۆیلایەتیی دەرەبەگ ڕزگار بکا، کە لە کودەتای ڕەشی شوباتەوە خەریکبوو دەگەڕایەوە و بە دەسەڵاتێکی سیاسییشەوە کە لە هیی سەردەمی پاشایەتی بەهێزتر بوو... ئێستا بە بەرگێکی نوێ و بە ماشێنێکی نوێوە گەرابووەوە، کە پێیدەگوترا "هەڵبژاردنی پەرلەمانی" و، ئەوەش هەمان ئەو هەڵبژاردنە بوو کە لە سەردەمی پاشایەتیدا دەکرا.

هەرچی ماوەی دووەمە، ماوەی حەفتایەکان بوو کە پێنج ساڵەکەی تەواو نەبوو. سەرباری ئەوەی شیوعییەکان لە "بەرەی نیشتمانی"کاریان لەگەڵ دەکردن، کەچی بەعس تۆقیبوو، چونکە ئەو ماوە کورتە، بەوەی ناسرابوو حیزبی شیوعی بە هەموو لایەکی عێراقدا داکشاوە و، ئەوەش بەعسییەکنی ترساند. وەکچۆن عێراق، لەمێژووی نوێی خۆیدا، جارێکی دی بازدانێکی ڕۆشنبیریی وەک ئەوەی پەنجایەکانی سەدەی رابردووی بەخۆیەوە نەدی، وەک ئەو بازدانە ڕۆشنبیرییە بێ کە ڕۆژانێک شیوعییەکان پێیەوە بەرەنگاری واقیعە ڕۆشنبیرییەکەی بوونەوە و، "الفکر الجدید" و "طریق الشعب" و "الثقافة الجدیدة" لە بەرایی ئەو بەرەنگارییەیدا بوون

و، لەگەڵ ئەو کتێبە زانستی و فەلسەفی و فیکری و ئەو ڕۆمان و دیوانە شـــیعرە"فەســـیح و شـــەعبی"یانەی دەردەچوون و هەمەجۆریی گۆڤارەکان و فرەییشـیان... ئەوەی لەسـەر ئەرزی واقیع بەڕێوەدەچوو بزاوتێکی ڕەخنەیی تیۆرییشـــی لەگەڵدابوو و، دەماندیت لە ڕێی شیعر و شیعری میللی و شانۆ و هونەری وێنەکێشـان و مۆسیقا و ئاواز و گۆرانی و فیکر و فەلسـەفە و زانســـت و کۆڕ و وانەدادان و پێشـــبڕکێی توندی خوێندنەوە و نووســـین و بڵاوکردنەوە و دەســـتاودەســـتی چاپکراوەکان لە کۆبوونەوە و قاوەخانان و بگرە لە شـــوێنی کارکردنیش و، هاندانی خوێندن و ڕاوەدوونانی نەخوێندەواری لە حەشـــارگە شـــاراوەکانی لە هۆڕاو و گوند و لادێیە دوورەکان و بگرە لە جێوڕێی بەدووە کۆچەرییەکانیش، هەمیشە لە جوولەدا بوو.
ئەوانەش چەنـد وتەیەکن هـاوڕێ عەزیز محەمەد ئەودەمی پێیگوتین.
کەواتە دوو ماوەی ئاشـکرا بەسـەر مێژووی حیزبدا تێپەڕیوە "سـەرباری بێزارکردنان" هیچیشـیان لە پێنج سـاڵ پتر نەبوون، حیزب لە کەشـی ئەو دوو ماوەیەیدا لەژێر ئاسـمانێکی سـاماڵ کاری کردووە، حیزبیش لە پێشـــی پێشـــەوەی دیمەنی خەباتی سیاسی و داهێنانی فیکری و ڕۆشنبیریی گشتی بوو...
بەڵام ئەوڕۆ، دوای ئەوەی چواردە سـاڵ تێپەڕیوە و دوای ئەو گۆڕانکارییەی لە ٢٠٠٣ ڕوویدا و، ئێمە بە ئاشـکرا کاردەکەین، ئەگەر لە خۆمان بپرســـین ئەرێ توانیومانە شـــوێنەوارێکی کاریگەری دیارمان لە واقیعی کۆمەڵایەتیی عێراقیی هاوشێوەی

ئەوەی بەدەست بێنین کە چ دوای شۆڕشی ١٤ی تەممووز و چ لە حەفتایەکانی سەدەی بیستەم بەدەستمان هێنا؟
هەر بۆ ویژدان دەڵێین، قەبارەی ئەو کارە ڕێکە و ئەو هەوڵە سیاسی و فیکری و ڕۆشنبیرییەی لەو ماوەیەدا خەرج کراوە، چەند بارتەقای ئەوەیە کە لە حەفتایەکان یان دوای شۆڕشی ١٤ی تەممووز خەرج کرابوو. بەڵام واقیعی عێراقیی دەڵێ زەویی وشکەرۆیە، هەر چ هۆکارێکی ژیان و گەشەی بەسەرداکەی یەکسەر قووتی دەدا. چونکە قەبارەی ئەو وێرانییە فیکری و ڕۆشنبیری و فێرکاری و ئابوورییەی لەو سالانەی دواییدا عێراقی تووش بووە لە خەیاڵ بەدەرە. لە کۆتاییەکانی حەفتاڕا هۆیەکانی پەرەسەندن و پێشکەوتن و گواستنەوەی ماریفەت لە داڕووخاندان، نەخاسمە دوای هەڵگیرسانی شەڕە خوێناوییەکان و کوشتنی بەکۆمەڵ و مردنی نەخشە بۆ دانراوی تا ئێستاش نەوە دوای نەوە خەریکە عێراقییەکان لەناو دەبا و، داڕووخانێکی تەواوی نەخشە بۆ دانراوی ژێرخانیشی لەگەڵ خۆیدا هێناوە. واقیعێکی چاو بە هەرلایەکدا وەرگێڕین وێنەی نابینین. نەخاسمە ئەو ڕژێمە سیاسییەی لەگەڵ ڕژێمە فاشیستە گۆڕ بەگۆڕەکەمان گۆڕییەوە ڕژێمێکی بەشبەشێنەی تایەفییە و، ئەو دەستکەوتانەی موڵکی گشتین دابەشی سەر خزم و لایەنگرانی کردووە و، وای لە دەوڵەت کردووە هەژار و بێ دەسەڵات بێ و سواڵی هێز لە وڵاتانی دیکە بکا. ڕژێمێکی لە بەڕێوەبردنی دەوڵەتدا پشتی بە یاسایەکانی پێشتریّ بەستووە و هیچ یاسایەکی نویّ جێبەجێ

ناکا تەنیا ئەوانە نەبێ دەسەڵات و پارە و ناوچەی بۆ دەستەبەر دەکا.

ئەرێ ئەقڵ دەیبڕێ بەغدای نیشتمانێک لە شارێکدا بەرجەستە دەکا، یەک شــەقامیشــی تێدا نۆژەن نەکراوەتەوە و ڕێژەی نەخوێندەواریی ناو گەنجەکانی بیســت و پێنج لە ســەدە و، ئەو شــارەی پێشــی چەند ســەد ســاڵ پایتەختی دنیا بووە، بەپێی هەڵســەنگاندنە نێودەوڵەتییەکان ئەوڕۆ بۆ ئەوەی نەشێ مرۆڤ تێیدا بژی؟

## Digging out Memories
## Aziz Mohammed

ئەو کتێبەی وەبیرهێنانەوەیەکی بیرەوەری و خستنەڕووی تێڕوانینەکانیەتی بۆ ڕووداوە مێژووییەکان و کۆتایی تۆماری تێکۆشانیەتی لە مێژووی عێراقی سەردەمی ئێستا، پێشکەشی گیانی عەزیز محەمەدی دەکەین ، کە لەنێوان "١٩٢٤ -٢٠١٧" ژیا.